زنجیرەی
هزری
هاوچەرخی
ئیسلامی










# پەروەردەی منداڵ لە قۆناغە زووەکان

## لە روانگەی شەریعەتی ئیسلامدا

وەرگێرانی

نەوزاد محمد سعید



١٤٢٥ك هەولێر ٢٠٠٤ز

# مەبەست لە زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

◆ دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردیە بە گرنگترین وکاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەر ڕێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین.

◆ ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ ڕۆشنبیری ئیسلامیی و سازێنەری بێداری و رابونی ئیسلامیی پیرۆزن.

◆ شارەزاکردنی راستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە، ئازادکردنیانە لە گشت کۆت و بەند و بۆچونی تەسکی حزبایەتی و تاکڕەوی و رەوتگەرایی.

◆ بناغەیەک بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتیەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەر تاکێکی موسڵمانی کورد تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکاریانەی هەبێ کە خوای پەروەردگار پێی سپاردوە.

دەگەڵ رێز و تەقدیرمان بۆ بیروڕای نوسەرانی ئەم زنجیرەیە، مەرجیش نیە ئێمە پابەندی هەمو بیروبۆچونەکانیان بین.

با دەستوریشمان لە وەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت:

ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٨﴾ سورة الزمر

التفسير

# پەروەردەی منداڵ و هەرزەکاران

نوزاد

## لە روانگەی شەریعەتی ئیسلامدا

نوسینی

محمد شریف الصواف

وەرگێڕانی

نەوا محمد سعید

التفسير

هەولێر

١٤٢٥ك ٢٠٠٤ز

ناوی کتێب بە عارەبی: تربية الأبناء والمراهقين
في منظار الشريعة الإسلامية
ناوی نوسەر: محمد شريف الصواف
ناوی کتێب بەکوردی: پەروەردەی منداڵ و هەرزەکاران
لەڕوانگەی شەریعەتی ئیسلام دا
ناوی وەرگێڕ: نەوا محمد سعيد
چاپ و بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر
کۆمپیوتەر: نوسینگەی تەفسیر
تایتلی بەرگ: نەوزاد کۆیی
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٢٥ک ٢٠٠٤ز
چاپکردن: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەولێر
تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن: ٣٦٢ ساڵی ٢٠٠٤

تەفسیر
هەولێر - شەقامی دادگا
ت : ٢٢٣٠٩٠٨ - ٢٢٢١٦٩٥
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ خوا، که چاکەی لەگەڵ بـەندەکانی کـردوە و بەخششـە دیار و نادیارەکانی بۆ تەواوکردون و ئەم بەخششانەش بـە یاسـا و سیسـتمێکی تەواومەند و وردەکار کردۆتە تاجە گوڵینە، کـەوا بـەختیاری دنیـا و سـەرفرازی رۆژی دوایی‌یان بۆ مسۆگەر دەکات و بەهۆیەوە لە هەواو و ئارەزۆوەکان و وەلائـە هەمەجۆر و لایەنە هەمە جۆرەکان دەپارێزێ.

خوای گەورە دەفـەرموێ: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَـٰمَ دِينًا﴾: وام لـەم رۆوە دینەکـەتانم تـەواوکرد و بەبێ کورتی و کەمایەی چاکەم دەربارەی ئێوە کرد، ئیسلامیشم بۆ دینـی ئێـوە هەڵبژارد ﴾المائدة: ٣.

لە عومەری کوری خەتتابەوە ﷺ گێڕراوەتەوە: کەوا پیاوێکی جولەکە پیێ گوتوە: ئەی گەورەی بڕواداران! ئایەتێك لە کتێبەکەتان هەیە دەیخوێننـەوە، گـەر بەسەر ئێمەی جولەکە دابەزیبا، ئەوا ئەو رۆژەمان دەکردە جەژن. عومەر گوتـی: کامە ئایەت؟ جولەکەکە گوتی: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ ...﴾، عومـەر گوتی: ئێمـە ئاشـناین بـەو رۆژە و ئـەو شـوێنەی، کـە ئـەو ئایەتـە بـۆ سـەر پێغەمبەرﷺ دابەزی، کە پێغەمبەر لە رۆژی هەینی لە عەرەفە راوەستابو[1].

کاتێ مسوڵمانان بەو دەستورەی کــە بۆیـان دابـەزیوە و بـە تەواومـەندترین

[1] أخرجه البخاري برقم (٤٥)، و مسلم برقم (٣٠١٧).

یاسای خۆیان پابەند بون، لە گشت بوارەکانی ژیانی سەربازی و کۆمەلآیەتی و زانستیدا پێش هاودەمەکانیان کەوتنەوە و کۆشکێکی شارستانی بەرز و بلّندیان بنیات نا، کە نە لە پێش و نە لە دوایان نمونەی ئاوا بەرز و تەواومەندیان بنیات نەناوە.

زانا مسولّمانەکانیش بەتایبەتی لە بواری پەروەردەدا چەند توێژینەوە و تیۆریان پێشکەش کردوە، کە لە بنەڕەتی ئایینی ئیسلامەوە وەرگیراوە، دیاریشە لە کاتی خۆیدا ڕاپەڕینێکی زانستی و پەروەردەیی گەورەی پێك هێنا، تا ئێستاش ڕێبازی ئەم زانا پایە بەرزانە لە بواری پەروەردە و زانستی رەفتار (سلوك)[1] دا، بەرزۆلّە (منارة)یە بۆ گشت توێژەرەوەیەکی بەویژدان.

لەو زانا پایە بەرزانەش: (غەزالی) و (ئیبن سینا) و (ئیبن خەلدون) و (ئیبن روشد) و (ئیبن مەسکەویە) و (ئیبن ئەبی زەیدی قەیرەوانی) و (ئیبن القیم) و زانای تریشن.

کاتێکیش موسڵمانان لەڕێگای راست و لەو ڕێگا پتەوەی، کە خوای کاربەجێ بۆی کردبونە تاکە ڕێگا، دورکەوتنەوە، ئینجا درز کەوتە کۆشکی شارستانیەتەکەیان و رۆژ بە رۆژ زیادی دەکرد، تا بونە پاشماوەی نەتەوە و پەرتەوازەیی شارستانیەت.

خوایان لەبیرکرد و لە پێشکەوتنی شارستانیەتی زۆر دواکەوتن، جولەکە و خاچ پەرست و شیوعی لەلایەنی سەربازی و فیکری و ئابوریەوە دابەشی کردن و بونە بارگرانی بەسەر نەتەوەکاندا، بونە مشەخۆر لەسەر خوانی رۆشنبیری و ئابوری، بەها و چەمکە پەروەردەییەکانیان دەهێنا، هەروەك فرۆکە و کەل و پەلی کارەباییان لە رۆژهەلآت جارێك دەهێنا و جارێکی تر لە رۆژئاوا.

زاناکانی فیکری رۆژئاوا، یان رۆژهەلآتیش وەك (فرۆید) و (مارکس) و

---

[1] زانستی سلوك: بریتیە لە پاکخۆیی کردنی رەوشت و ئاکار، واتە بەندە خۆی لە ئاکارە نا پەسندەکان پاك بکاتەوە. (وەرگێر).

(هربرت) و (دالتون) و (جۆن دیوی) بونه پێشەوای رۆشنبیران و رێنوێنیکارانی پەروەردیاران، ئاکامی ئەوەش بریتی بو لە هاتنە کایەی کۆمەڵگەیەکی زمان عەرەبی و فیکر و دڵ و نەریت رۆژئاوایی، کە لە حاڵەتی ململانێی شارستانێتی وا دەژیا، کە پێشتر کەسی تر وا نەژیاوە، نە هەستی بە حەقیقەتی ئینتمای بیروباوەڕ و فیکری خۆی دەکرد، نەشی دەتوانی لەیەکێ لە رۆشنبیریی و شارستانیەتەکانی تر خۆی وەچەرخێنێ و خۆی تێ بئاخێنێ.

گرفتی هەرە گەورەش ئەوەیە، کە سەرپەرشتیارانی پەروەردە و رێنمایی لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا، نەیان توانیوە لیێ تێ بگەن و بیزانن کە مانای قوڵ و فراوانی پەروەردە بریتی‌یە لە دروست کردنی نەتەوە و ئامادەسازی نەوە (جیل)ێك و بنیاتنانی خشتی شارستانیەت لە کاروانی شارستانیەتی مرۆڤایەتیدا، چونکە هەر نەوەیەك، کە بەدوای ئوممەت دادێت؛ خشتێکی شارستانیی کاروانی ئەم ئوممەتەیە.

لەبەر ئەوە چەمك و شێواز و ئامانجە پەروەردەیی‌یەکانی هەر نەتەوەیەك بەهەمو بوارەکانیانەوە، تایبەتمەندێتی مێژویی و ئایینی و ئابوری و شارستانێتی ئەم ئوممەتە هەڵدەگرێ، ئەوەش کەل و پەلێکی بازرگانی نی‌یە، کە لە دەوڵەتێکی هاورێ، یان دوژمن بهێنرێ، یان بەهاوکاری چەند دەوڵەتێك کۆبکرێتەوە!!

ڕونتر بڵێین، بنەمای-هەر بەرنامە و پەیڕەوێکی پەروەردەیی بریتی‌یە لەو بیروباوەڕەی، کە لە میانەیەوە دەست پێدەکات و دەردەچێت، ئامانجیشی پتەوکردن و تۆکمەبونی دەبێ، لەبەر ئەوە نەبونی پەروەردەی ئیسلامی لە بەرنامە و پرۆگرامی پەروەردە و ئاڕاستە و ڕێنمایی لە کۆمەڵگەدا؛ دەردێکی کوشندەیە و سەرەتای خێرا کۆتا هاتنی ئەم ئوممەتەیە.

لە ڕاستیدا نوسەر و توێژەرە پەروەردیارە ئیسلامیەکان لەم کارە وریابونەوە و لە ڕوانگەی جۆراوجۆر و جیاجیادا، کۆمەڵە توێژینەوە و جێباسی پەروەردەیی

ئیسلامیان پێشکەش کرد، جا چ بــە تەواوەتی بوبێت، یــان بـە هـەندەکی (جزئی)، کە پەرتوکخانەی ئیســلامی و پەرتوکخانــەی پــەروەردەیی دەوڵەمــەند کرد.

منیش حەزم کرد لەم بوارەدا ئەسپی خۆم تاودەم، لــە خـوای گـەورەم داوایـە یارمەتیم بدات و پاداشتم بداتەوە.

هەوڵیشــم داوە ســود لــە نوسـینەکانی بیریـارە بـەرزەکانی پـەروەردەیی نــا مسوڵمانەکان وەربگرم، وێڕای سود وەرگرتـــن لــە ســەرچاوە ئیســلامیەکان، بـۆ بەدەرخستن بەچڕیی ئادگارەکانی پەروەردەیی ئیســلامی ڕەســەن، ئـەم کتێبـەش تەنها بەشداریەکی بچوکە لە بواری پەروەردە و پێگەیاندنی ئیسلامی.

لە کۆتاییدا، زۆر ڕێز و سوپاس بۆ ئەو کەســانەی بـەم کتێبـە پێداچونــەوە و سەرنج و تێبینی بەسودیان پێشکەش کرد، لە پێشەوەشیان بــەڕێز دکتـۆر شـێخ أحمد کفتارۆ و خێزانە بەڕێزەکەی، هەروا مامۆستای دکتۆر زیاد الصواف، هەروا مامۆستا محمد توفیق الصواف و برای بەڕێز مامۆستا غسان عزقول.

خوای گەورە پاداشتی بەخێریان بداتەوە

(واللە ولي التوفیق)

محمد شریف الصواف

# دەروازەی یەکەم

## بەرایی

## دەربارەی ڕۆڵی خێزان لە پەروەردەکردن و

## ڕێگاکانی پاراستنی

## بەرایی

خوای گەورە چاکەی لەگەڵ هەمو بەشەریەت کردوە بەوەی، کـە کۆمەڵگـەی ئادەمیزاد تەنها لەیەك ڕێگا زیـاد بکـات ئـەویش هاوسـەرگرتنی نێـوان نـێر و مێـیە. خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً: **خودا** هەر لـە جنسـی خۆتـان جوتەی دانێ؛ لەهاو جوتان کوڕ و نەوەی پێ بەخشیون ﴾ النحل:٧٢.

ئەم ئایەتـە پـیرۆزە ئامـاژە بـەوە دەکـات، کـە ئامـانجی هـەرە گرنـگ لـە هاوسەرگرتن لە ڕوانگەی ئیسلامدا بریتیە لە هێنانە کایـەی منـداڵ و نـەوە و نوێکردنەوە و گەشەسەندنی کۆمەڵگە.

لەبەر ئەوە ئیسلام زۆر سورە لەسەر ئەوەی، کە هاوسەرگرتن کاریگەر بێـت، کە کۆمەڵگە زۆر بکات بە منداڵ و وەچەی چاك، ئەمەش لە میانـەی هـاندانی پێغەمبـەرەوە دێـت لەسـەر مـارەبڕکردنی ئـافرەتێك، کـە منداڵـی ببـێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((تَزَوَّجُوا الْوَدُودَ الْوَلُودَ فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمُ الأَنْبِيَـاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: ئافرەتێك بکەنە هاوسـەر، کـە منداڵـی ببـێ و خۆشەویست بـێ، چونکە من لە ڕۆژی قیامەتدا شـانازی بـەزۆریتان دەکـەم لـەچاو پێغەمبـەرانی تر.))[1]

هەروا پێغەمبەر قەدەغەی معقەلی کوڕی یەسـاری کـردوە، کـە ئـافرەتێکی جوان بێنێ کە منداڵی نابێ، پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((لَا تَتَزَوَّجْـهَا: ئـەم ژنـە مەکە هاوسەری خۆت))[2].

[1] أخرجه إبن حبان، ژمارة (٤٠٢٨).
[2] أخرجه إبن حبان، ژمارة (٤٠٥٧).

چا لەڕێگەی هاوسەرگرتن و خێزانەوە کۆمەڵگە بەشێوەیەکی ساغ و دروست گەشە دەکات و نویٚ دەبێتەوە، کە یەکگرتو و پەیوەست بن بەیەکتری وەك یەك جەستە، ئەمەش بەهۆی خزمایەتی و ژن و ژن خوازییەوە دێتە دی، بەهۆی ئەم هاوسەرگرتن و ژن و ژن خوازی و تێکەڵ بونەوە، گیانی خۆشەویستی و بەزەیی و میهرەبانی تێدا بڵاو دەبێتەوە، کەوا لە خێزانی دور لەیەکتری دەکات لە یەکتری نزیك ببەنەوە و ببنە خزم.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ: هەر لە نیشانانی ئەوە کە لە خۆتان، ئاوجوتی بۆ بەرهەم هێنان؛ کە پێیان بحەسێنەوە و خۆشەویستی وئەوینی خستۆتە ناوتان، لەمەدا بۆ کەسانیٚ کە بەووردی سەرنجدەن بەڵگە زۆرن﴾ الروم:٢١.

گەر هەوڵماندا تۆڕی خێزانیی لە کۆمەڵگە تێك بدەین و منداڵ دور لە خێزان بهێنرێتە بون لە ڕێگەی گەیشتنی جنسی نا شەرعی، یان لە ڕێگەی چاندنی کۆرپە لە منداڵدانی ئافرەتانی ناشەرعی، یان لەڕێگەی کۆپیکردن (الاستنساخ)، جا ئەمە دەبێتە لەدەست دانی ئەو لکاندن و گرێدانە بنەڕەتیەی، کە پارێزگاری یەکگرتویی کۆمەڵگە و سیستمەکەی دەکات، جا منداڵی وا دێنە کایەوە کە بەزەییەکی پەروەردەییان نیە، کە گەشە پەروەردەیی و هەڵچونەکانیان لەخۆ بگریٚ و سروشتیان جێبەجیٚ بکات بۆ پێویستیان بە باوەشی گەرمی خێزان و سۆز و حەنانییەوە، هەروا پێویست بون بۆ بنیات نانی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان و هاتنە ناو کۆمەڵگە بەشێوەیەکی ساغ و دروست، ئەمەش دەبێتە هۆی چاندنی بوغز و قین لە عەقڵ و دەرونی ئەم منداڵانە

---

[1] ئەمە بۆ ئەوەیە گەر ویستی تەنها یەك ژنی هەبیٚ و ژنی تری نەبیٚ، چونکە حەزکردن بەمنداڵ؛ سروشت و فیترەتی دەرونی ئادەمیزادە.

بەرامبەر بە کۆمەڵگە و هەست کردنی ڕەها بەتاکیەتی و بەرژەوەندی کەسێتی دور، لە هەر ڕێکخەرێکی رەوشتی و ئاکاری، یان ئایینی.

هەندێ لە تیۆری روخێنەر هەوڵی هاندانی منداڵ بون لە دەرەوەی خێزانیاندا، یان هانیاندا ئەرکی خێزان تەنها بریتی بێ لە هێنانەکایەی منداڵ.

بەڵام ئەرکی پەروەردەیی، ئەوا کۆمەڵەی تایبەت هەڵدەستێ بەوەرگرتنی منداڵان، هەر لەسەرەتای لەدایك بونیانەوە هەڵدەستێ بەپەروەردەکردنیان و دابینکردنی پێداویستسەکانیان، ئەمەش بەمەبەستی راکێشانی خۆشەویستی و سۆزیان بۆ لای دەوڵەت، یان بۆ لای ئەو بیرۆکەیە، کە دەوڵەت پیادەی دەکا بەبێ هیچ شتێکی تر، دور لە پەیوەندی سروشتی خێزانی. ئەم ئەزمونانەش دو جۆر منداڵ بەرهەم دێنێ:

جۆری یەکەم: منداڵی قین لەدڵ و هەڵپەرست و دور لە گەڕانەوەی ئایین، یان ڕەوشت، خەمی سەرەکیان بریتی‌یە لە جێبەجێکردنی بەرژەوەندیەکانیان.

جۆری دوەم: منداڵی کەسایەتی لەرزۆك و داخراو و موعەقەد و دور لەبەشداریی کۆمەڵایەتی کارکەر.

هەردو نمونە ژیار (حضارة) دروست ناکەن، باری ئوممەتی پێ هەڵناستێ، ئەمە لە کۆمەڵگەکەیدا دەردێکە، کە هیوای رزگاربون دەکرێ لە خراپەکاریەکەی.

بەڵام ئیسلام -ئایینی فیترەت- گرنگی زۆری داوە بەوەی، کە گەشە و گەورەبونی منداڵ لە چوارچێوەی خێزانێکی گونجاو بێت، کە هەرتاکەی ڕۆڵی خۆی تێدا ببینێ و ئەرك و مافی خۆی بزانێ چیە و بچێتە ناو کۆمەڵگەوە، لەمیانەی کەشێکی خێزانی ساغ و دروستەوە پێ بگات کە خێزان گرنگترین رێبیرەکانی[1] پەروەردە و ڕەفتاری دروستی پێ بدات.

جا خێزان بریتی‌یە لەو ژینگە سروشتیەی، کە منداڵی تێدا گەشە دەکات و

[1] رێبیر: مبدأ، پرەنسیپ.

لەمیانــەیدا ئاشــنا دەبێــت بەکۆمــەڵگــەی گــەورەتر و چەمکــەکانی یەکـــەمی دەربارەی ژیانی لیّ وەردەگریّ و لەمیانەیدا پێویستی‌یە سروشتیەکانی جۆبــەجێ دەبیّ، تا ئەو کاتەی دەگاتە ئەو قۆناخەی، کە تێیدا دەتوانــێ ببێتــە توخمێکــی کاریگەر لەناوە و دەرەوەی خێزان.

ئیسلام چەندەها ڕێرەوی گرتۆتــە بــەر، لــەپێناو پارێزگــارکردنی خــێزان وەك خانەیەکی بنەڕەتی لــە کۆمەڵگــەدا و ئامــادەکردنی بەهۆیــەکانی ســەرکەوتنی پرۆسەی پەروەردەیی، کە گرنگترینیان باس دەکەین:

## یەکەم: هاندان و ئارەزو دانی هاوسەرگرتن:

دەســت پێشــخەری گــەنجان لەســەر هاوســەرگرتن بەتایبــەتی لـــەم کاتـــەی ئێستاماندا- کۆمەڵە کۆسپ و تەگەرەی ئابوری و کۆمەڵایــەتی دێتــە پێشــەوە، کە زۆر لە گەنجان دەکات ئاوڕ لەم پرۆژەیە نەدەنەوە، یان بــۆ ماوەیــەکی دیــاری نەکراو دوای بخەن، ئەمەش لەترسی دوا هاتەکانی ئابوری و کۆمەڵایەتی. لەبــەر ئەوە ئیسلام هانی گەنجانی داوە بەهاوسەرگرتن و پێکهێنانی خــێزان، قەدەغــەی هاوسەر نەگرتنی کردوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَـــاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّــهُ لَهُ وِجَاءٌ: ئەی کۆمەڵی گەنجان، هەر کەسیّ لەئێوە توانای جەستەیی و جنســی و پارەی هەیە، با هاوسەر بگریّ، چونکە هاوســەرگرتن باشــترین شــتە بــۆ نــەزەر نەکردن و باشترین قەڵایە بۆ داوێن. هەر کەسێك نــەیتوانی هاوســەر بگــریّ، بــا بەرۆژو ببیّ، چونکە بۆی دەبێتە قەڵا و پاراستنی لە گوناهان.))[1].

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((النِّكَاحُ مِنْ سُنَّتِي فَمَنْ لَـــمْ يَعْمَـــلْ بِسُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي: هاوسەرگرتن لە ســوننەت و ڕێبــازی منــە، هەرکەســیّ کــار

[1] أخرجه البخاري، برقم (١٨٠٦) و مسلم (١٤٠٠).

بەڕێباز و سوننەتی من نەکات، لەمن نییە.))[1] .

پێغەمبەری خوا ﷺ باش گوزەران کردنی پیاو لەگــەڵ خێزانەکـەی بـەخێر و سەدەقە داناوە؛ ئەوەتا دەفەرموێ: ((إنَّ بِكُلِّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةً، وَكُــلِّ تَكْبِــيرَةٍ صَدَقَةً، وَكُلِّ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةً، وَكُلِّ تَهْلِيلَةٍ صَدَقَةً، وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَــةٌ، وَنَهْيٌ عَنْ مُنْكَرٍ صَدَقَةٌ، وَفِي بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيَأتِي أَحَدُنَا شَهْوَتَهُ وَيَكُونُ لَهُ فِيهَا أَجْرٌ؟! قَالَ: أَرَأَيْتُمْ لَوْ وَضَعَهَا فِي حَرَامٍ أَكَــانَ عَلَيْهِ فِيهَا وِزْرٌ؟ فَكَذَلِكَ إِذَا وَضَعَهَا فِي الْحَلَالِ كَانَ لَهُ أَجْــرًا: گوتنـی هـەر سبحان الله یەك و الله أكبر و الحمـد لله و لاالـه الا الله و فـەرمان بەچاکەیـەك و قەدەغە لە خراپە؛ خێر و سەدەقەیە، تەنانەت کە دەچنــە لای خێزانـەکانتان بـۆ جوت بون بۆتان بەخێر و چاکە دەنوسرێ، گوتیان: ئەی پێغەمبـەری خـوا! ئێمـە کە لەگەڵ خێزانکانمان جـوت دەبـین پاداشـتمان بـۆ دەنوسـرێ؟! پێغەمبـەر ﷺ فەرموی: گەر ئێوە ئەو مەنی‌یە لەشوێنی حەرام دابنێن بۆتان بەگوناه نانوسـرێ؟ بەهەمان شێوە گەر لە شوێنی حەڵاڵ دابنێن پاداشتی بۆ هەیە.))[2] .

هەروا بەخشین و بژێوی دان بۆ خـێزان بـە گـەورەترین پاداشـت دانـاوە، وەك دەفەرموێ: ((إِنَّكَ لَنْ تُنْفِقَ نَفَقَةً تَبْتَغِي بِهَا وَجْهَ اللَّهِ إِلاَّ أُجِرْتَ عَلَيْهَا حَتَّى مَــا تَجْعَلُهُ فِي فِيِّ امْرَأَتِكَ: هەرشتێك کە دەبەخشـی، کـە مەبەسـتت پـێی خـوای گەورە بێ، ئەوا پاداشتی لەسەر وەردەگـری، تەنانـەت پاداشـت وەردەگـری لـەو پاروە نانەی دەیخەیە ناودەمی خێزانەکەت.))[3]

پێغەمبەر ﷺ هــانی سەرپەرشـتیارانی ئافرەتـان دەدات بـە ئاسـان کردنـی هاوسەرگرتن و سوك کردنی پێداویستی‌یەکانی، وەك دەفەرموێ: ((إِذَا خَطَــبَ إِلَيْكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَزَوِّجُوهُ إِلَّا تَفْعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَــادٌ

[1] أخرجه ابن ماجة، برقم (١٨٤٦).
[2] أخرجه مسلم، برقم (١٠٠٦).
[3] أخرجه البخاري برقم (٥٦) و مسلم برقم (١٦٢٨).

عَرِيضٌ: گەر یەکێك هاتە خوازبێنی و لە ئایین و ڕەوشتی ڕازی بون، کچەکەتان بکەنە هاوسەری، گەر وانەکەن؛ ئەوا لەسەر زەوی ئاشوب و خراپەکاری زۆر پەیدا دەبێت))[1].

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَنكِحُوا الْأَيَامَىٰ مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ ۚ إِن يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ ۗ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ: مێوینەی بێ مێردی خۆتان بەشو بدەن، عەبد و کەنیزی هێژاشتان، ژنیان بۆ بێنن و بیاندەنە شو، ئەگەر لە هەژارانیش بن، خودا بەدڵاوایی خۆی هەمو لا بێ نیاز دەکا، بەخشینی خودا هەراوە و ئاگادارە﴾ النور:٣٢.

پێغەمبەری خوا ﷺ ژنی بۆ پیاوێك مارەبڕ کرد بەوەندەی کە قورئانی لەبەر بوە.[2] هەروا ژنی بۆ پیاوێکی تر مارە بڕ کرد لەسەر دو نەعل، کە بوە مارەیی ژنەکەی و پیێی ڕازی بو.[3]

گومانی تێدا نیە ئەم هەمو بەجێهێنانی یاسایی و یاسادانانە لەبەر سوربونی ئیسلامە بۆ پێکەوە نانی خێزان -ئەڵقەی کۆمەڵایەتی بەرپرسە لە پەروەردەی نەوەکان و چاودێری کردنی- هەمو ئەمانەش بەئاسانترین ڕێ و کەمترین تێچون، لە ترسی بڵاوبونەوەی خراپەکاری (الفساد) و تێرکردنی ئارەزوەکانی هەر یەکێك لە پیاو و ژن لە دەرەوەی قەوارەی خێزان و پەیدابونی منداڵانێك، کە سەر بە خێزان نەبن، پێشتریش باسی مەترسی ئەم دەرەنجامە کرا.

ئەمڕۆ زۆر لە دەوڵەتە پێشکەوتوەکان هەڵساون بەدروستکردنی چەندەها کۆمەڵەی تایبەت بەچاودێری پرۆژەی هاوسەرگرتن (الزواج) بۆ گەنجان و هاندانیشی، هەروا پێشکەش کردنی قەرز و ئاسانکاریەکان لەپێناو دروستکردن

[1] أخرجه الترمذي برقم (١٠٨٤).
[2] أخرجه البخاري برقم (٤٨٥٤) و مسلم برقم (١٤٢٥)
[3] أخرجه الترمذي برقم (١١١٣) و أحمد برقم (١٥٦٧٦) و إبن ماجة برقم (١٨٨٨).

و پارێزگاری کردنی خێزان وەك دان پیانان بەو ڕۆڵ و بنەڕەتی‌یەی، کە خێزان پی‌ی هەڵدەستێ لە دروست کردنی نەوەی پابەند (ملتزم) و چالاك و کاریگەر.

## دوەم: هەڵبژاردنی ژن و مێرد

لە ئیسلام دا مەبەست لە هاوسەرگرتن (الزواج) -وەك پێشتر باسکرا- بریتی‌یە لە پێکەوەنانی خێزان و دابین کردنی کەشێکی لەبار، کە منداڵی تێدا گەشە بکات و پێویستی‌یە سروشتی و پەروەردەیی‌کەیان تێدا بێتە دی، ئەمەش ناکرێ مەگەر لە کەشێکی خێزانی جێگیر و گونجاو دا بێت، لەبەر ئەوە ئیسلام هانی هەر یەك لە ژن و مێرد دەدات بە هەڵبژاردنێکی وردەکارانە بۆ هاوسەری ژیانی بەپی‌ی پێوەری راستی دور لە سۆز و خەیاڵ.

زۆر جار دەبینین زۆربەی ئەو ژن و مێردایەتی‌یەی، کە کۆتایی بە هەرەس (فشل) و تەڵاق و لێك جیابونەوە دێت یان بە گیروگرفت و ناکۆکی بەردەوام دێت، هۆیەکەی پەلەکردنە و لەسەر بنەڕەتێکی راست و دروست نەبوە، هەڵبژاردنی یەکتری لەسەر بنەمای حەز و سۆز بوە بەبێ لێکۆڵینەوە لە پاشماوەی روەکانی لەگەڵ یەك گونجان و لەگەڵ یەك هەلکردن و توانای مادی بۆ دروست کردنی خێزان و هەلگرتنی دوا هاتەکانی مادی و کۆمەڵایەتی.

هاوسەرگرتن گرێبەند (عەقد) و پەیمانی هاوبەشی درێژایی تەمەنە، کە پێویستە تا کۆتایی ژیان بەردەوام بێت، لەبەر ئەوە لەم پەیمان و گرێبەندەدا مافی هەر یەکێکیانە هاوسەری خۆی هەڵبژێرێ، ئەمەش لە سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەر باس کراوە.

لەبەر ئەوە باوکی کچ مافی ئەوەیان نیە کچەکانیان ناچار بکەن بە بەشودانێك، کە لە ڕوانگەی تایبەتی خۆیان بە گونجاوی دەزانن، بەلام مافی ئەوەیان هەیە راوێژی لەگەڵدا بکەن و ڕای خۆیان بدەن و ئامۆژگاری بکەن.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((لا تُنْكَحُ الأَيِّمُ حَتَّى تُستَأمَرَ وَلاَ تُنكَحُ الْبِكْرُ

حَتَّى تُسْتَأْذَنَ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَكَيْفَ إِذْنُهَا؟ قَالَ: أَنْ تَسْكُتَ: ئافرەتی بێوە ژن مارەی نابردرێ، تا خۆی بڕیار نەدات، کچیش مارەیی دروست نیە و مارە بڕ ناکرێ، تا ئیزن و ڕەئی لێ وەردەگیرێ. گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئیزنی چۆن لێ وەردەگیرێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: بێ دەنگیەکەی نیشانەی ڕازی بونیەتی.)) [1].

((جَاءَتْ فَتَاةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ إِنَّ أَبِي زَوَّجَنِي ابْنَ أَخِيهِ لِيَرْفَعَ بِي خَسِيسَتَهُ قَالَ فَجَعَلَ الْأَمْرَ إِلَيْهَا فَقَالَتْ قَدْ أَجَزْتُ مَا صَنَعَ أَبِي وَلَكِنْ أَرَدْتُ أَنْ تَعْلَمَ النِّسَاءُ أَنْ لَيْسَ إِلَى الْآبَاءِ مِنْ الْأَمْرِ شَيْءٌ: کچێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و گوتی: باوکم بەشوی داوم بۆ کوڕی براکەی تا بەهۆی ئەم بەشودانەم سوك و ڕیسوایی لەسەر خۆی هەڵگرێ، پێغەمبەریش ئەم کچەی سەر پشك کرد، کەوا بۆ خۆی خاوەن ڕەئی‌یە و بەبێ ڕەئی کچەکە مارەیی بەتاڵە، بەڵام کچەکە گوتی: ئەوا ڕێم بەباوکم دا کارەکەی بەئەنجام بگەیەنێ، من ویستم بۆ ئافرەتان دەرکەوێ، کە باوکان شتیان بەدەست نیە.)) [2]

((جَاءَتْ فَتَاةٌ إِلَى الرَّسُول ﷺ، فَذَكَرَتْ لَهُ أَنَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهِيَ كَارِهَةٌ فَخَيَّرَهَا النَّبِيُّ ﷺ: هەروا کچێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و باسی کرد، کە باوکی بەزۆر بەشوی داوە خۆیشی ڕازی نیە، جا پێغەمبەر ﷺ سەرپشکی کرد. واتە ڕەئی‌یەکەی دا دەست کچەکە)) [3].

ئا بەم شێوەیە دەبینین ئیسلام سورە لەسەر بەردەوام بونی هاوسەرێتی بەر لە دەست پێکردنی، سورە لەسەر جێگیر (إستقرار)ی خێزان، کە هەڵدەستێ بە پەروەردەکردنی منداڵان لە ڕێی سەربەستی هەریەك لە ژن و مێرد لە هەڵبژاردنی هاوسەرەکەی، ئیسلامیش گرنگترین بنەمای دیاری کردوە، کە

[1] أخرجه البخاري برقم (٤٨٤٣) و مسلم برقم (١٤١٩).
[2] أخرجه إبن ماجة (١٨٧٤).
[3] أخرجه أبوداود (٢٠٩٦) و إبن ماجة (١٨٧٥).

هەڵبژاردنی هاوسەری لەسەر بنەماکەی ئەنجام دەدرێ ئەویش بریتی‌یە لە:

### ١-ئایین و ڕەوشت:

وشەی ئایین ناونیشانێکە، کە تێگەیشتن و پەیڕەوی ڕاست و دروست بۆ شەریعەتی هەمیشەیی دەگرێتەوە، هەروا پابەندبون بە پەیڕەو و مەنهەجەکەی، کە بناغەی یەکەمە کە ژن و پیاو لە میانەیدا دەبنە هاوسەری یەکتری.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**إذَا جاءكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَزَوِّجُوهُ إلَّا تَفعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ عَرِيضٌ**))[1]

هەروا پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**تُنكَحُ الْمَرْأَةُ لِأَرْبَعٍ لِمَالِهَا وَلِحَسَبِهَا وَجَمَالِهَا وَلِدِينِهَا فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ**: ژن بۆ چوار مەبەست مارەبڕ دەکرێ: بۆ ماڵ و سامانەکەی، بۆ ناو و شۆرەت و ڕەچەڵەکی ژنەکە، بۆ جوانیەکەی، بۆ ئایینەکەی، جا ئەو ئافرەتە مارەبڕ بکە، کە دیندارە ئەگەر وا نەکەیت دەستت بە قوڕداچێ))[2]. لە ریوایەتێکی تر فەرمویەتی ئەو ئافرەتە بهێنە کە خاوەن دین و ڕەوشتە.

هەڵبژاردنی هاوسەر لەسەر بنەمای ئایین، مسۆگەری یەکەمی پەروەردەکردنی مندالآن و، پێگەیشتن و گەورەبونیانە بەشێوەیەکی ساغ و راست، هەروا فەرمانبەری ژن بۆ مێردەکەی مسۆگەر دەکات و ماڵ و مندالەکەی دەپارێزێ.

هەروەها هەڵبژاردنی مێرد لەسەر بنەمای ئایین؛ مسۆگەری چاك بون لەگەڵی و چاودێری کردنیەتی، هەروا ئارام گرتن لە کەم و کورتی‌یەکانیەتی، کە دەبێتە مسۆگەرکردنی پارێزگاری خێزان و یەکگرتویی و بەیەکەوە بەستانیەوە.

---

[1] أخرجه الترمذي برقم (١٠٨٤) (مانای ئەم فەرمودەیە لە پێشتر باس کراوە) (وەرگێڕ).
[2] أخرجه البخاري برقم (٤٨٠٢) و مسلم برقم (١٤٦٦). لە ریوایەتێکی تر "ذات الدين و الخلق" أخرجه إبن حبان برقم (٤٠٣٧).

**٢-بنەمای ئابوری:**

ئیسلام مکوڕە لەسەر بنیات نانی خێزان بە بنیاتێکی واقیعی و دیراسەکراو، تاوەکو هۆیەکانی سەرکەوتن و مانەوەی بۆی بسازێ، گومانی تێدانیە ماڵ و سامان شادەماری ژیانە و لە گرنگترین بنەڕەتیەکانێتی. ژیانی هاوسەرێتی پێداویستی مادی زۆر و بەردەوام و زیادی دەوێ.

لەبەر ئەوە ئیسلام وریایی داوە بەگرنگی دان بەم لایەنە، تاوەکو هیچ یەکێك لە ژن و مێرد بە دوای بانگەشتەی سۆزدا نەبردرێ، پاشان هێندەی پێ نەچێ هەست بەهەڵەی گەورە بکات کە ئەنجامی داوە دوای ئەوەی کار لەکار ترازاوە، بەمە تاوانێك لەسەرخۆی ئەنجام دەدات.

هەر چەندە سۆز و خۆشەویستی بەهێزبێت، بەڵام بۆ ماوەیەکی درێژ خایەن ناتوانێ لەبەردەم ڕەقی ژیانی مادی و پێداویستی‌یەکانی؛ خۆی ڕابگرێ، لەبەر ئەوەشە گوتراوە: (إذا دخل الفقر من الباب، هرب الحب من الشباك: گەر هەژاری لە دەرگا هاتە ژورەوە، خۆشەویستی لە پەنجەرەوە هەڵات و چوە دەرەوە))

چەندەها فەرمودە ژن و مێرد ئاگادار دەکاتەوە بەگرنگیەتی ئەم لایەنە وەکو پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لِأَرْبَعٍ: لِمَالِهَا..)[1].

لەو فەرمودانەدا ئەوەیە، کە فاطمەی کچی قەیس ڕەزای خوای لێ‌بێ گێڕاویەتەوە، ((أَنَّ مُعَاوِيَةَ وَأَبَا جَهْمٍ خَطَبَاهَا؟ فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَمَّا مُعَاوِيَةُ فَصُعْلُوكٌ لَا مَالَ لَهُ وَأَمَّا أَبُو جَهْمٍ فَلَا يَضَعُ عَصَاهُ عَنْ عَاتِقِهِ[2]، انْكِحِي أُسَامَةَ: کە معاویە و ئەبو جەهم ڕەزای خوایان لێ‌بێ خوازبێنیان کردوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (معاویە پیاوێکی هەژارە و ماڵ و سامانی نیە، بەڵام ئەبو جەهم گۆپاڵەکەی لەسەرشانی ناهێنێتە خوارەوە (بەواتای زۆر لە ژنان

[1] أخرجه البخاري (٤٨٠٢) و مسلم برقم (١٤٦٦).

[2] أي إنه يكثر ضرب النساء كما ورد في رواية إبن ماجة، برقم (١٨٦٩)

دەدات)، جا شو بە ئوسامە بکە)).

لێرەدا دیدی ئیسلام بۆ ئەم مەسەلەیە مادی نیە کە دوربێ لە سۆز و هەستەکان، بەڵام دیدێکی واقعیە و هەردو لا ئاگادار دەکاتەوە بەکارێکی گرنگ، ڕەنگە لە بیر و هۆشیان دا نەبێ و هەر لەدوای سۆزداریان دابێ، کە لە کۆتاییدا دەبێتە هەڵوەشانەوەی خێزان و لە دەست دانی مەبەستی خوازراوی هاوسەرگرتن.

**٣-ڕەچەڵەك و پلە و پایەی کۆمەڵایەتی:**

پرۆسەی هاوسەرگرتن و بەیەك گەیشتنی ژن و مێرد، تەنها پەیوەندیەك نیە کورت هەڵهاتبێ بە ژن و مێرد، بەڵام مانای بریتییە لە چونە ناوەوەی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی فراوان لە نێوان تاکەکانی هەر یەکێك لە خێزانی ژن و مێردا.

لەبەر ئەوە ئیسلام سورە لەسەر دابین کردنی کەمترین شت لە گونجاندن و نزیك بونەوە لە نێوان هەریەك لە خێزانەکان لە لایەنی پایەی کۆمەڵایەتیەوە، دەربارەی ئەمەش پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لِأَرْبَعٍ: لِمَالِهَا وَلِحَسَبِهَا..))[2].

هەروا دەفەرموێ: ((تَخَيَّرُوا لِنُطَفِكُمْ وَانْكِحُوا الأَكْفَاءَ وَأَنْكِحُوا إِلَيْهِمْ: بۆ منداڵەکانتان ئافرەتی چاك هەڵبژێرن، هاوکوفی یەکتری بکەنە هاوسەر))[3].

ڕەنگە هەندێ لە خوێنەران وا گومان ببەن، کە ئەم قسانە لە ڕوانگەیەکی چینایەتی دور لە یەکسانی و کام کەس لە خوا ترس تر بێ ئەو چاکترە، کە ئیسلام دایناوە؛ دەرچوە، لەبەر ئەوە پێویستە ئاگاداری ئەوە بدەین، کە ئەم هاوشانی و نزیکبونەوەی کۆمەڵایەتیە هەرگیز مانای ئەوە نیە، کە هیچ یەکێ

[1] أخرجه مسلم، برقم (١٤٨٠) و الترمذي برقم (١١٣٥) و النسائي برقم (٣٤١٨).
[2] أخرجه البخاري برقم (٤٨٠٢) و مسلم برقم (١٤٦٦).
[3] أخرجه إبن ماجة برقم (١٩٦٨).

لەم دو توێژە کۆمەلآتیــە لەیــەکتری باشــتر بــن، بەڵکــە مانــای ئەوەیــە خــێزان بەگوێرەی توێژە کۆمەلآیەتیەکەی و داب و نەریتەکانی گونجاوە بۆ پەیوەست بــون لەگەڵ خێزانەکەی تر ، یان نا.

ئەمەش مانای ئەوە نیە گشت هاوسەرگرتنێك، کە لێك نزیکــی و هاوشــانی کۆمەلآیەتی تێدا نەبێت، حوکمی هــەرەس و ســەرنەکەوتویی بەســەردا بدرێــت، بەڵکە زۆربەی ژن و مێردایــەتی، کــە لەســەر لێــك نزیکــی و هاوشــانی بنیــات نەنراوە، نابێتە مایەی ژیانێکی خێزانی جێگیر (مستقر).

٤-جوانی:

هەڵبەت ژیانی هاوسەرێتی سەرەڕای پێویستیەتی بــەو کارانــەی کــە پێشــتر باسکرا، هەردەبێ هەر یەکێك لە ژن و مێرد کەمێك لە جوانیان هەبێ، جوانیش شوێنەواری گەورە و کاریگەری هەیە لە ڕاکێشانی هەر یەك لــە ژن و مــێرد بــۆ لای یەکتری و خۆشەویستی زیاتر بۆ هاوسەرەکەی، هەروا کاریگــەری هەیــە لــە حەسانەوەی دەرونی هەر یەکێکیان دا، لە کۆنیش گوتراوە:

ثلاثة تجلو عن القلب الحزن　　الماء والخضرة والوجه الحسن

واتە: سێ شت خەم لە دڵ دەڕوێنێ، ئاو و سەوزایی و ڕوخساری جوان.

لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ لە چەندەها فەرمودەدا ئاگاداری گرنگــی ئەمــەی داوە، وەکو دەفەرموێ: ((تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لِأَرْبَعٍ لِمَالِهَا وَلِحَسَبِهَا وَجَمَالِهَا..))[1]

هەروا هانی خوازبێنکەری داوە، کە تەماشای خوازبێنی کراوەکــەی (دەســت گیرانەکەی) بکات، تاوەکو دڵی بۆ لای بچێ، گەر لەکەیــەکی جەســتەیی هــەبێ پێی بزانێ، ئەمەش بۆ ســوربون لەســەر بــەردەوام بونــی ژیــانی هاوســەرێتی و جێگیری خێزانە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((إِذَا خَطَبَ أَحَدُكُمْ الْمَرْأَةَ فَإِنْ اسْــــتَطَاعَ أَنْ

[1] أخرجه البخاري (٤٨٠٢) و مسلم (١٤٦٦).

يَنظُرَ إِلَى مَا يَدْعُوهُ إِلَى نِكَاحِهَا فَلْيَفْعَلْ: گەر یەكێك لە ئێوە خوازبێنی ئافرەتێكی كرد، گەر توانی تەماشای بكات، كەپێویست بكات بۆ مارەبڕینی، ئەوا با تەماشای بكات.))[1]

لە ئەبو هورەیرە گێڕراوەتەوە كەوا پیاوێك ئافرەتێكی ئەنساری مارە بڕی، پێغەمبەر فەرمووی: ((أَنَظَرْتَ إِلَيْهَا؟ قَالَ: لَا. قَالَ: اذْهَبْ فَانْظُرْ إِلَيْهَا، فَإِنَّ فِي أَعْيُنِ الأَنْصَارِ شَيْئًا: تەماشات كردوە؟ ئەویش گوتی: نەخێر، پێغەمبەر فەرمووی: برۆ تەماشای بكە، چونكە چاوی ئەنساریەكان بچوكە.))[2]

هەڵبژاردنی هاوسەر لەسەر بنەڕەتی جوانی؛ مافی ژن و مێردە، دەربارەی ئەمەش عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ دەفەرموێ: ((لا تُزَوِّجُوا بَنَاتِكُم مِن الرَّجُلِ الدَّمِيم، فإنه يُعجبهنّ منكم ما يُعجبكم منهنّ: كچەكانتان لە پیاوی ناشیرین مارەبڕ مەكەن، چونكە حەز بەو شتە دەكەن وەك ئێوە حەز بەوان دەكەن)).

جا سەرنج بدە ئەو كۆمەڵگانەی ناهێڵن خوازبێنی كەر تەماشای ئەو كچە بكات، كە دەیەوێ خوازبێنی بكات چ مافێك دەفەوتێنن، یان ئەوانەی قەدەغەی كچ دەكەن خوازبێنی كەرەكەی لەسەر ئەو بنەڕەتە مەشروع و دروستە ببینێ.

گەر هەڵبژاردنی ژن و مێرد لەسەر ئەو بنەڕەتانەی پێشو بنیات بنرێ، ئەوا شیمانەی[3] جێگیری و سەركەوتنی خێزان زۆر زۆرتر دەبێ، لە شیمانەی هەرەس و سەرنەكەوتن یان هەڵوەشانەوەی.

دەگەڕێینەوە بۆ جەخت كردن لەسەر ئەوەی، كە بنەڕەتی هەرە گرنگ بۆ هەڵبژاردنی ژن مێرد بریتی‌یە لە ئاین و ڕەوشت، بەڵام بنەڕەتەكانی تر، كە

---

[1] اخرجه أحمد برقم (١٤٠٥٩).
[2] اخرجه الترمذي برقم (١٠٨٧).
[3] شیمانە: إحتمال.

پێغەمبەر ﷺ وریایی داوە بریتی‌یە لەو بنەڕەتانەی، کە بەشێوەیەکی باشتر یاریدەی بەردەوامی و سەرکەوتنی ژیانی خێزانی دەدەن لە نێوان ژن و مێردا.

## سێیەم: هەڵسوڕاندنی خێزان بەدەستی پیاوبێ:

خێزان وەك هەر دەستەیەك، یان دەزگایەك، یان کۆمەڵێك پێویستی بە دابەش کردنی ئەرك هەیە بەسەر ئەندامەکانی و هەبونی بەڕێوەبەرێك، کە بەرپرس بێت لە هەڵسوڕاندنی کاروبارەکانی و ئاسان کردنی کارەکانی بەشێوەیەکی باشتر، خوای گەورە هەڵسوڕاندنی خێزانی داوەتە دەست پیاو نەك هیچ کەسێکی تر، چونکە بەهۆی چەند کارێکەوە شایستەیە وەك: پتەوی و توندی (حزم) و زاڵ بونی ژیری بەسەر سۆز (عاطفة)دا، کە وای لیٚ دەکات بۆ ئەم ئەرکە لە ئافرەت شایستە تر بێت.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡۚ: پیاوان سەرپەرشتیارترن بەسەر ئافرەتان بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری خێزان، بەوەی کە خوای گەورە بەچەند شتێك بەسەر یەکتری دا فەزڵ و چاکەی پیٚ بەخشیون، کە پیاو توانای ئامادەیی جیٚبەجیٚ کردنی کاروباری قورس و گرنگیان هەیە، هەروەها پیاو سەرپەرشتیارە بەسەر ئافرەت چونکە نەفەقە و پارە پەیدا کردن و منداڵ بەخێوکردن لەسەر پیاوە لەو ماڵەی کە هەیەتی.﴾النساء:٣٤.

هەروا دەفەرموێ: ﴿وَلَهُنَّ مِثۡلُ ٱلَّذِي عَلَيۡهِنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ وَلِلرِّجَالِ عَلَيۡهِنَّ دَرَجَةٌۗ: ئافرەت چیان لەسەرە کە مافی پیاو بەجیٚ بهێنن، بەهەمان شێوە ئەوانیش مافیان هەیە و بەشیان هەیە بەسەر پیاو لە چاکەدا. پیاویش پلەیەکی بەسەر ئافرەتانەوە هەیە لەبەر ئەوەی زیاتر ماندو تر و هەوڵ و کۆشش تر و نان پەیداکەر ترە.﴾البقرة:٢٢٨.

پلەی سەرپەرشتیاری (قوامة) و چاودێری پلەی ئەرکباریی و بەرپرسیارێتی‌یە، نەك پلەی بەباشتر دانان بێت بەومانایەی، کە زۆر لە پیاو و ئافرەتان وای تێدەگەن.

لەبەر ئەوە ئیسلام فەرمانی بە ژن کردوە فەرمانبەری مێردەکەی بکات و ئارەزوەکانی جێبەجێ بکات، ئەگینا ئەو کاتە ئەو سەرپەرشتیاریەتە بێهودە دەبێت و خێزان لاسەنگ دەبێت و ئاژاوەی تێدا دروست دەبێت، نابێتە ژینگەیەکی چاك و لەبار بۆ پرۆسەی پەروەردەیەکی سەرکەوتو.

پێغەمبەر ﷺ بە عومەری فەرمو: ((أَلَا أُخْبِرُكَ بِخَيْرِ مَا يَكْنِزُ الْمَرْءُ الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ إِذَا نَظَرَ إِلَيْهَا سَرَّتْهُ وَإِذَا أَمَرَهَا أَطَاعَتْهُ وَإِذَا غَابَ عَنْهَا حَفِظَتْهُ: هەواڵت پێبدەم بەباشترین گەنجینەی مرۆڤ؟ ئافرەتی چاك، گەر تەماشای بکات دڵی خۆش بکات، گەر فەرمانی پێ کرد فەرمانبەری بکات، گەر لیی نادیار بو (چوە سەفەر) ئەوا داوێن و ماڵ و منداڵی دەپارێزێ.))[1]

هەروەها ﷺ دەفەرموێ: ((وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَا تُؤَدِّي الْمَرْأَةُ حَقَّ رَبِّهَا حَتَّى تُؤَدِّيَ حَقَّ زَوْجِهَا: سوێندم بەوەی کە گیانی محمدی بەدەستە، ئافرەت مافی خوای گەورە بەجێ ناهێنێ، هەتا مافی مێردەکەی جێبەجێ نەکات.))[2]

## چوارەم: فەرمان بەمێرد کراوە چاکە لەگەڵ هاوسەرەکەی بکات و ڕیزی بگرێ:

ئیسلام دەسەڵاتی پیاوی لە ماڵەکەیدا بەسەر هاوسەرەکەی و منداڵەکانی نەکردۆتە دەسەڵاتێکی ڕەها (مطلق)، بەڵکە فەرمانی پێ کردوە چاکە لەگەڵ خێزانەکەی بکات و ڕیزی بگرێ و بەباشی ڕەفتاری لەگەڵ دا بکات.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِۚ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ

[1] أخرجه الديلمي في (الفردوس) ج٤/٣٧٩.
[2] أخرجه إبن ماجة برقم (١٨٥٣).

فَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـًٔا وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيۡرًا كَثِيرًا: لەگــەڵ ژنــەکانتان بەچاکی گوزەران بکەن و هەڵس و کەوتیان لەگەڵدا بکەن، کـاتێکیش شـتێکتان لێیان بینی کە بە دڵتان نەبو ئەوا چاوپۆشی لێ بکەن، شتی وا هەن ئێوە حـەزی لێ ناکەن، کەچی چاکەی زۆری لە خواوە بۆنگۆ تێدایە.﴾النساء:١٩.

وە دەفەرموێ: ((اسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا.. : وەسیەتتان بێ لەگەڵ ئافرەتـان باش بن.))[1].

هەروەها ﷺ دەفەرموێ: ((خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لِأَهْلِهِ، وَأَنَا خَــيْرُكُمْ لأَهْلِــي: باشترینتان ئەو کەسەیە، کە لەگەڵ خێزانەکەی باشە، منیش بـۆ خێزانەکـەم لـە هەموتان باشترم.))[2].

## پێنجەم: کاری ژن ئەوەیـە لـە ماڵـەوە ئۆقـرە بگـرێ و، هەسـتێ بەچاودێری کردنی کاروبارەکانی:

ئیسـلام رۆڵ و بەرپرسـێتی ژیـانی لـەنێوان ژن و مـــێردا بـــەگوێرەی ئـەو شایستەیی‌یەی دابەش کردوە کە خوای گەورە بە هەر یەکێکیانی بەخشیوە، جــا چاودێری کردنی کاروباری ناوەوەی ماڵیش بە ئەرکەکانی ئافرەتی داناوە. لەبــەر ئەوە فەرمانی پێکردوە زۆربەی کاتەکانی لە ماڵەکەی بەسەر ببات.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَقَرۡنَ فِي بُيُوتِكُنَّ: لــە ماڵـەکانتان جێگـیربن و ئۆقرە بگرن.﴾

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ فِي بَيْتِ بَعْلِهَا وَوَلَدِهِ وَهِــيَ مَسْئُولَةٌ عَنْهُ: ژن لە ماڵی مێردەکــەی و بەرامبــەر بەمنداڵـەکانی بەرپرسـیار و چاودێرە.))[3].

---

[1] أخرجه البخاري برقم (٤٨٩٠) و الترمذي برقم (١١٦٣) و إبن ماجة برقم (١٨٥٧).
[2] أخرجه ابن ماجة برقم (١٩٧٣).
[3] أخرجه البخاري برقم (٢٤١٦) و مسلم برقم (١٨٢٩).

جا پابەندبونی ژن بۆ بەسەربردنی زۆربەی کاتەکانی لەناو ماڵەوە بۆ چاودێری کردنی کارەکانی و کاروباری منداڵەکانی؛ گەورەترین مسۆگەری سەرکەوتنی پرۆسەی پەروەردەیی‌یە و، مسۆگەری بەختیاری خێزانە. هەروا بەسەربردنی زۆربەی کاتەکانی ژن لە دەرەوەی ماڵ بۆ کارکردن، یان سەردانی کردن و فەرامۆش کردنی کاروبارەکانی خێزانەکەی و پەروەردەی منداڵەکانی؛ مەترسی دارترین و گرنگترین هۆیەکانی هەڵوەشانەوەی خێزان و لەدەست دانی منداڵانە، بەتایبەتی گەر لە ئاسان کردنی کارەکانی ماڵ و چاودێری منداڵان، پشت بە خزمەتکار ببەسترێت.

هەڵبەت دایك بەرپرسی یەکەم و گرنگترین پایەی پرۆسەی پەروەردییە، چونکە منداڵ زۆربەی کاتەکانی لەگەڵ ئەودا بەسەر دەبات، هەروا نەریت و یەکەم ڕەوشت لەو وەردەگرێ، کە لەسەر ئەو و پەروەردیاران گران و زەحمەتە رێك و پێکی بکەن و بیگۆڕن.

## شەشەم: چاکەکردن لەگەڵ منداڵاندا:

پرۆسەی ئاڕاستەکردن و پەروەردەکردنی منداڵ لە لایەن دایك و باوکەوە سودێکی وای نیە، گەر دایك و باوك، یان یەکێکیان کەمتەرخەمیان هەبێ لە بەجێهێنانی هەندێ لە مافەکانی منداڵ بەسەر باوکیان دا.

بەڵام گەر دایك و باوك چاکەیان لەگەڵ منداڵەکانیان کرد و توانیان خۆشەویستی و ڕیزی منداڵەکانیان بەدەست بهێنن، ئەوا پرۆسەی پەروەردە و ئاڕاستەکردن ئاسانتر و سەرکەوتوتر دەبێت، لەبەر ئەوە ئیسلام هانی سەرپەرشتیاری منداڵانی داوە بە چاکەکردن لەگەڵ منداڵەکانیاندا.

ئەوەتا بوخاری لە (الادب المفرد)دا باسی چاکە کردنی باوك بۆ منداڵەکەی کرد، کەوا لەئیبن عومەرەوە گێڕراوەتەوە سەبارەت بە فەرمودەی خوای گەورە: ﴿إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا﴾الانسان:٥.

گوتویەتی: (خوای گەورە بەچاکەکارانی ناو زەد کردون، چونکە چاکەیان لەگەڵ دایك و باوك و منداڵان کردوە. هەروەك چۆن باوکت مافی بەسەرتەوە هەیە، ئاواش منداڵەکەت مافی بەسەرتەوە هەیە.[1]

## حەوتەم: چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك:

یاسای هاوسەنگی لە ماف و ئەرکەکان، مانای وایە، لەسەر هەمو ئەو کەسە پێویستە کە داوا لە کەسانی تر دەکات بە ئەرکەکانی ئەو هەڵسێ، دەبێ ئەویش بزانێ، ئەو ئەرکانەی لەسەریەتی بەرانبەریان بەجێی بهێنێ.

لەبەر ئەوە ئیسلام فەرمانی بە منداڵ کردوە، کە چاکە لەگەڵ دایك و باوك بکەن، هەروەك فەرمانی بەدایك و باوك کردوە چاکە لەگەڵ منداڵەکان بکەن، جا بەمە خۆشەویستی لە خێزان بڵاو دەبێتەوە و هەر تاکەی رۆڵی خۆی دەبینێ و بەمافەکانی بەهرەمەند دەبێ ، کاتێکیش منداڵان لە کەشی خێزانیی دەچنە دەرەوە؛ بەها و پەروەردەیی و رەوشتی بەرز هەڵدەگرن و دەیگوێزنەوە بۆ خێزانی نوێیان و کۆمەڵگە گەورەکەیان، جا ئەو کاتە خێزان رۆڵێکی گرنگی پەروەردەیی لە چاکسازی کۆمەڵگەدا بەحێ هێناوە.

سەبارەت بە چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکدا، زۆر ئایەت و فەرمودە هاتون، وەك: خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ: فەرمانمان بە ئادەمیزاد کردوە بە چاکەکردن بەرامبەر بە دایك و باوکی، کەوا دایکی بێ هێز بوە بەهۆی حەملەکەوە و بێ هێز بوە بۆ لە دایك بون و لە شیرگرتنەوەش ماوەی دو ساڵە، سوپاس بۆ من بکە و بۆ دایك و باوکت. چارەنوست بۆ لای منە.﴾لقمان:١٤.

[1] أخرجه البخاري في الادب المفرد برقم (٩٤).

((سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَيُّ الْعَمَلِ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ؟ فَقَالَ: الصَّلاةُ عَلَى وَقْتِهَا. قَالَ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: بِرُّ الْوَالِدَيْنِ. ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ: پرسیار له پێغەمبەری خوا ﷺ کرا: چ کار و کردەوەیەك لای خوای گەورە خۆشەویسترە؟ فەرموی: "نوێژ له کاتی خۆی"، گوتی: پاشان چی‌تر؟ فەرموی: "چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك"، پاشان چی‌تر؟ فەرموی: جیهاد لەپێناو خوای گەورەدا"))[1].

## هەشتەم: سیلەی ڕەحم (پەیوەندی خزمایەتی):

ئیسلام سورە لەسەر ئەوەی خێزان ڕۆڵی خۆی ببینێ له پەروەردەکرنی منداڵ و پێگەیشتنیان بە پێگەیشتنێکی کۆمەڵایەتی چاك گەشەپێکردنی کەسایەتی منداڵانیش بە تەواوکاری ڕۆڵی خێزان له پەروەردە دادەنێ، که یاریدەیان دەدات بۆ چونە ناو ژیانی کۆمەڵایەتی بەدەرچون له کەشی خێزانێکی بچوکەوە بۆ کەشی خێزانێکی گەورە، ئەمەش له میانەی ئەوەوە دێتە دی، که منداڵ لەگەڵ خزمەکانی کۆببێتەوە و خۆی پێیان بناسێنێ له ڕێی دایك و باوکەوە، هەروا هەڵس و کەوت کردن لەگەڵیان و هاتوچۆ کردنیان، کەوا شارەزاییەکی کۆمەڵایەتی فراوان و متمانە بەخۆ و بە کۆمەڵگەکەی بەدەست دێنێ، ناشتوانێ ئەم سودە کۆمەڵایەتی و دەرونی‌یە دەستەبەر بکات، گەر دور له کەشێکی خێزانی یەکگرتو پێ بگات، که پەیوەندی خزمایەتی و هاریکاری نێوان تاکەکانی تێدا بڵاو دەبێتەوە.

ئەو ئایەت و فەرمودانەی دەربارەی پەیوەندی خزمایەتی (صلة الرحم) هاتون:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ

[1] أخرجه البخاري، برقم (٢٦٣٠) و مسلم برقم (١٣٨).

وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا وَبِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ: خوا بپەرستن و هیچ شت مەکەن بەشەریکی، لەگەڵ دایك و باوك و خزمەکان و بێ باوکەکان چاکە کاربن.﴾النساء:٣٦.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ باللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ باللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ: هەر کەسێ بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە، با سیلەی ڕەحم (پەیوەندی خزمایەتی). بەجێ بهێنێ، هەر کەسێ بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە، با قسەی چاك بکات، یان بێدەنگ بێت)) [١].

هەروەها ﷺ دەفەرموێ: ((أَسْرَعُ الْخَيْرِ ثَوَابًا الْبِرُّ وَصِلَةُ الرَّحِمِ، وَأَسْرَعُ الشَّرِّ عُقُوبَةً الْبَغْيُ وَقَطِيعَةُ الرَّحِمِ: خێراترین پاداشتی خێر و چاکە بریتین لە: چاکەکاری و بەجێهێنانی سیلەی رەحم، خێراترین سزای خراپەکاری بریتین لە: ستەم و لەسنور دەرچون و، بڕینی پەیوەندی خزمایەتی.)) [٢].

هەروەها ﷺ دەفەرموێ: ((إِنَّ الصَّدَقَةَ عَلَى الْمِسْكِينِ صَدَقَةٌ، وَعَلَى ذِي الرَّحِمِ ثِنتان؛ صَدَقَةٌ وَصِلَةٌ: خێرکردن بە هەژار بەخێرێك دەنوسرێ، خێرکردن بە خزم دو خێری هەیە، ئی خزمایەتی و ئی خێرەکە.)) [٣].

جا ئیسلام لەمیانەی ئەم هەشت خاڵەوە خێزانی سازاندوە بۆ ڕۆڵ بینینی لە پەروەردەی مندالدا و پێگەیشتنیان بە پێگەیشتنێکی ساغ و دروست، کە ناکرێ دور لە خێزان وەدەست بهێنرێ، ئەمەش بۆ جەخت کردنە لەسەر ڕۆڵی خێزان لە پرۆسەی پەروەردەیی و مەترسییەکەی.

---

[١] أخرجه البخاري برقم (٥٧٨٥) و مسلم برقم (٤٨).
[٢] أخرجه ابن ماجة برقم (٤٢١٢).
[٣] أخرجه الترمذي برقم (٦٥٨) و أبوداود برقم (٢٣٥٥) وابن ماجة برقم (١٨٤٤) و النسائي برقم (٣٥٨١).

# دەروازەی دووەم

## پێناسە و بەرپرسیتی و شوێنەواری

## پەروەردە

## • پێناسەی پەروەردە و پێگەیشتن

دەکرێ پەروەردە لە زمانەوانی بگەڕێنینەوە بۆ سێ ڕەگی زمانەوانی کە بریتین لە[1]:

١-ربا، يربو بەواتای: زیادی و گەشە.

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿يَمْحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ وَيُرْبِي ٱلصَّدَقَٰتِ﴾البقرة:٢٧٦.

دەگوترێ: ربيته فتربى، ومنه الربوة: شوێنی بەرز[2].

٢-ربي، يربى: لەسەر کێشی خفي يخفى، بەواتای: پێگەیشت و گەشەی کرد.

ئیبن عەرەبی گوتویەتی:

فمن يك سائلا عني فإني     بمكة منزلي وبها ربيت

هەرکەسێك لە من بپرسێ، ئەوا مەککە ماڵی منە و لەوێوە پەروەردە و گەورە بوم.

٣-رب يرب: لەسەر کێشی مد يمد، بەواتای: چاکسازی و سیاسەت و چاودێری.

حەسانی کوڕی سابت گوتویەتی:

ولأنت أحسن إذ برزت لنا     يوم الخروج بساحة القصر

من درة بيضاء صافية     مما تُرَبِبُ حائرُ البحر[3]

ئیبن منظور گوتویەتی: ربيت الامر أربه ربا و ربابا[4]: چاکم کرد و پتەوم کرد.

[1] لسان العرب. المصباح المنير، ج١ ٢١٤-٢١٧. القاموس المحيط ج٤/٤٨٠.

[2] المصباح المنير ج١/٢١٧.

[3] بەواتای: باشترین لە گەوهەر ئەوەیە کە گوێچکە ماسی لە دەریا چاودێری بکات و چاکی بکات.

[4] لسان العرب.

وەکو الرب: چاکساز و بەڕێوەبەر[1].

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾

پەروەردە بەپێی چەمکی هاوچەرخ دەکرێ بگەڕێنرێتەوە بۆ هەمو ئەم مانایانەی لە پێشەوە باسکرا، کە ئەمانە دەگرێتەوە: زیادی و گەشەکردن و خۆراکدان و گەشاندن و سیاسەت و چاکسازی، ڕەنگە ماناکەی دوایی نزیکترین چەمك بێ بۆ پەروەردە.

پەروەردە چەندەها پێناسەی کۆن و هاوچەرخی هەیە، کە هەندێکی باس دەکەین:

-راغبی ئەصبەهانی دەڵێ: (پەروەردە: دروست کردن و پێگەیاندنی شتێکە لە بارێکەوە بۆ بارێك تا سنوری تەواو بون.

-ئیمام بەیضاوی دەڵێ: (پەروەردە: وردە وردە گەیاندنی شتێکە بۆ کەماڵی و تەواومەندی)[2].

بەناوبانگترین و گرنگترین پێناسەی هاوچەرخ بۆ پەروەردە، پێناسەی (جۆن دیوی)یە کە دەڵێ: پەروەردە: پێکەوە نانێکی نوێیە بۆ ئادەمیزاد، بەهۆی سروشتی فیطری و، بەکارلێکردن لەگەڵ کەلەپوری ڕابردوی رۆشنبیری کۆمەڵی ئادەمیزادە[3].

-مامۆستا عبدالحمید هاشمی پێناسەی پەروەردە دەکات و دەڵێ: چەند کردەیەکی دەرونی و کۆمەڵایەتیە، کە ڕێنمویی کارەکان پێی هەڵدەستن بە مەبەست و ڕێکخستن و پلان دارڕشتنەوە بۆ منداڵەکانیان، لە قۆناغی بێشکە و منداڵی و مێرد منداڵی و گەنجی و تەمەنی روشد و درێژایی ژیان[4].

---

[1] تفسير القرطبي ج١/١٣٧.
[2] تفسير البيضاوي (أنوار التنزيل و أسرار التأويل) ج١/٨.
[3] الديمقراطية و التربية، جون ديوي.
[4] الرسول العربي المربي، ص٣٤٩.

لەم پێناسانەی پێشو سەرنج دەدەین، کە هەر یەکێکیان باسی یەکێك لە بنەڕەتیەکانی پرۆسەی پەروەردەیی دەکات کە بریتی‌یە لە:

١-گرنگیی پلەپلەیی لە پرۆسەی پەروەردەیدا.

٢-گەشەپێدانی بەهرە (موهبة)ی فیطریەکان و هەوڵدان بۆ گەیاندنی بەشێوەیەکی تەواوکاری.

٣-پرۆسەی پەروەردەیی لەسەر ئاوێتە بونی فیطرەت لەگەڵ کەلەپوری ڕۆشنبیری و بیروباوەر دەوەستێ، سەرباری شارەزایی‌یە بەدەست هێنراوەکان.

گەر ویستمان پێناسەیەکی نوێی پەروەردە پێشنیار بکەین، دەڵێین:

پەروەردە پرۆسەیەکی پێگەیشتنی کۆمەڵایەتی دەرونی‌یە، کۆشش دەکات بۆ گەشەپێدانی بەهرە فیطریەکان و پلەپلەیی کردن لە گەشە پێدانیدا و، چاك کردنی ڕەفتار و ڕێك پێك کردنی بەشێوەیەك، کە بگونجێ لەگەڵ بیروباوەڕ و بەها ژیاریەکان (القيم الحضارية).

بەڵام پەروەردەی ئیسلامی، بریتی‌یە لە پەروەردەیەك کە لە خێزانی ئیسلامیەوە دەردەچێت و شێوازەکانی ئیسلامی بەکاردەهێنێ، بەمەبەستی چەسپاندنی بیروباوەڕ و پابەند بون بە یاساکانی ئیسلام لە ڕەفتاردا.

## بەرپرسێتی دایك و باوك لە پەروەردەكردنی منداڵاندا

بەرپرسێتی دایك و باوك بەرامبەر منداڵەكانیان -وەك پێشتر باسمان كرد- زۆرن، گرنگترینیان: بەرپرسێتی پەروەردە و تەمیێ كردنە.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ: ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە خۆتان و خێزانتان بپارێزن لە ئاگرێك كە سوتەمەنیەكەی خەڵك و بەردە و كە فریشتەی توند و تیژ سەرپەرشتیئەم ئاگرە دەكەن، سەرپێچی فەرمانی خوای گەورە ناكەن، ئەوەی فەرمانیان پێ دەكرێ ئەنجامی دەدەن.﴾التحريم: ٦.

كاتێك ئەم ئایەتە دابەزی عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ پرسیاری لە پێغەمبەر كرد و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە خۆمان دەپارێزین، ئەی چۆن خێزانمان بپارێزین؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((**تنهونهم عما نهاكم الله، و تأمرونهم بما أمر الله**: ئەوەی خوای گەورە قەدەغەی كردوە ئەوانی لێ قەدەغە دەكەی، ئەوەی خوا فەرمانی پێ كردون ئەنجام بدرێ فەرمانیان پێ دەكەی بیكەن.))[1].

لەبەر ئەوە زانایان گوتویانە: (ئادەمیزاد مافی بەسەرخۆی و منداڵەكەی و خێزانەكەیەوە هەیە، جا لەسەرمانە ئاین و چاكە و ئەدەب و ڕەوشت فێری منداڵەكانمان بكەین)[2].

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**لأَنْ يُؤَدِّبَ الرَّجُلُ وَلَدَهُ خَيْرٌ مِنْ أَنْ يَتَصَدَّقَ بِصَاعٍ**: پیاو منداڵەكەی فێری ڕەوشت بكات ئەوەی بۆ باشترە، كەبەقەد

---

[1] تفسير القرطبي ج١٨/١٩٥-١٩٦.
[2] تفسير القرطبي ج١٨/١٩٦.

(صاع)ێك بكاته خێر.))[1] . هەروەها فەرمویەتی: ((مَا نَحَلَ وَالِدٌ وَلَدًا أَفْضَلَ مِنْ أَدَبٍ حَسَنٍ: باوك هیچ شتێكی نەداوەتە منداڵەكەی كە لـە رەوشـتی بـاش باشتر بێ))، لە ریوایەتێكی طبەرانی دا هاتوە: ((ما ورث والد ولدا..))[2].

كاتێكیش سەبارەت بەمافی منداڵ لەسـەر بـاوكی پرسـیار لـە پێغەمبـەری خواﷺ كرا، پێغەمبەر فەرموی: ((أن يحسن اسمه، و يحسن أدبـه: نـاوی باشـی لێ بنێ و بەباشی پەروەردەی بكات.))[3].

گومان لەوە دانیە، كە نەریت و ئـەو چەمكانـە (مفـاهیم)ی كـە ئـادەمیزاد لەسەری پێدەگات و، هەر لەمنداڵیەوە لـە خێزانەكـەی وەردەگـرێ، شـوێنەواری گەورەی هەیە لە نەخشـە كێشـانی هـەڵس و كـەوت و رەفتـاری و پێكـەوەنانی كەسایەتیەكەی كاتێك، كە گەورە دەبێ. لەبەر ئەوە لەسـەر دایـك و باوكـە زۆر سوربن لەسەر بەدەست هێنانی هەمو رەوشتێكی جوان بـۆ منـداڵ، ئـەوەی كـە سود و قازانجی دنیا وئاخیرەتی تێدایە.

زۆربەی ئەو باوكانەی شەو و رۆژ هەوڵدەدەن و رەنج دەدەن بۆ ژیان، بۆ دابین كردنی پێداویستیە مادیەكانی منداڵەكانیان، وا ئـەزانن ئەركـەكانیان لەمـەدا كۆتایی پێ دێت و تەنـها لەمـە كـورت هەڵـهاتوە. بـەڵام كارەكـە پێچەوانـەی ئەمەیە، چونكە ئەو باوكەی كـە زۆربـەی كاتـەكانی لـە دەرەوەی مـاڵ دور لـە خێزانەكەی بەسەر دەبات، بۆی نارەخسێ چاودێری رەفتاری منداڵەكانی بكات و ناڕاستەیان بكات، كاتێ كە منداڵەكانی گەورە دەبن زۆر پەشیمان دەبێتەوە، لـە ڕەوشتیان ڕازی نابێت و هەوڵی چاك كردنیان دەدات، بەڵام ئەوكاتە هـەر شـتێك بكات بێ هودە دەبێت، چونكە خوی شـیری تاپیریـە، هـەر كەسـێكیش لەسـەر نەریتێك گەورە بوبێ، زۆر زەحمەتە ئەم نەریتە لە ڕەفتاری خۆی بگۆڕێ.

---

[1] أخرجه الترمذي برقم (١٩٥١).
[2] أخرجه الهيثمي في مجمع الزوائد ج٨/١٥٦.
[3] أخرجه البيهقي في (الشعب) برقم (٨٦٥٨).

بەهەمان شێوە ئەو دایکەی بەهۆی سەرقاڵ بون بە کارکردنی ماڵ، یان بەسەردانی کردن منداڵەکانی فەرامۆش کردون، ئەوا زۆر کەمتەرخەمی دەکات بەرامبەر بەمافی منداڵەکانی، خێری زۆریان لە دەست دەدات، ئەو ئەرکە بنەڕەتیەش کە لە ژیاندا لەسەری داواکراوە جێبەجێی ناکات، کە بریتیە لە پێگەیاندنی نەوە (جیل) و بنیات نانی دوا ڕۆژی نەتەوە، لەبەر ئەوە ئیسلام سورە لەسەر ئەوەی ئافرەت زۆرینەی کاتی لە ماڵەوە بەسەر ببات، تا وەکو بتوانێ چاودێری کاروباری مێردەکەی و منداڵەکانی بکات.

ئێمە ئیمڕۆ دەبینین دایك و باوك سورن لەسەر بەجێ هێشتنی زێڕ و سامان بۆ منداڵەکەی- زۆرتر لە سوربونیان لەسەر بەجێهێشتنی ئەدەب و ڕەوشت، وا ئەزانن ماڵ و سامانیان مسۆگەری بەختیاری و سەرکەوتنیانە!!

ئیمام عەلی کوڕی مەدینی دەڵێ: ((بەجێ هێشتنی رەوشت بۆ منداڵ لە بەجێ هێشتنی ماڵ و سامان باشترە، ڕەوشت ماڵ و پلە و پایە و خۆشەویستی برایانیان بۆ بەدەست دێنێ و، چاکەی دنیا و ڕۆژی دواییيان بۆ کۆدەکاتەوە))[1].

[1] تنبيه المغترين، ص٤١.

# شوێنەواری پەروەردە لە دەرونی منداڵ دا

پرۆسەی پەروەردەیی هەر لە سەرەتای ساڵانی یەکەمی ژیانی ئادەمیزادەوە دەست پێ دەکات و تا کۆتایی ژیانی بەردەوام دەبێت.

پەروەردە لە کۆتایی ساڵی یەکەمی تەمەنی منداڵ دەست پێ دەکات، لەو کاتەی هەست بە تێگەیشتنی فەرمان بەچاکە و بەربەست لە خراپە دەکات و دەرك بە مانای توڕەبون و ڕەزابونی دەوروبەری دەکات، جا فەرمان و قەدەغەی ئاراستە دەکرێ، هەر چەندە تێگەیشتن و هەست کردنی و بەجێهێنانی ئەوەی، کە ئاراستەی دەکرێ تەواو نەبوە، بەڵام وردە وردە بەرەو تەواوی دەڕوات، جا منداڵ چەندە تەمەنی گەورەتر بێت، گرنگی دانی بە ئاراستەکردنی تەمێ کردنی زیاتر دەبێ.

دەروناسی نوێ بەدەری خستوە، کە منداڵ توانایەکی زۆری هەیە بۆ وەرگرتن و تۆمارکردن و بەرامبەرکێ و لاسایی کردنەوە، جا لەسەر دایك و باوکە، کە بە تەواوی ڕەچاوی ئەم لایەنە بکەن و بیروباوەڕیان وانەبێ، کە منداڵ لە ساڵانی یەکەمی تەمەنیدا ناتوانێ شتی دەوروبەر وەربگرێ و بە ئاراستە پەروەردەیی‌یەکان کاری تێناکرێ.

ئیسلام بایەخی زۆری داوە بە ئاراستەکرنی منداڵ و ڕێك پێك کردنی ڕەفتار و پەروەردەیان، زانا مسوڵمانەکانیش جەختی ئەوە دەکەن پێویستە سود وەربگیرێ لە توانای گەورەی منداڵ و وەبەرهێنانی بەشێوەیەك، کە چاکسازی ئەوی تێدایە.

ئیمام عەلی ﷺ فەرمویەتی: (دڵی منداڵ وەك زەویەکی بەتاڵە، هەر چ شتێکی فڕێ بدرێتە ناوی وەری دەگرێ).

ئیمام أبي زيد القيرواني دەفەرموێ: (بزانە باشترین دڵ، کە خێر و چاکە وەربگرێ ئەوەیە گەر پێشتر خراپەی نەهاتبێتە ناوی، یەکەم شت کە ئامۆژگاری

کەران بایەخیان پێداوە و ئارەزومەندان ئارەزوی پاداشتی پێ دەدەن بریتی‌یە لە گەیاندنی چاکە بۆ ناو دڵی منداڵانی بڕواداران، تاوەکو لەدڵیاندا بچەسپێ و ئاگادارکردنەوەیان لەسەر ئادگارەکانی ئایین و سنورەکانی شەریعەت، تاوەکو قەناعەتیان پێ بێت و بیروباوەڕیان بە ئایین هەبێت و بە کردەوەش لە ئەندامەکانیان ڕەنگ بداتەوە)[1].

ئیمام غەزالی دەفەرموێ: (منداڵ لە لای دایك و باوکی ئەمانەتە، دڵە پاکەکەشی گەوهەرێکی گران بەهایە و ساویلکەیە و لە گشت نەخش و نیگارێك و خاڵی‌یە، ئامادەیی وەرگرتنی هەمو نەخشێکە و مەیلی هەیە بۆ هەمو ئەوانەی کە مەیلیان بۆ دەچێ، جا گەر لەسەر خەیر و چاکە ڕابهێنرێ و فێربکرێ، ئەوا لەسەر ئەمە پێدەگات و بەختیار دەبێ لە دونیا و ڕۆژی دوایی، لە پاداشتەکەیدا دایك و باوکی و هەمو پەروەردیار و مامۆستایەك بەشدارن، گەر لەسەر خراپەکاری ڕابهێنرێ و وەك ئاژەڵ فەرامۆش بکرێ ئەوا بەدبەخت و بەهیلاك چوە، تاوان و گوناهەکەش لە گەردنی سەرپەرشتیارەکەیەتی)[2].

ئا بەم شێوەیە دەبینین زانایان سورن لەسەر ئەوەی، کە هەر منداڵێك لە دایك دەبێ، ئامادەیی‌یەکی تەواوی هەیە بۆ وەرگرتنی ئاڕاستەکردن و پەروەردەکردن، کە دایك و باوکی پێشکەشی دەکەن، هەروا ئامادەیی هەیە بۆ بەدەست هێنانی ڕەفتار و نەریتی باش و خراپ، لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر دایك و باوك ئاڕاستەی ساغ و دروستی بکەن، کە لە دڵیدا جێی خۆی دەگرێ و بەدرێژایی ژیانی کاری تێ دەکات.

پێغەمبەر ﷺ وریایی داوە لەسەر کاریگەری مەترسی داری پەروەردەی دایك و باوك و ئاراستەکردنی منداڵەکانیان داوە وەك دەفەرموێ: ((**مَا مِنْ مَوْلُود إلاَّ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُمَجِّسَانِهِ أَوْ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ**: هەر منداڵێك کە

---

[1] شرح رسالة ابن أبي زيد القيرواني، ص٨.
[2] إحياء علوم الدين، ج٣/٧٢.

لە دایك دەبێت لەسەر فیترەتی خواناسی لــە دایــك دەبێــت، جـا دایــك و بـاوك دەیکەنە ئاگر پەرست، یان دەیکەنە جولەکە، یان دەیکەنە گاور.))[1] .

ئیمامی غەزالی دەفەرموێ: (گەوهەر و کرۆکی منداڵ وا دروست کراوە، کــە توانای وەرگرتنی چاکە و خراپەی هەیە، جا دایك و باوکی بــۆ یــەك لــەم لایــەی ڕادەکێشن)[2] .

لەبەر ئەوە لە کۆنەوە گوتراوە:

وَينْشأ ناشيء الفتيان فينا    على ما كان عودهُ أبوهُ

وە گوتراوە:

قد ينفع الادبُ الفتيان في صِغَرِ    و ليس يَنْفَعُهُم مِنْ بَعْدِهِ أدبُ
أن الغصون إذا عَدَلْتَها اعتدلتْ    ولا يلينُ، ولو عدلته الخَشَبُ

وێنە و نمونەی ئاڕاستەی ئیسلامی بــۆ منداڵــی بچــوك، هــەروا ســوربون لــە ئاگادارکردنەوەیان لەسەر ڕەفتاری هەڵە و چەوت دا ریوایەتی ئــەبو هورەیرەیــە، کە گوتویەتی: حەسەن دەنکە خورمایــەکی زەکــاتی هەڵگرتــەوە و خســتیە نــاو دەمی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "**كِخْ كِخْ لِيَطرَحهَا- أمَا عَلِمْتَ أنَّا لَــا نَأْكُلُ الصَّدَقَةَ:** کخ کخ -بــۆ ئــەوەی فــڕێ بــدا- نــازانی کەئێمــە شــتی زەکــات ناخۆین.))[3] .

لە ئیبن سیرینەوە هاتوە ﷺ کە گوتویەتی: (ئێمە منــداڵ بویــن پیــاوێك لــە لامان دانیشت، گوتی: عومەری کوڕی خەتتاب لە زەمانی ئەوە و ئەمــەدا بــۆی نوسین، کە کراس لەبەر بکەن و پێڵاو لەپێ بکەن، بەشێوەیەك بژیــێن کــە بۆتــان ئامادەکراوە، واز لە ژیانی خۆش گوزەرانی و جل و بەرگی بێگانە بێنن)[4] .

---

[1] أخرجه البخاري برقم (١٢٩٢) و مسلم برقم (٢٦٥٨).
[2] إحياء علوم الدين، ج٣/٧٤.
[3] أخرجه البخاري برقم (١٤١٤ و مسلم برقم (١٠٦٩).
[4] أخرجه عبدالرزاق في (المصنف) ج١١/٨٤.

له سەهلی کوڕی عبداللە ی توستەرییەوە ﷺ گوتویەتی: (مــن تەمــەنم سـێ ساڵان بو شەو هەڵدەستامەوە تەماشای نوێژی محمدی کوڕی سواری خاڵم دەکـرد، ڕۆژێك پیێ گوتم: یادی ئەو خوایە دەکەیت کە دروسـتی کردویـت؟ گـوتم: چـۆن یادی بکەم؟ گوتی: لەو کاتەی جلت دەگۆڕی بەدڵ سێ جار بەبێ ئـەوەی زمـانت بجولێنی بڵێ: خوام لەگەڵە، خوا تەماشــام دەکـات، خـوا شـایەتمە، جـا ئەمــەم گوتەوە و پێم گوت کە گوتمەوە، جا گوتی: هەمو شەوێك حەوت جـاری بیڵێـوە: منیش گوتمەوە و پاشان پێم گوت کە گومەتەوە، جا گوتی: هەمو شەوێك یـازدە جار بیڵێوە: جا گوتمەوە، جا شیرینی ئەمە کەوتــە دڵمــەوە، دوای سـاڵێك خـاڵم پێی گوتم: ئەوەی فێرم کردی لەبــەری کــە، تـا دەچیتــە نـاو گــۆڕ بــەردەوام بــە لەسەری، چونکە لە دنیا و ڕۆژی دوایی سودت پێ دەگەیەنێ، چەند ساڵێکی پێ نەچو کە چێژ و شیرینی ئەمەم هەست پێ کرد، پاشان ڕۆژێك خـاڵم پـێی گـوتم: ئەی سەهل! هەر کەسێ خوای لەگەڵ بێ و تەماشای بکات و شایەتی بێت ئایــە سەرپێچی دەکات؟! کەواتە نەکەی سەرپێچی بکەیت)[1].

ئابەم جۆرە ئاڕاستە و ڕێنمایی ئەم خاڵە چاکــە بـۆ خوارزایەکـەی بـوە هـۆی بەختیار بونی لە دنیا و ئاخیرەتدا.

لەبەر ئەوە جارێکی تر جەخت لەســەر ئــەوە دەکەمــەوە، منـداڵ توانایــەکی گەورە و زۆری هەیــە بـۆ سـود وەرگرتــن لــەو ئامۆژگـاری و ڕێنماییانــەی کــە ئاڕاستەی دەکرێ، کەوا سپاردە (أمانة)یێکی گەورەیــە لــە بــەر دەسـتی دایـك و باوکی ڕۆژی دوایش دەربارەیان پرسیاریان لێ دەکرێ، کە ئایا مافیان پاراســتوە، یان فەوتاندویانە؟

هەر کەسێك پــەروەردەی منداڵــەکانی و چـاودێری کردنیـان لــە منداڵیــەوە فەرامۆش بکات، لە کاتی گەورە بونیان دا زۆر پەشیمان دەبێتەوە.

---

[1] إحياء علوم الدين، ج٣/٧٤.

# چاندنی بیروباوەڕی ڕاست لە دەرونی منداڵاندا

ئامانجی هەرە گرنگی گشت ژیانی ئـادەمیزاد، وەك قورئـانی پـیرۆز وێنـەی دەکات، بریتی‌یە لە یەکتایی خوای گـەورە و پەرستنی و ناسینی بـە باشـترین شێوە و ئاوەدان کردنەوەی گەردون بەپیێ شەریعەتی ئاسمانیی کە خـوای گـەورە دایناوە.

خوای گەورە فەرمویەتی:

﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾الذاريات:٥٦.

توێژەرەوانی قورئان لە مانای پەرستن (العبادة)ی ئەم ئایەتە چەند وتەیـەکیان هەیە کە:

یەکەم: یەکخوا پەرستی (التوحيد).

دوەم: بەندایەتی‌یەکی تەواو و گوێ ڕایەڵی کردن.

سێیەم: ناسینی خوای گەورە[١].

هەروەها لە گرنگـترین ئامانجـەکانی هاوسـەرگرتن (الـزواج) لـە ئیسـلام دا بریتی‌یە لە پێگەیاندنی نەوەیەکی بـڕواداری یـەکخوا پەرسـت، کـە بیروبـاوەڕی ڕاستی لە دڵ دا چەسپاو بێت و شوێنەوارەکەی لە ڕەفتار و کردەوەکانیدا ڕەنـگ بداتەوە.

دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ دوپاتی کاریگەری گەورەی دایك و باوك کردۆتەوە لە گەیاندنی بیروباوەڕی ڕاست بۆ منداڵان ئەوەتا فەرمویەتی:

((مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلَّا يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَـــأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِـــهِ أَوْ يُنَصِّرَانِـــهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ))[٢].

---

[١] تفسير القرطبي ج١٧/٥٥.

[٢] أخرجه البخاري و مسلم

گرنگترین بنەڕەتەکانی بیروباوەڕ کە پێویستە بە منداڵ بگوترێ بریتییە لە:

١- یەکخوا پەرستی.

٢- ڕام[1] کردنی دروستکراوەکان لەلایەن خواوە بۆ خزمەت کردنی ئادەمیزاد.

٣- باوەڕ بە قەزا و قەدەر و پشت بەستن بە خوا.

٤- خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ.

## یەکەم: یەکخوا پەرستی

گرنگترین شت کە ئایینی ئیسلامی پێ لە ئایینەکانی تر جیا دەکاتەوە، بریتییە لە گرنگیدانێکی زۆر بەبەدیار خستنی سیفەتی یەکتایی (الوحدانیة)ی خوای گەورە.

ئیسلام مکوڕە لەسەر ئەوەی وشەی یەکخواپەرستی (توحید) و گەورەکردنی خوای گەورە، یەکەم شت بێ، کە بە گوێی منداڵی تازە لە دایک بو دا بدات، ئەویش لە میانەی بانگدان بەگوێی ڕاستیەوە و قامەت خوێندن بە گوێی چەپیەوە دا دێتە دی.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ سور بوە لەسەر ئەوەی، کە وشەی یەکخواپەرستی لە سەرەتاییەکانی ئەو وشانە بێت، کاتێ منداڵ فێری قسە دەکرێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (زمانی منداڵەکانتان بەیەکەم وشەی (لاإله إلا الله) بکەنەوە و لەکاتی سەرە مەرگیشدا (لاإله إلا الله)یان پێ بڵێن)[2].

هەروەها فەرمویەتی: (هەر کەسێ منداڵێك پەروەردە بکات هەتا دەڵێ (لاإله إلا الله) خوای گەورە لێی ناپرسێتەوە)[3].

جا گەر منداڵ زمانی کرایەوە و پاراو بو، ئەوا ڕێبیر (مبادیء)ەکانی تری

---

[1] ڕام کردن: دەستەمۆ کردن.

[2] أخرجه البيهقي في (الشعب) برقم (٨٦٤٩).

[3] أخرجه الهيثمي من (مجمع الزوائد) ج٨/١٥٩.

بیروباوەڕی یەکخواپەرستی و بەپاك دانانی خوای گەورەی پێ دەگوترێ.

لە عەمری کوڕی شوعەیب، ئەویش لە باوکی و، لە باپیریەوە، کە گوتویەتی: گەر منداڵی نەوەی عبدالمطلب زمانی پاراو بوایە، پێغەمبەری خوا ئەم ئایەتەی فێر دەکرد:

﴿وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ﴾الاسراء: ١١١. ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا﴾الفرقان: ٢.[1]

جا گەر منداڵ گەیشتە پلەی جیاکردنەوەی شت لە یەکتری و تێگەیشتن، ئەوا باوکی فێری دەکات خوای گەورە چاودێرە بەسەریەوە و لەگەڵیەتی و ئاگادارە بەسەریەوە و لە هەمو گەورە و بچوکێك دا لێی دەپرسێتەوە، هەروەها خوای گەورە پاشای پاشایانە و بەدیهێنەری دروست کراوانە و سەرەتا و کۆتاییە و ڕۆزیدەر و شتەکانی بە ئەندازەیە، بە ئەندازەی گەردیلەیەك نە لە ئاسمان و نە لە زەوی لە زانستی خوای گەورە ون نابێ، هەروا باوك منداڵەکەی دەترسێنێ بە سزای خوای گەورە هانی دەدات بە پاداشت و چاکەکانی.

خوای گەورە لە زۆر ئایەت دا باسی سوربونی باوکان دەکات لەسەر ساغی و دروستی بیروباوەڕی منداڵەکانیان، وەك:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ ٱلْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِنۢ بَعْدِى قَالُوا۟ نَعْبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ ءَابَآئِكَ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ إِلَٰهًا وَٰحِدًا وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ: ئێوە ئامادە بون کاتێك یەعقوب لە سەرەمەرگ دا بو بە کوڕەکانی گوت لە دوای من چ دەپەرستن، گوتیان ئێمە خوای تۆ و خوای باوکت ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق دەپەرستین کە خوایەکی تاك و تەنهایە و ئێمەش بۆی مل

---

[1] تفسیر القرطبي، ج١٠/٣٤٥.

دەچێن. ﴿البقرة:١٣٣.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ لُقْمَـٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَـٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ: لوقمان ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکرد و دەیگوت: کوڕەکەم هاوبەش بۆ خودا پەیدا مەکە، هاوبەش دانان بۆ خوا ستەمێکی گەورەیە. ﴿لقمان:١٣.

هەروا فەرمویەتی: ﴿يَـٰبُنَىَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِى صَخْرَةٍ أَوْ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ أَوْ فِى ٱلْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ: کوڕێژگەی خۆم! کردەی بە ئەندازە تۆمی خەردەل لەسەر زەمین لەناو بەزدێك، یان لە تەشقی عاسمانان بێ، خودا دەیهێنێتە گۆڕێ. خوا هەمو شتی لێ دیارە و ئاگادارە﴾ لقمان:١٦.

کەمی ژمارەی وشەکانی سورەی ئیخلاص (قل هو الله أحد) و سورەی کافرون، کە سەری یەکخواپەرستی و پوختەکەیەتی، ئاماژەیە بۆ ئاسانی لەبەرکردنیان لە لایەن منداڵانی ئەو تەمەنەوە.

لە ئەنجامی ئەزمونی خۆم دا بۆم دەرکەوتوە، کە منداڵ لە تەمەنی دو ساڵ و نیوی بەنزیکەیی؛ توانای لەبەرکردن (حفظ)یان هەیە.

## دوەم: خوا بەدیهێنراوەکانی بۆ خزمەتی ئادەمیزاد رام[1] کردوە:

لەو بنەما بیروباوەڕیانەی کە پێویستە بەگوێی منداڵاندا بدرێ ئەوەیە، ئەوەی لە گەردون هەیە لە دیاردەی گەورە و بچوك؛ دەستکردی خوای گەورەیە، لە چاکە و فەزڵی خوایە بەسەر دروست کراوەکانی، کە ئەم نیعمەتەی بۆ رام کردون و سازی کردوە بۆ خزمەتکردنیان و سود وەرگرتن لێی، ئەم نیعمەتانەش

[1] رام: تسخير.

شایستەی ئەوەن سوپاسی خوای لەسەر بکرێ و، مافی خوای لێ بەجێ بهێنرێ و لە پەرستنیدا و بەجێ هێنانی مافەکەی بە پەرستنی.

زۆر ئایەتیش هاتوە، کە ئاماژە بەمە، دەکات لەوانە وەك:

خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ هُوَ ٱلَّذِی جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُوا۟ فِی مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ: خوای گەورە ئەو خوایەیە کە زەوی بۆ ڕاخستون و نەرمی کردوە کە لەسەری جێگیر بن، جا بەسەر ڕێگاکانیەوە بڕۆن و لە ڕۆزیەکەی بخۆن.﴾الملك:١٥.

هەروەها فەرمویەتی: ﴿أَفَلَا یَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَیْفَ خُلِقَتْ ۝ وَإِلَى ٱلسَّمَاۤءِ كَیْفَ رُفِعَتْ ۝ وَإِلَى ٱلْجِبَالِ كَیْفَ نُصِبَتْ ۝ وَإِلَى ٱلْأَرْضِ كَیْفَ سُطِحَتْ ۝: بۆ وردنابنەوە لە حوشتر، کە چۆن دروست کراوە؟ لە ئاسمان چۆن بەرزکراوەتەوە، لە شاخەکان چۆن داکوتراوە، لە زەوی چۆن ڕاخراوە؟﴾الغاشیة:١٧-٢٠.

گومانی تێدا نیە پەیوەست کردنی ئەم دیمەنە گەردونیانە بە بیروباوەڕەوە، لە دڵ و ویژدانی منداڵ دا دەچەسپێ.

## سێیەم: باوەڕ بە قەزا و قەدەر و تەنها پشت بەستن بە خوا

باوەڕبون بە قەزا و قەدەر، متمانە بون بە توانای خوای گەورە ، پشت بەستن بەخوا، گەشە پێدانی تواناکان و وزە شاراوەکانی دەرونی منداڵە.

پێغەمبەر ﷺ لە چەند هەڵوێستێکدا سوربوە لەسەر بڵاوکردنەوەی گیانی باوەڕبون بە قەزا و قەدەر و پشت بەستن بەخوا لە دەرونی منداڵاندا.

لە ئیبن عەباسەوە گێڕراوەتەوە، کە گوتویەتی: ڕۆژێك لە پشت پێغەمبەر بوم بەمنی فەرمو: ((یَا غُلَامُ، إِنِّي أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ: احْفَظِ اللَّهَ يَحْفَظْكَ، احْفَظِ اللَّهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ، إِذَا سَأَلْتَ فَاسْأَلِ اللَّهَ، وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ، وَاعْلَمْ

أَنَّ الْأُمَّةَ لَوْ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنفَعُوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَنفَعُوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ لَكَ، وَلَو اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيْكَ، رُفِعَتْ الْأَقْلَامُ وَجَفَّتْ الصُّحُفُ: ڕۆڵە! من چەند وشـەیەکت فێردەکـەم: "خوا بپارێزە واتە (ئاینی لە فەوتان بپارێزە) دەتپارێزێت، خوا بپارێزە هەمیشـە یارمەتی ئەو لە هەمو ئیشێکدا کەروی تیّ بکـەیت دیارە و دەبینیـت، ئەگـەر داوای شتێکت کرد داوا لە خوا بکە، ئەگەر پشتت بەست پشت بە خوا ببەسـتە، بزانە ئەگەر هەمو خەڵك لەسەر ئەوەبن، کە سودێك بە تـۆ بگەیـەنن، کـە خـوا بۆی نەنوسیبیت ئەو سودەت پیّ ناگات، ئەگەر هەموشیان لەسەر ئەوە بـن، کـە زیانێك بەتۆ بگەیەنن، ئەگەر خوا لەسەر تۆی نەنوسیبێت ناتوانن ئەو زیانـە بـە تۆ بگەیەنن، قەزا و بڕیاری خوا بڕاوەتەوە و نوسراوە.))[1] .

ئەوەی لەم فەرمودە پیرۆزە جیّی ڕامانە؛ وردی ماناکانی و کورت و پوختـی ماناکانی‌یەتی بۆ گونجان لەگەڵ حاڵی ئەو کەسەی کە وەری دەگریّ، ئەویش ئیـبن عەباس بوە، کە منداڵ بوە و لە کاتێکی کورتدا، کە ئیبن عەباس لە گەشـتێکی کورت دا هاوڕێی پێغەمبەری کردوە.

لەو فەرمودە گرنگانەی دەربارەی ئەم بوارە هاتون ئەوەیە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنَ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ، وَفِي كُلٍّ خَيْرٌ، احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ وَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَلَا تَعْجَزْ، وَإِنْ أَصَابَكَ شَـيْءٌ فَلَا تَقُلْ لَوْ أَنِّي فَعَلْتُ كَانَ كَذَا وَكَذَا، وَلَكِنْ قُلْ قَدَرُ اللَّهِ وَمَا شَاءَ فَعَلَ، فَـإِنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ: بڕواداری بەهێز باشـتر و خۆشەویسـترە لـە لای خـوای گەورە لە بڕواداری بیّ هێز و لاواز، بۆ هەر یەکێکیشـیان چاکـە هەیـە، سـوربە لەسەر ئەو شتەی کە سـودت پـیّ دەگەیـەنیّ و پشـت بـەخوا ببەسـتە و خـۆت کەنەفت مەکە، جا گەر ناخۆشیەکت توش هات، مـەڵیّ گـەر ئـاوام بکردایـە وا

[1] أخرجه الترمذي برقم (٢٥١٨).

دەبوم، بەلاَم بلێ خوای گـەورە ئـەندازەی ئەمـەی وا دانـاوە و خـۆی چـی بـوێ ئەنجامی دەدات، چونکە گوتنی ئەگەر وام بکردایە ئـاوادەبوم کـردەوەی شـەیتان دەکاتەوە.))[1] .

هاوەڵە بەڕێزەکان (ڕەزای خوایان لێبێ) چاویان لە پێغەمبەری ئازیز کردبـو، سوربون کە بیروباوەڕی راسـت بخـەن بـەگوێی منـداڵەکانیـان، لـە بچوکیانـەوە پەروەردەیان کردن لەسەر پشت بەستن بە خوای گـەورە و، داواکردنـی چاکـە لـە خوای تاکی پاك.

لە موصعەبی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسەوە، کـە گوتویـەتی: سـەعد فێری پێنج شتی دەکردین، کە پێغەمبەر ﷺ باسی کردون: ((اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُـوذُ بِكَ مِنْ الْبُخْلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ الْجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُـرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الدُّنْيَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَـبْرِ: خوایـە پـەنات پـێ دەگرم لە ڕەزیلی، پەنات پێ دەگرم لە ترسنۆکی، پەنات پـێ دەگـرم لـەوەی کـە زۆر بەساڵا بچم، پەنات پێ دەگرم لەفیتنەی دنیا، پەنات پێ دەگرم لـە ئـازار و ئەشکەنجەی گۆڕ.))[2]

شاراوە نیە نزا و پاڕانەوە، چ کاریگەریەکی هەیە لە چاندنی پشت بەسـتن بـە خوا لە دەرونی ئادەمیزادا، بە گەورە و بچوکەوە.

گەر دایك و باوك توانیان هەر لە بچوکیەوە بیروباوەڕی راست لە دڵی منـداڵ بڕوێنن ئەوا بۆیان دەبێتە قەڵایەکی بەربەست لە دژی گشـت بیروبـاوەڕە پیـس و پوچەڵەکان و بیرۆچکە ڕوخێنەرەکان کە ڕەنگە لە کۆمەڵگەکەیدا هەبێ، ئەوەی لە دەوریەتی ڕای بماڵێ.

---

[1] أخرجه إبن ماجة، برقم (٤١٦٨).

[2] أخرجه البخاري برقم (٢٨٢٣) و مسلم برقم (٢٧٠٦) و الترمذي برقم (٣٤٨٠) بروايات متعددة

## چوارەم: خۆشویستنی پێغەمبەر ﷺ:

بیروباوەڕبون بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ و خۆشویستنی و چاولێکردنی، بەشی دووەمی وشەی یەکخواپەرستیە: (لاإله إلا الله، محمد رسول الله).

لەبەر ئەوە پێویستە دایك و باوك و سەرپەرشتیکاران، منداڵان فێری خۆشویستنی پێغەمبەر ﷺ بکەن، ئەمەش لە ڕێگەی باسکردنی سیفەتە جوانەکانی و ڕەوشتی بەرزی،کەخوای گەورە چۆن بە رەحمەت بۆ هەمو جیهانی ناردوە، کە باسیشی دەکرێ دەبێ بگوترێ ﷺ تا وەکو منداڵان لەسەر ئەوە رابێن.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((أدبوا أولادكم على ثلاث خصال: حب نبيكم و حب أل بيته، و تلاوة القرآن، فإن حملة القرآن في ظل عرش الله، يوم لا ظل إلا ظله، مع أنبيائه و أصفيائه: منداڵەکانتان لەسەر سێ خەسڵەت پەروەردە بکەن: خۆشەویستی پێغەمبەرەکەتان، خۆشەویستی خانەوادەی پێغەمبەر، خوێندنەوەی قورئان، چونکە هەڵگرانی قورئان لە ژێر سێبەری عەرشی خوای گەورەن لە رۆژێك جگە لە سێبەری ئەو، هیچ سێبەری تر نیە، لەگەڵ پێغەمبەرەکانی و هەڵبژاردەکانی.))[1].

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ سوربون لەسەر فێرکردنی منداڵەکانیان بە خۆشویستن و بەرگری کردنی پێغەمبەر.

بۆ وێنە: ژنێك لە رۆژی ئوحودا شمشێرێکی دایە دەست کوڕەکەی، بەڵام کوڕەکەی پێی هەڵنەدەگیرا، ئەویش شمشێرەکەی بەگوریسێك لەسەر دەستی بەستەوە، پاشان بردیە لای پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەمە کوڕمە و کارت بۆ دەکات، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "کوڕەکەم ئالێرەوە هەڵبگرە، ئالێرەوە هەڵبگرە، جا بریندار بو و هێنایانە لای پێغەمبەر ﷺ،

[1] أخرجه الشيرازي في (فوائده) وابن النجار في (تأريخه) و الهندي في (كنز العمال) برقم (٤٥٤٠٩).

پێغەمبەر فەرموی: "کوڕەکەم ڕەنگە پەشۆکاو و ترسابی"، گوتی: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا.[1]

لە عبدالرحمن ی کوڕی عەوفەوە ﷺ کە گوتویەتی: لە جەنگی بەدر لە ڕیزدا وەستابوم، کاتێك تەماشای ڕاست و چەپم کرد و بینیم لە نێوان دو منداڵی ئەنساری دام، جا یەکێکیان دەستی لێ دام و گوتی: مامە! ئەبو جەهل دەناسی؟ گوتی گوتم: بەڵێ، برازا چ کارت پێیەتی؟ گوتی: پێم گوتراوە، کە جنێو بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەدات، سوێندم بەوەی گیانمی بەدەستە گەر بیبینم لێی جیا نابمەوە هەتا یەکێکمان ئەوی تر زوتر دەکوژێ، گوتی: سەرم لەمە سوڕما، جا ئەوەی تر دەستی لێدام و هەمان قسەی ئەوی تری کرد، گوتی: کە تەماشام کرد ئەوا ئەبو جەهل لەناو خەڵکی دەڕوات، گوتم: ئەوە نابینن؟ ئەوە ئەو کەسەیە، کە ئێوە پرسیاری لێ دەکەن، گوتی: چونە پێشەوە و بەشمشێرەکەیان لێیاندا و کوشتیان.[2]

لە نمونەی پەروەردە کردنی منداڵی مسوڵمانان لەسەر خۆشویستنی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەیە، کە گێڕراوەتەوە چەند منداڵێکی شاری بەحرەین دەرچون یاری (قاشوان)[3] بکەن و (أسقف)[4]ی بەحرەین دانیشتبو جا گۆپاڵەکە کەوتە سەر سینگیەوە و هەڵی گرت، ئەوانیش داوایان کردەوە و نەیدانەوە، یەکێك لە منداڵەکان گوتی: بۆ خاتری محمد ﷺ باندەرەوە، ئەویش نەیدانەوە و جنێوی بە پێغەمبەر دا ﷺ ، ئەوانیش بە گۆپاڵەکانیان هێرشیان کردە سەری و لێیاندا تا مرد.[5]

---

[1] أخرجه ابن أبي شيبة في (مصنفه) برقم (١٨٦٢٩).
[2] أخرجه مسلم برقم (١٧٥٢).
[3] قاشوان: یارییەکە بەعەرەبی پێی دەگوترێت (صوجلە)، کە بریتییە لە لێدانی تۆپ بە گۆچان (هۆکی).
[4] أسقف: لە پلەی قەشە گەورەترە و نەگەیشتۆتە پلەی مەطران. وەرگێڕ.
[5] المستطرف.

لەم سێ چیرۆکەی پێشو بۆمان دەرکەوت چۆن خۆشویستنی پێغەمبەر ﷺ لە دڵی منداڵاندا چەسپابو، کە ئەوەش پاڵی نان بۆ تۆڵەسەندن لەو کەسەی، کە ئازاری پێغەمبەریدا ﷺ.

شایانی باسە خوێندنەوەی ژیاننامەی پێغەمبەر بەتایبەتی ئەوەی کە پەیوەندی بە جیهاد و تێکۆشانی پێغەمبەر ﷺ و ئازاردانی هاویەش پەیداکەران بۆی، کاریگەریەکی بەهێزی هەیە لە دەرونی منداڵاندا و خۆشویستن بۆ پێغەمبەر ﷺ پتەوتر دەکات، هەروا زیاتر حەز بەوە دەکەن بە هەواڵی پێغەمبەر و هاوەڵەکانی ئاشنا بن.

لە کۆتاییدا دەبێ ئاگاداری ئەوە بین، کە منداڵان ناتوانن لە هەمو ماناکان و بەڵگە بیروباوەڕیەکان تێبگەن، کە پێیان رادەگەیەنرێ، بەڵام ئەوە نابێتە رێگری پێدانی ئەم زانیاریانە بۆیان و پێ گوتنیان، ئەم پێراگەیاندن و پێ گوتنە وردە وردە دەگۆڕێ بۆ تێگەیشتن و بیروباوەڕبون.

ئیمام غەزالی دەڵێ: (بزانە ئەوەی باسمان کرد لە راڤە کردنی بیروباوەڕدا، پێویستە بەمنداڵ بگوترێ هەر لە سەرەتای پێگەیشتنییەوە، بۆ ئەوەی لەبەری بکات، پاشان کە گەورە بو وردە وردە ماناکەی بۆ ئاشکرا دەبێت، جا دەست پێکردنی بە لەبەرکردن و پاشان تێگەیشتن، ئینجا باوەڕبون و یەقینی و بەڕاست دانانی، کە منداڵ بەبێ بەڵگە دەستە بەری دەکات. ئەوەش لە فەزڵ و چاکەی خوای گەورەیە بەسەر دڵی ئادەمیزادا، کە لە سەرەتای پێگەیشتنیەوە دڵی کردۆتەوە بۆ بڕواهێنان بەبێ پێویست بون بە بونی بەڵگە.. گەر بەڵگەکانی قورئانی بەگوێ دابدرێ، نمونە و سودەکانی فەرمودەکانی پێغەمبەری بۆی بهێنرێتەوە، هەروا رۆشنایی پەرستنەکان و ئەرکەکانی لەلا رون و ئاشکرا بکرێ، هەروا کە پیاو چاکان ببینێ و گوێیان بۆ بگرێ و شێوازی مل کەچیان بۆ خوای گەورە و ترسان لیێ ببینێ، ئەو کاتە بیروباوەڕی زیاتر پتەو دەبێ وە دەچەسپێ. جا یەکەم وانە و فێرکردن، وەك وەشاندنی تۆوەبۆ ناو دڵ.

ئەو هۆیانەش وەك ئاودێری و پەروەردەکردنیەتی، تاوەکو ئەم تۆوە گەشە دەکات و دارێکی چاکی چەسپاو بەرز دەبێتەوە، کە بنەڕەتەکەی جێگیر و لقەکانی بە ئاسمانەوەیە)[1].

جا تێڕامان لە قسەی ئیمام غەزالی، سودی پەروەردەیی بەرزی هەیە، لە خوای گەورە داواکارین سودمان پێی بگەیەنێ.

---

[1] إحياء علوم الدين ج١/٩٤.

# ڕاهێنانی منداڵان بە بەجێهێنانی فەرزەکانی خوا

گومانی تێدا نیە دایك و باوك کاریگەری گەورەیان هەیە لە پابەندکردنی منداڵ بەوەی، کە خوای گەورە داوای لێ دەکات و فەرزەکانی بەجێ بهێنێ، ئەمەش بەوە دێتە دی، کە منداڵ هەر لە بچوکیەوە ڕابهێنرێ لە بەجێ هێنانی پەرستنەکان و طاعەتەکان بە نەرمی و هێمنی و پلەپلەیی، جا کە منداڵ گەورە بو و گەیشتە تەمەنی (١٥) ساڵی، ئەوا هیچ زەحمەتیەك نابینێ لە بەجێ هێنانی پەرستنەکان و طاعەتەکان و کەمتەرخەمی تێدا ناکات، ئەو کاتەش دایك و باوکی دەبنە هۆی ڕزگاربونی لە تاوانی کەمتەرخەمی کردنی بەجێ هێنانی فەرزەکان و لە دەست دان و بەجێ نەهێنانی مافەکان.

لەبەر ئەوە ئیمام غەزالی دەفەرموێ: (پێویستە چاوپۆشی نەکرێ لە نەکردنی نوێژ و دەست نوێژ و خۆ پاك کردنەوە، بەڵکە لە هەندێ ڕۆژانی ڕەمەزان فەرمانی پێ دەکرێ بەڕۆژو بێ، هەروا دور دەخرێتەوە لە پۆشینی جلی ئاوریشم و زێڕ و ئاڵتون)[1].

خوای گەورە لەسەر مسوڵمانی پێویست کردوە کە سور بێ لەسەر پابەندبونی ماڵ و منداڵی بە فەرمانەکانی خوای گەورە و کەمتەرخەم نەکردنیان لە بەجێ هێنانی طاعەت و پەرستنی خوا.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَوٰةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا: فەرمان بەخێزانت بکە بە نوێژ کردن و بەردەوام بون لەسەری.﴾طه:١٣٢.

زۆر فەرموده هاتون سەبارەت بە فەرمان کردنی پێغەمبەر ﷺ بە دایك و باوکان، کە سور بن لەسەر ڕاهێنانی منداڵەکانیان بە بەجێهێنانی فەرزەکان، هەر لە تەمەنی بچوکیانەوە و بەر لە تەمەنی (١٥) ساڵی، لەو فەرمودانە وەك:

---

[1] إحياء علوم الدين ج٣/٧٤.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((مُرُوا أَوْلَادَكُمْ بالصَّلَاة وَهُمْ أَبْنَـــاءُ سَــبْعٍ، وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا وَهُمْ أَبْنَاءُ عَشْرٍ وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَـــاجِعِ: لـه تەمـەنی حەوت ساڵی فەرمان بە منداڵەکانتان بکەن بەنوێژ کردن، لە تەمەنی (دە) ساڵی لەسەر نوێژ نەکردن لێیاندەن وە لەسەر جێ لە یەکیان جیا بکەنەوە، بە واتای لە تەنیشت یەکتری نەخەون.))[1]

هەروەها فەرمویەتی: ((إذا عرف الولد يمينه من شماله، فأْمُرُهُ بالصلاة: گەر کوڕ ڕاست و چەپی خۆی ناسی، ئەوا فەرمانی پێبکە بە نوێژ کردن.))[2]

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((حافظوا على أولادكم في الصـــلاة، و عودوهم الخير، فإن الخير عادة: نوێژی منداڵـەکانتان بپـارێزن (نوێـژ بکـەن) و لەسەر چاکە ڕایان بهێنن چونکە چاکە عادەتە.)).

پێغەمبەر ﷺ سوربوە لەسەر ئامادەبونی منداڵ لەگەڵ گـەورە بـۆ نوێـژ لـە مزگەوتدا، تا وەکو چۆنیەتی نوێژکردنەکە ببینن و بەکردەوە یاساکانی نوێژ فـێر ببن، هەروا منداڵانیشی لە نێوان پیاو و ئافرەتان ڕیز دەکرد.

هەروەها پێغەمبـەری خـوا ﷺ سـوربوە لەسـەر ئاگادارکردنـەوەی منـداڵان لەسەر هەڵـەکانی نوێژیـان دا و فـێرکردنی پەرسـتنەکانیان بـە پلەپلـەیی و بـە شێوەیەکی ڕاست و دروست.

نمونەی ئەمەش وتەکەی حەسەنی کوڕی عەلی‌یە (ڕەزای خوایـان لێبـێ) کـە دەڵێ: (پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە نوێـژی (وتـر) دا چـەند وشـەیەکی فـێرکردم دەمگوتەوە: ((اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَـنْ تَوَلَّيْتَ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ، وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ، فإِنَّكَ تَقْضِي وَلَا يُقْضَـى عَلَيْكَ، وَإِنَّهُ لَا يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ، وَلَا يَعِـــزُّ مَـــنْ عَـــادَيْتَ، تَبَـــارَكْتَ رَبَّنَـــا

[1] أخرجه أبوداود برقم (٤٩٥).
[2] أخرجه الهيثمي في (مجمع الزوائد) ج١/٢٩٤.

وَتَعَالَيْتَ))[1].

له ئەنەسەوە ﷺ گێڕراوەتەوە، کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموە: ((يَا بُنَيَّ إِيَّاكَ وَالِالْتِفَاتَ فِي الصَّلَاةِ فَإِنَّ الِالْتِفَاتَ فِي الصَّلَاةِ هَلَكَةٌ: کوڕەکەم نەکەی لەنوێژ ئاوڕبدەیتەوە، چونکە ئاوڕدانەوە لە نوێژ تیاچونە.))[2]

لە ئوم سەلەمەوە گێڕراوەتەوە، کە گوتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کوڕێکی بینی ناوی ئەفلەح بو، گەر سوجدەی ببردایە فوی دەکرد، پێغەمبەرﷺ پێی فەرمو: "ئەفلەح! ڕوخسارت بەخۆڵ بێت".[3]

گەر بگەڕێین دەبینین ئەوانەی بە تەمەنن و پارێزگاری نوێژەکانیان ناکەن، یان هەر نوێژ ناکەن، یەکەم هۆی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی، کە لە منداڵیەوە لەسەر نوێژکردن ڕانەهاتون، گەر سۆراخی ئەوانە بکەین، کە پارێزگاری نوێژەکانیان دەکەن، دەبینین زۆربەیان لە منداڵیەوە لەسەر نوێژ کردن ڕاهاتون، لەبەر ئەوە گوتراوە: (هەمو شتێك عادەتە تەنانەت عیبادەتیش).

لەبەر ئەوە لەسەر دایك و باوك پێویستە سوربن لەسەر ئەوەی، هەر لە سەرەتای هۆشیاری منداڵەوە لە تەمەنی سێ ساڵیدا نوێژ بەبیر منداڵەکانیان بێننەوە لە هەمو کاتێکی نوێژدا، پاشان لە تەمەنی حەوت ساڵی فەرمانیان پێ بکەن بەنوێژکردن و چۆن بەجێی دەهێنن لێی ڕازی بن، با هەندێك کەم و کورتیشی تێدا بێت، ئینجا بەر لە تەمەنی (١٥) ساڵی سور بن لەسەر بەجێهێنانی نوێژ بەشێوەیەکی تەواوتر.

هەروەها سەبارەت بە ڕۆژوش، ئەو عیبادەتەی کە زۆر لە گەوران لەسەریان گران و زەحمەتە، کە هەندێکیان ناتوانن لەبەردەم خواردن و خواردنەوە و ئارەزوەکان خۆ ڕابگرن، لە بەرەبەیانەوە تا ڕۆژئاوا بون مافی خوا بەجێ ناهێنێ

---

[1] أخرجه الترمذي برقم (٤٦٤).
[2] أخرجه الترمذي برقم (٥٨٩).
[3] أخرجه الترمذي برقم (٣٨١).

و گوناه دەكات و خوای گەورەش لیێ توڕە دەبێ، بەڵام ئەوانەی لە منداڵیەوە لەسەر ڕۆژو و گرتن ڕاهاتون، هەڵبەت كە گەورە بون هیچ زەحمەتێك نابینن لە ڕۆژو گرتنی ڕەمەزان، مەگەر ئەو زەحمەتە ئاسایی‌یە نەبێ كە ئارامی لەسەر دەگیرێ.

بوخاری لە (صحيح)دا بابێكی هێناوە بەناونیشانی ڕۆژوی منداڵان، ریوایەت كراوە كە عومەر ﷺ لە مانگی ڕەمەزاندا بە نەشوانی گوتوە -واتا سەرخۆش- : (ماڵ وێران؟ چما منداڵەكانمان بەڕۆژون) جا لێی داوە)[1].

لە ڕەبیعی كچی معوەذەوە كە گوتویەتی: (پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی عاشورا یەكێكی ناردە گوندەكانی ئەنساریەكان: "هەر كەسێك بەڕۆژوە با بەڕۆژو بێ" ڕەبیع گوتی: ڕۆژو دەگرین و واش دەكەین منداڵەكانمان بەڕۆژو بن، لە خوری یاریان بۆ دروست دەكەین، جا گەر یەكێكیان بۆ خواردن بگریێ، ئەوا خواردنی دەدینێ تا دەگاتە بەربانگ.[2]

لەبەر ئەوە كۆمەڵێك لە سەلەف لەوانە: ئیبن سیرین و زوهری و شافیعی بە باشیان داناوە، فەرمان بە منداڵ بكرێ بەڕۆژو بێ تا لەسەری رابێ، گەر لە توانای منداڵ دا بو، هاوڕێیانی شافعی سنوری ئەمەیان وەك نوێژكردن بە تەمەنی (حەوت)ساڵی و (دە) ساڵی داناوە، ئیسحاق سنورەكەی بە دوازدە ساڵ داناوە و ئەحمەدیش بە دەساڵ.[3]

چی تێدانیە گەر لە سەرەتادا منداڵ ڕابهێنرێ لەسەر ئەوەی، كە تا نیوەڕۆ یان تا عەسر بە ڕۆژو ببێ، جا گەر تا ئەو كاتەی توانی، ئەوا ڕۆژێكی تەواو بەرۆژو ببێ تا لەسەر بەرۆژو بون رابێت، پاشان وردە وردە وای لیێ دێ مانگەكە گشتی بە ڕۆژو بێت.

---

[1] أخرجه البخاري، تعليقا.
[2] أخرجه البخاري برقم (١٨٦٠) و مسلم برقم (١١٣٦).
[3] فتح الباري ج٤/٢٣٦.

زۆر چاك لەیادمە چۆن لە تەمەنی شەش ساڵیەوە لە مانگی رەمەزان دو رۆژ یان سێ رۆژ بەرۆژو دەبوم، پاشان کە تەمەنم گەیشتە نۆ ساڵی هێندەی نەمابو هەمو مانگەکە بەرۆژو ببم، کەچی هەندێ لە هاورێیانم تەمەنیان دەگەیشتە پازدە و حەڤدە و هەندێکیان لە بیست ساڵ تێپەری دەکرد نەیان دەتوانی هەمو مانگەکە بەرۆژو بن، چونکە لە منداڵیەوە رانەهاتبون.

لەسەر دایك و باوکە کە شێوازی هاندان بەکاربهێنن و پاداشتی منداڵەکانیان بدەنەوە بۆ هاندانیان لەسەر نوێژ و رۆژوگرتن، ئەمەش بە پێشکەش کردنی دیاری و هاندانی.

بەنمونە: دایکم (خوا بیپارێزێ) بۆی باس کردم، کە باوکی (شێخ محمد شریف یەعقوبی) -رەحمەتی خوای لێبێ- کە منداڵ بوە هانی داوە لەسەر رۆژو گرتن، جا لە مانگی رەمەزان رۆژێك یان دو رۆژ بەرۆژو دەبو کاتێ کە تەمەنی حەوت ساڵان بوە، جا باوکی لە پای ئەم کارە دەیخستە سەر شانی و بەماڵدا دەیگەراند و بەسەر پەیژەدا سەر دەکەوت و دەهاتە خوارەوە پاشان لەگەڵ خزمەتکارەکەی دەینارد و پێی دەگوت: لە پاداشتی رۆژی گرتنەکەی چی حەز لێیە بۆی بکرە.

لەسەر دایك و باوکە کە خۆشویستنی منداڵان بقۆزنەوە و بۆ ئەوەی لاسایی گەوران بکەنەوە، تا لە پەرستن و عیبادەتدا رابێن، چونکە منداڵان هەر کارێك بکەن، بەپاڵنەری خۆشویستنی سەرپەرشتیارانیان ئەو کارە ئەنجام دەدەن و لاسایی نوێژ و عیبادەتی سەرپەرشتیارانیان دەکەنەوە، هەروەها منداڵان حەز دەکەن لەگەڵ گەوران لەسەر خوانی پار شێوان و بەربانگ دابنیشن.

هەروا حەز دەکەن لەکاتی قورئان خوێندن و زیکرەکان و پەرستن و طاعەتەکان دا لەبەردەم دایك و باوکیان دابنیشن و چاویان لێبکەن.

لە بەزەیی و رەحمەتی خوای گەورە بۆ ئادەمیزاد ئەوەیە، کە پاداشتی کردەوەی منداڵەکەی بۆ حساب دەکرێ و پاداشتی لەسەر وەردەگرێ گەر بەجێی هێنا، لەگەڵ ئەوەی منداڵ داوای بەجێهێنانی لێ نەکراوە و گوناە نیە گەر

نەیكات.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((**لكتب للصبي حسناته، ولا تكتب سيئاته**: منداڵ چاكەكانی بۆ دەنوسرێ و خراپەكانی بۆ نانوسرێ.))[1].

هەروەها لە ڕەحمەت و فەزڵ و چاكەی خوای گەورە ئەوەیە كە دایك و باوك بەشدار دەكات لە پاداشتی عیبادەتی منداڵەكانیان و لە پەڕاوی دایك و باوكان تۆمار دەكرێ، هەروەها لە پەڕاوی منداڵان تۆمار دەكرێ.

لە ئەنەسەوە كەوا پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**المولود حتى يبلغ الحنث؛ ما عمل من حسنة كتبت لوالده أو لوالديه؛ وما عمل من سيئة لم تكتب عليه ولا عليه ولا على والديه**: منداڵ هەتا دەگاتە تەمەنی باڵغ بون (١٥) ساڵی هەر كردەوەیەكی چاك بكات ئەوا بۆ باوكی، یان دایك و باوكی دەنوسرێ، هەر كردەوەیەكی خراپ بكات نە بۆ خۆی و نە بۆ دایك و باوكی دەنوسرێ.))[2]

لەئیبن عەباسەوە كەوا پێغەمبەری خوا ﷺ لە (ڕەوحاء) بە چەند سواریەك گەیشت، پێغەمبەر فەرموی: ((**مَنِ الْقَوْمُ؟ قَالُوا: الْمُسْلِمُونَ، فَقَالُوا: مَنْ أَنْتَ؟ قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ، فَرَفَعَتْ امْرَأَةٌ صَبِيًّا فَقَالَتْ: أَلِهَذَا حَجٌّ؟ قَالَ: نَعَمْ وَلَكِ أَجْرٌ**: ئێوە كێن؟ گوتیان: مسوڵمانین، گوتیان تۆ كێی؟ فەرموی: پێغەمبەری خوام، جا ئافرەتێك منداڵێكی بەرزكردوە و گوتی: ئەمە حەجی بۆ هەیە؟ پێغەمبەر فەرموی: بەڵێ بۆ تۆش پاداشتێكت هەیە.))[3]

ئا بەم شێوەیە گەر دایك و باوك هەر لە منداڵیەوە سوربون لەسەر یاریدەدانی منداڵ و ڕاهێنانیان لەسەر بەجێ هێنانی فەرزەكان، ئەوا پاداشت وەردەگرن لەسەر پەرستن (عیبادەت)ەكانی منداڵان، هەروەها منداڵان پاداشت وەردەگرن لەسەر بەجێ هێنانی فەرزەكان بەر لەوەی لەسەریان پێویست بێ،

---

[1] أخرجه الهندي في (كنز العمال) برقم (١٠٣٧٣) و عزاه إلى أبي الشيخ.
[2] مسند أبي يعلى برقم (٣٦٧٨).
[3] أخرجه مسلم برقم (١٣٣٦) و أبوداود برقم (١٧٣٦).

چونکـه دایـك و بـاوك خـاوەن فـەزڵ و چاکـەن لـە راهێنـانی بـەجێ هێنـانی طاعەتـەکان و پارێزگـاری کـردن لەسـەری و کەمتەرخـەمی نـەکردن لەبـەجێ هێنانیدا.

قسەیەکی جوان هەیە لە سوربونی پێشینە (السلف) لەسەر ڕاهێنانی منداڵان و گوێ ڕایەڵی خوای گەورە دەگێڕێتەوە، ئەویش ئەوەیە کە یونسی کـوڕی محمد المؤدب دەگێڕێتەوە، کە گوتویەتی: زوبەیری کوڕی حارس بانگ بێـژی مزگـەوت بو، بە منداڵانی دەگوت: وەرن نوێژ بکـەن، گوێزتـان دەدەمـێ، جـا منداڵـەکان نوێژیان دەکرد و پاشان دەوریان دەدا، جا گوتم چیـت دەکـرد؟ گوتـی: لەسـەرم ئەوە بو کە گوێزیان بەپێنج درهەم بۆ بکڕم هەتا لەسەر نوێژکردن ڕابێن[1].

[1] سیر أعلام النبلاء ٥/٢٩٧.

# ڕێك كردنی ڕەفتاری منداڵان بە ڕەوشت و ئادابی گشتی

ئیسلام تەنها كۆمەڵە بیروباوەڕ و پەرستن (عبادة) نیە، بەڵكە ئایینی ژیان و پەیوەندیە كۆمەڵایەتیەكانە، لەبەر ئەوە ئیسلام سوربوە لەسەر ئەوەی، كە منداڵ هەر لە تەمەنی بچوكیەوە ڕێبیر (مبادیء)ە بنەڕەتیەكان، دەربارەی ئادابە گشتی‌یەكان و ڕەفتارە بەرزەكانی پێ ڕابگەیەنرێ.

پێغەمبەر ﷺ سوربوە لەسەر قۆزتنەوەی دەرفەت و ئاگادارکردنەوەی منداڵان لەسەر ئەو ڕەفتارە چەوتانەی كە لێیانەوە دەردەچێ.

گومانی تێدا نیە گەر منداڵ لە بچوكیەوە فێری ئادابی ڕەفتارەكانی كۆمەڵایەتی و ڕەفتار جوانی لەگەڵ خەڵكانی تر نەكرێ، ئەوا زۆر كەس بەرەو ڕوی ڕەخنەی خەڵكانی تر دەبێتەوە و دەكەوێتە هەڵوێستی نالەبار و شەرمەزاریەوە.

لەبەر ئەوە لەسەر دایك و باوكان پێویستە هەر لە تەمەنی بچوكی منداڵەوە ئاگاداری ئەمە بن و فێری ئادابە گشتی‌یەكانی بكرێت بۆ ئامادەبون لە كۆڕ و مەجلیس و قسەكردن و گوێ گرتن و ئیزن وەرگرتن و ناوی خۆ ئاشكرا كردن و وتوێژكردن لە تەلەفۆن و وەڵام دانەوەی سەلام و ڕۆیشتن و خواردن و گاڵتەكردن و ڕێزگرتنی خەڵكان، فەرمو نمونەی ئەوەی كە باسمان لێوە كرد.

## ئادابی نان خواردن:

ئیمام غەزالی ﷺ دەڵێ:

(یەكەم سیفەت كە بەسەر منداڵ زاڵ بێ چاوچنۆكی خواردنە، كە پێویستە ڕێك بخرێ و چاك بكرێ وەك خوادرن تەنها بەدەستی ڕاست بخورێ و لە كاتی خواردنی بگوترێ: (بسم الله) و لەبەردەم خۆ بخورێ، بەر لە غەیری خۆی دەست بەخواردن نەكات و تەماشای نەكات و تەماشای ئەو كەسە نەكا، كە نان

دەخوات و پەلە نەکات لە نان خواردن و بەباشی بیجوی و نابێ پارو لە دوای پارو بخوات، دەست و جلەکەی بەخواردن هەڵنەسوێ، زۆر خۆریسی پێ خۆش نەبێت و حەز بە لە خۆگرتنەوە (إیثار)ی خواردن و قەناعەت بەخواردن بکات، جا هەر چ خواردنێك بێت)[1].

سەبارەت بە ڕەوشت و ئادابی خواردن، ئەوەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە ئەوەیە:

**١-دەست شوشتن بەر لە خواردن و دوای خواردن:**

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**بَرَكَةُ الطَّعَامِ الْوُضُوءُ قَبْلَهُ وَالْوُضُوءُ بَعْدَهُ**: بەرەکەت و بەپیتی خواردن لەوەدایە، کە پێش دەست کردن بە خواردن دەست بشورێ و دوای خواردنیش دەست بشورێتەوە.))[2].

**٢-پێش نان خواردن بگوترێ (بسم الله):**

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَذْكُر اسْمَ اللَّهِ تَعَالَى، فَإِنْ نَسِيَ أَنْ يَذْكُرَ اسْمَ اللَّهِ تَعَالَى فِي أَوَّلِهِ فَلْيَقُلْ بِسْمِ اللَّهِ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ**: گەر یەکێکتان خواردنی خوارد باناوی خوای گەورە بهێنێ (بڵێ: بسم الله) جا گەر لەیەکەم جار لەبیری چو ناوی خوا بهێنێ، با بڵێ: (بسم الله بەناوی خوا لەیەکەم و لە دوایی).))[3].

**٣-لەبەردەمی خۆ خواردن بخورێ:**

لە عومەری کوڕی ئەبو سەلەمەوە گێڕڕاوەتەوە کە گوتویەتی: ((**كُنْتُ غُلَامًا فِي حَجْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَكَانَتْ يَدِي تَطِيشُ فِي الصَّحْفَةِ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا غُلَامُ سَمِّ اللَّهَ وَكُلْ بِيَمِينِكَ وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ، فَمَا زَالَتْ تِلْكَ**

---

[1] إحياء علوم الدين ج٣/٧٢.

[2] أخرجه أبوداود (٣٧٦١) و الترمذي برقم (١٨٤٧).

[3] أخرجه أبوداود برقم (٣٧٦٧) و الترمذي برقم (١٨٥٩).

طِعْمَتِي بَعْدُ: منداڵ بوم لەلای پێغەمبەری خوا، لە کاتی خواردن دەستم بەم لاو ئەو لای قاپەکە دەگێڕا، جا پێغەمبەری خوا پیی فەرموم: ڕۆڵە ناوی خوا بهێنە بڵێ: بسم الله، بەدەستی ڕاست بخۆ و لەبەردەمی خۆت بخۆ. جا دەڵێ: لەو کاتەوە بەم شێوەیە نانم دەخوارد.))[1]

**٤-بەپاڵدانەوە نەخوات:**

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((لَا آكُلُ مُتَّكِئًا: من بەپاڵدانەوە نان ناخۆم.))[2]

**٥-دەست بەنان خواردن نەکات گەر یەکێك لەو گەورەتر ئامادە بو:**

لە حوزەیفەوە گێڕراوەتەوە کە گوتویەتی: ((كُنَّا إِذَا حَضَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ طَعَاماً، لَمْ نَضَعْ أَيْدِيَنَا حَتَّى يَبْدَأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَيَضَعَ يَدَهُ: گەر ئێمە لەگەڵ پێغەمبەربایین بۆ نان خواردن، ئەوا تا پێغەمبەری خوا دەستی بۆ نەبردایە ئێمە دەستمان بۆ نەدەبرد.))[3]

**٦-عەیب لەو خواردنە نەگرێ کە دێتە بەردەمی:**

لە ئەبو هورەیرەوە گێڕراوەتەوە کە گوتویەتی: ((مَا عَابَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ طَعَامًا قَطُّ، إِنِ اشْتَهَاهُ أَكَلَهُ وَإِنْ كَرِهَهُ تَرَكَهُ: پێغەمبەری خوا هەرگیز خەوش و عەیبی لە خواردن نەگرتوە، گەر ئارەزوی بکردایە دەیخوارد، گەر حەزی لێ نەبا نەیدەخوارد.))[4]

**٧-پاراستنی خواردن هەر چەندە کەمیش بێ:**

لە ئەنەسەوە گێڕراوەتەوە کە گوتویەتی: ((كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَكَلَ طَعَامًا لَعِقَ أَصَابِعَهُ الثَّلَاثَ وَقَالَ إِذَا سَقَطَتْ لُقْمَةُ أَحَدِكُمْ فَلْيَأْخُذْهَا فَلْيُمِطْ مَا

---

[1] أخرجه البخاري برقم (٥٣٦٧) و مسلم برقم (١٠٨).
[2] أخرجه البخاري برقم (٥٣٩٨) و أبوداود برقم (٣٧٦٩).
[3] أخرجه مسلم برقم (٢٠١٧).
[4] أخرجه مسلم برقم (١٨٨).

بِهَا مِنْ الْأَذَى وَلْيَأْكُلْهَا وَلَا يَدَعْهَا لِلشَّيْطَانِ: گـەر پێغەمبـەری خـوا خواردنـی بخواردایە هەرسێ پەنجـەی دەلێستـەوە، پێغەمبـەر فەرمویـەتی: "گـەر یـەکێك لەئێوە پارویەکی لە دەست بەربۆوە با هەڵی بگرێتەوە و پیسی‌یەکەی لیٚ لابـدات و بیخوات، با بۆ شەیتانی بەجیٚ نەهێڵیٚ.))[1]

٨-گەدەی پڕ لە خواردن نەکات:

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((مَا مَلَأَ آدَمِيٌّ وِعَاءً شَرًّا مِنْ بَطْنِـــهِ، بِحَسْـبِ لُقَيْمَاتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ، فَإِنْ كَانَ فاعلاً فَثُلُثٌ لِطَعَامِهِ وَثُلُـثٌ لِشَـرَابِهِ وَثُلُـثٌ لِنَفَسِهِ: ئادەمیزاد هیچ کیسەیەکی خراپتر لە گەدە و سکی پڕنەکردوە، جـا گـەر هەر دەبیٚ نان بخوات، ئەوا با چەند پارویەك بخوات، کە پشتی پـیٚ ڕابگـریٚ، بـا سکی بکاتە سیٚبەش: سیٚیەکی بـۆ خواردنـی بـیٚ، سـیٚیەکی بـۆ خواردنـەوە، سیٚیەکیشی بۆ هەناسەدانی.))[2]

٩-دەست لە خواردن هەڵنەگریٚ تا خەڵکانی تر دەست هەڵنەگرن:

بەتایبەتی گەر بزانیٚ بەشەرمیان دادەخا و وایان لیٚ دەکات بەر لەوەی تـێربن لەسەر خواردنەکە هەڵبستن.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((إِذَا وُضِعَتْ الْمَائِدَةُ فَلَا يَقُومُ رَجُلٌ حَتَّى تُرْفَـعَ الْمَائِدَةُ، وَلَا يَرْفَعُ يَدَهُ حَتَّى يَفْرُغَ الْقَوْمُ، وَلْيُعْذِرْ فَإِنَّ الرَّجُلَ يُخْجِلُ جَلِيسَـــهُ فَيَقْبِضُ يَدَهُ، وَعَسَى أَنْ يَكُونَ لَهُ فِي الطَّعَامِ حَاجَةٌ: خوانی نان خواردن دانرا، با هیچ پیاوێك هەڵنەستیٚ تا خوانەکە هەڵدەگیریٚ، دەسـتیش هەڵنـەگریٚ تـا ئـەو کەسانەی نان دەخۆن دەست هەڵدەگرن و با خۆی دوا بخات، چونکە بەمە ئـەوەی دانیشـتوە بەشـەرم دادەکـەویٚ و دەسـتی دەکێشـێتەوە، کـە هێشـتا تـێری

---

[1] أخرجه مسلم برقم (١٣٥).

[2] أخرجه إبن ماجة برقم (٣٢٧٩).

نەخواردوە.))[1].

پێغەمبەری خوا ﷺ گەر لە گەڵ چەند کەسێك خواردنی بخواردایە، ئەوا یەکەم کەس بو کە دەستی بۆ خواردن دەبرد، کۆتا کەسیش بو دەستی هەڵدەگرت، بۆ ئەوەی ئەو کەسانە بەتێری نان بخۆن.

**١٠-گەر سیر و پیازی خوارد خۆی دور بخات لە کۆڕ و مەجلیسی گشتی:**

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**مَنْ أَكَلَ ثُومًا أَوْ بَصَلًا فَلْيَعْتَزِلْنَا، أَوْ لِيَعْتَزِلْ مَسْجِدَنَا وَلْيَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ**: هەر کەسێك سیر یان پیازی خوارد، با خۆی لێمان دورە پەرێز بکات، یان خۆی لە مزگەوتمان دورە پەرێز بکات، با لەماڵەکەی خۆی دابنیشێت.))[2]

## ئادابی ئاو خواردنەوە:

**١-بەیەك جار ئاو نەخواتەوە:**

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**لَا تَشْرَبُوا وَاحِدًا كَشُرْبِ الْبَعِيرِ وَلَكِنْ اشْرَبُوا مَثْنَى وَثُلَاثَ وَسَمُّوا إِذَا أَنْتُمْ شَرِبْتُمْ وَاحْمَدُوا إِذَا أَنْتُمْ رَفَعْتُمْ**: وەکو حوشتر بەیەکجاری ئاو مەخۆنەوە، بەڵام بەدو جار یان سێ جار ئاو بخۆنەوە، جا گەر ئاوتان خواردەوە بڵێن: (بسم الله)، گەر تەواویش بون بڵێن (الحمد لله).))[3].

**٢-ئاو خواردنەوەکە بە مژین بێ:**

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**مُصوا الماءَ مصاً، فإنه أهنأ و أمرأ وأبرأ**: ئاو بە مژینەوە بخۆنەوە، نۆشی گیانە و بۆ تەندروستی باشترە.))[4]

---

[1] أخرجه إبن ماجة برقم (٣٢٩٥).
[2] أخرجه البيهقي في (السنن) ج٣/٧٦.
[3] أخرجه الترمذي برقم (١٨٨٥).
[4] أخرجه البيهقي في "الشعب" برقم (٦٠٠٩).

٣-فو له جام (پەرداخ)ەكه نەكات:

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((إِذَا شَرِبَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَتَنَفَّسْ فِي الْإِنَـاءِ: گـەر یەكێكتان ئاوی خواردەوە با لەناو جامەكه هەناسه نەدات.))[1]

## ئادابی مۆڵەت وەرگرتن بۆ چونه لای كەسێك:

١-نەچێته لای كەسێك مەگەر دوای ئیزن وەرگرتن:

له ئەنەسەوه گێڕراوەتەوه كه گوتویەتی: خزمەتكاری پێغەمبەر بـوم و بـەبێ ئیزن دەچومه ژورەوە، جا ڕۆژێك چومه خزمەتی و فەرموی: ((كما أنت، فإنـه قد حدث بعدك أمر، لا تدخل الا بإذن: دوای تۆ شتێك ڕویـداوە، بـەبێ ئـیزن نەیەیته ژورەوە.))[2]

٢-سێجار ئیزن وەربگرێ، گەر ئیزنی پێنەدرا بگەڕێتەوە:

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((إِذَا اسْتَأْذَنَ أَحَدُكُمْ ثَلَاثًا فَلَـمْ يُـؤْذَنْ لَـهُ فَلْيَرْجِعْ: گـەر یـەكێكتان سـێجار داوای ئـیزنی كـرد و ئـیزنی پـێ نـەدرا، بـا بگەڕێتەوە.))[3].

٣-یەكەمجار سەلام بكات، ئینجا ئیزن وەربگرێ:

((جَاءَ رَجُلٌ يَسْتَأْذن عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ فِي بَيْتٍ فَقَالَ أَأَلِجُ؟ فَقَالَ النَّبِـيُّ ﷺ لِخَادِمِهِ: اخْرُجْ إِلَى هَذَا فَعَلِّمْهُ الِاسْتِئْذَانَ، فَقُلْ لَهُ: قُلْ السَّـلَامُ عَلَيْكُـمْ، أَأَدْخُلُ؟: پێغەمبەر ﷺ له ماڵێك بو، پیاوێك هات تـا بێتـه خزمـەتی، گوتـی بێمه ژورەوە؟ پێغەمبەر ﷺ به خزمەتكارەكەی فەرمو: بـڕۆ لای ئـەو كەسـه و

[1] أخرجه البخاري برقم (٥٦٣٠) و مسلم برقم (٢٦٧).
[2] أخرجه البخاري في (الادب المفرد) برقم (٨٠٧).
[3] أخرجه البخاري برقم (٦٢٤٥) و مسلم برقم (٢١٥٣).

فێریئیزن وەرگرتنی بکە، پێی بڵێ با بڵێ: سەلامتان لیبێ، بێمە ژورەوە؟))[1].

**٤-ناوی خۆی ئاشکرا بکات:**

لە جابرەوە گێڕراوەتەوە کە گوتویەتی: ((**أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَدَقَقْتُ الْبَابَ، فَقَالَ: مَنْ ذَا؟ فَقُلْتُ: أَنَا. فَقَالَ: أَنَا أَنَا، كَأَنَّهُ كَرِهَهَا**: چومە خزمەت پێغەمبەرﷺ جا لە دەرگام دا، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: کێیە؟ گوتم: منم، فەرموی منم.. منم؟ دیاربو پیی ناخۆش بو.))[2].

لە ئەبو موساوە ﷺ گێڕراوەتەوە کە گوتویەتی: ((**لما جلس النبي ﷺ على بئر البستان، و جاء أبوبكر، فأستأذن، فقال أبو موسى: من؟ قال: أبوبكر، ثم جاء عمر فاستأذن، فقال: من؟ قال: عمر، ثم عثمان كذلك**: کاتێ پێغەمبەرﷺ لەسەر بیری بستان دانیشتبو، ئەبوبەکر هات داوای ئیزنی کرد، ئەبو موسا گوتی: کێیە؟ ئەبوبەکر گوتی: ئەبوبەکر،پاشان عومەر داوای ئیزنی کرد، جا گوتی کێیە؟ عومەر گوتی: عومەر پاشان عوسمان بەهەمان شێوە.))[3]

**٥-لەکاتی ئیزن وەرگرتندا لە لایەکی دەرگاوە بوەستێ:**

پێغەمبەری خوا ﷺ گەر بهاتبا بەردەم دەرگای کەسێك، بەرەو روی دەرگا نەدەوەستا، بەڵکە لە لای راستیەوە، یان لە لای چەپیەوە دەوەستا و دەیفەرمو: (السلام عليكم، السلام عليكم)[4].

---

[1] أخرجه أبوداود برقم (٥١٧٧).
[2] أخرجه البخاري برقم (٦٢٥٠) و مسلم برقم (٢١٥٥).
[3] أخرجه البخاري برقم (٣٦٧٤) و مسلم برقم (٢٤٠٣).
[4] أخرجه أبوداود برقم (٥١٨٦).

## ئـادابــی سەلام کردن:

١-سەلام کردن لەکاتی هاتنە ژوورەوە و چونە دەرەوە:

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((لا تَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا، وَلا تُؤْمِنُــوا حَتَّى تَحَابُّوا، ألا أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيْءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ؟ أَفْشُوا السَّلَامَ بَيْنَكُمْ: ناچنە بەهەشت تا بڕوا نەهێنن، ئیمانیشـتان تـەواو نـابێت تایـەکتریتان خـۆش نەوێت، ئایە شتێکتان پێ بڵێم گەر ئەنجامی بدەن یەکتریتان خۆش بوێـت، سـلاو لە یەکتری بکەن.)) [1].

هەروەها دەفەرموێ: ((إذا قعد أحدكُم فليُسلم، وإذا قام فليسلم، فليسـت الاولى أحقّ من الاخرة: گەر یەکێکتان دانیشت با سەلام بکات، گەر هەستا بـا سەلام بکات، چونکە سەلامی یەکەم لەسەلامی دوایی شایستە تر نیە.)) [2]

٢-وەڵامی سەلامی ئەو کەسە بەجوانتر بداتەوە، کە سەلامی لێ دەکات:

خـوای گـەورە فەرمویـەتی: ﴿وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآۗ: گەر سەلامتان لێ کرا بەجوانتر لەو کەسە وەڵام بدەوە، یان هەر وەڵامی وەك خۆی بدەوە.﴾النساء: ٨٦.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((خَمْسٌ تَجِبُ لِلْمُسْلِمِ عَلَى أَخِيهِ الْمُسْـلِمِ؛ رَدُّ السَّلَامِ، وَتَشْمِيتُ الْعَاطِسِ، وَإِجَابَةُ الدَّعْوَةِ، وَعِيَــادَةُ الْمَرِيــضِ، وَاتِّبَــاعُ الْجَنَازَةِ: پێنج شت پێویســتە لەسـەر مسـوڵمان بەرامبـەر بـەبرای مسـوڵمانی جێبەجێی بکات: وەڵام دانەوەی سڵاو، ئەگەر پژمی و گوتـی: الحمـد لله، پـێی بگوترێ: يرحمك الله، گەر دەعوەتی کرد لە بەدەمیەوە بچێت، سەردانی نەخۆش،

---

[1] أخرجه مسلم برقم (٥٤) و أبوداود برقم (٥١٩٣).

[2] أخرجه الطحاوي.

بەرِێ کردنی بۆ سەر قەبران.))[1] .

**٣-سەلام کردن بە ڕویەکی خەندەوە:**

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**لا تحقِرَنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ شَيْئًا وَلَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ**: هیچ چاکەیەك بەکەم مەگرن، با ئەو چاکەیە ڕوخۆشی نواندن بێت بەرامبەر بە برایەکەت.))[2] .

**٤-سەلام کردنەکە تەوقەی لەگەڵ بێ:**

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَلْتَقِيَانِ فَيَتَصَافَحَانِ إِلَّا غُفِرَ لَهُمَا قَبْلَ أَنْ يَفْتَرِقَا**: کاتێ دوو مسوڵمان پێك دەگەن و تەوقە لەگەڵ یەکتری دەکەن، ئەوا بەر لەوەی لێك جیا ببنەوە؛ خوا لەگوناهەکانیان خۆش دەبێ.))[3]

**٥-بچوك سەلام لە گەورە بکات، کەمیش لە زۆر:**

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**يُسَلِّمُ الصَّغِيرُ عَلَى الْكَبِيرِ وَالْمَارُّ عَلَى الْقَاعِدِ وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ**: بچوك سەلام لە گەورە بکات و پیادە لە دانیشتو بکات و کەم لە زۆر بکات.))[4]

**٦-سواریی سەلام لە پیادە بکات و پیادەش لە دانیشتو، کەمیش لە زۆر:**

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي وَالْمَاشِي عَلَى الْقَاعِدِ وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ**))[5]

هەروا پێویستە منداڵان ئاگادار بکرێنەوە کە هەندێك حاڵەت هەیە سەلام کردنی تێدا باش نیە وەك: سەلام کردن لەو کەسەی دەست نوێژ دەشوات، لە

---

[1] أخرجه البخاري برقم (١٢٤٠) و مسلم برقم (٢١٦٢).

[2] أخرجه مسلم برقم (٧٢٠) و أبوداود برقم (١٢٨٥).

[3] أخرجه أبوداود برقم (٥٢١١) و الترمذي برقم (٢٧٢٨).

[4] أخرجه البخاري برقم (٦٢٣١).

[5] أخرجه البخاري برقم (٦٢٣٢) و مسلم برقم (٢١٦٠).

گەرماودا و لە قورئان خوێن و لەو کەسەی یادی خوا دەکات و لەو کاتەی گوێ لە وتاری هەینی دەگیرێ، یان لە کۆڕی زانست، یان لەکاتی بانگ، یان قامەت خوێندندا.

## ئادابی پژمین:

**١-دەنگی نزم بکات و، دەمی داپۆشێ:**

"پێغەمبەری خوا ﷺ گەر بپژمیایە دەستی بەدەم و چاوی دادەدا، یان کراسەکەی بە دەم و چاوی دادەدا و دەنگی خۆی پێ نزم دەکرد"[1].

**٢-دوای پژمین سوپاسی خوا بکات:**

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**إِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلْ الْحَمْدُ لِلَّهِ**: گەر یەکێك لەئێوە پژمی بابڵێ: سوپاس بۆ خوا.))[2].

٣-ئەوەی دەپژمێ پێی بوترێ (**يَرْحَمُكَ اللَّهُ**) و ئەویش بڵێ (**يَهْدِيكُمُ اللَّهُ وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ**: خوا ڕێنمویتان بکات و کار و بارتان چاك بکات).

## ڕێزگرتنی خەڵکانی تر:

مرۆڤی ڕێزدار ئەو کەسەیە، کە لەمیانەی ریزگرتنیەوە بۆ ئەو کەسانەی هەڵس و کەوتیان لەگەڵدا دەکات، بۆیان دەردەبڕێ بەجیاوازی تەمەن و چینەکانیان.

زۆر فەرمودە هاتوە دەربارەی فێرکردنی ڕێزگرتنی خەڵکانی تر، وەك:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((**لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يُجِلَّ كَبِيرَنَا وَيَرْحَمْ صَغِيرَنَا ويعرف لعالمنا حقه**: ئەو کەسە لەئێمە نیە، کە ڕیزی گەورەمان نەگرێ و بەزەیی

[1] اخرجه أبوداود (٥٠٢٩) و الترمذي برقم (٢٧٤٦).
[2] اخرجه البخاري برقم (٦٢٢٤) و أبوداود برقم (٥٠٢٣).

به بچوکەکانماندا نەیەتەوە و مافی زاناکانمان نەزانێ.))[1]

هەروەها ﷺ فەرمویەتی: ((إِنَّ مِنْ إِجْلَالِ اللَّهِ إِكْرَامَ ذِي الشَّيْبَةِ الْمُسْلِمِ: لە بەشکۆدانانی خوا ئەوەیە کە ڕێزی مسوڵمانی بەتەمەن بگیرێ.))[2].

کاتێ ئیمام عەلی حەسەنی کوڕی پەروەردە دەکات دەڵێ: (کوڕەکەم پیاوێك بەسوك دامەنێ کە هەردەم دەیبینی، جا گەر لە تۆ گەورەتر بو بە باوکی خۆتی دابنێ، گەر وەك خۆت بو بە برای خۆتی دابنێ، گەر لە تۆ بچوکتر بو بە کوڕی خۆتی دابنێ)[3].

سەبارەت بە ریزگرتنی باوك بەتایبەتی هاتووە، کە پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بینی کورێژگەیەکی لەگەڵ بوو، پێغەمبەر ﷺ بەکوڕێژگەکەی فەرمو: "ئەمە کێیە؟" گوتی: باوکمە. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "لە پێشیەوە مەڕۆ، مەبە هۆی جنێو پێدانی، لە پێش ئەو دامەنیشە، بەناوی خۆی بانگی مەکە"[4].

## ئادابی گفتوگۆ:

### ١-قسە نەکردن لە کۆڕێك کە یەکێك لەو گەورەتری لێبێ:

لە سەمرەی کوڕی جوندبەوە گێڕراوەتەوە کە گوتویەتی: ((لَقَدْ كُنْتُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ غُلَامًا فَكُنْتُ أَحْفَظُ عَنْهُ، فَمَا يَمْنَعُنِي مِنْ الْقَوْلِ إِلَّا أَنَّ هَا هُنَا رِجَالًا هُمْ أَسَنُّ مِنِّي: لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ منداڵ بوم و فەرمودەم لەو لەبەر دەکرد، هیچ کاتێ قسەی لێ قەدەغە نەدەکردم مەگەر پیاوانێکی لێبایە، کە لەمن بەتەمەنتر بان))[5].

---

[1] أخرجه أحمد، ج٢/١٨٥-٢٠٧. والحاكم في "المستدرك" ج١/١٢٢.
[2] أخرجه أبوداود، برقم (٤٨٤٣).
[3] حليم أل البيت، ص١٩٢.
[4] أخرجه البخاري في "الادب المفرد" برقم (٤٤).
[5] أخرجه مسلم برقم (١٦٤).

### ٢-بەباشی گوێ بگرێ وەك چۆن كە بەباشی قسە دەكات:

حەسەنی بەصری منداڵەكەی پەروەردە دەكرد و دەیگــوت: (كوڕەكـەم فـێری باش گوێ بیستن بە، وەك چۆن فــێری بـاش قسـەكردن دەبیـت، قسـە بـە هیـچ كەسێك مەبڕە با قسەكەش درێژە بخایەنێت، تا ئەو كاتەی لە قسەكە دەبێتەوە).

### ٣-لە قسەی ناشیرین دور بكەوێتەوە:

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((لَيْسَ الْمُؤْمِنُ بِالطَّعَّانِ وَلَا اللَّعَّانِ وَلَا الْفَـاحِشِ وَلَا الْبَذِيءِ: مرۆڤی بڕوادار تانــە و تەشــەر لەكـەس نـادات، نـەفرەت لەكـەس ناكات، زمان پیسی و جنێو فرۆش نیە.))[1]

ئیمام غەزالی دەفەرموێ: (ڕێگری لە منداڵ بكرێ لە قسەی هەڵیت و پەڵیت و لە نەفرەت و جنێودان، هەروا ڕێگری بكرێت لە هاوڕێیەتی ئەوانەی یەك لــەو شتانەی بەزماندا دێت، چونكــە ئـەم ڕەفتـارە ناشـیرینە لـە هـاوڕێی خراپـەوە دەردەچێ)[2].

لەو ئادابە گشتی‌یانەی كەوا باشە دایك و باوك فێری منداڵان بكەن ئەوەیــە، كە ئیمام غەزالی باسی دەكات: (ڕێگری لە منداڵ بكرێ لەوەی كە بــەخواردن و جل و بەرگیەوە، یان بە كەل و پەلــەكانی شـانازی بەسـەر هاوڕێكـانی بكـات، بەڵكە لەسەر خۆ بەكەم زانی (تواضع) رابهێنرێ و ریزی هەمو ئەوانە بگرێ، كە هەڵس و كەوتیان لەگەڵدا دەكات و قسە خۆش بێ لەگەڵیان، ڕێگری لـە منـداڵ بكرێت لەوەی شت لە منداڵان وەربگرێت، با منــداڵ فـێری ئـەوە بكرێـت، كـە بەرزی و شكۆیی لە بەخشینە، نەك لە وەرگرتن، وەرگرتن لۆمە كردنی بەدواوەیە و سوكایەتیە، جا گەر منداڵی هەژاران بو با فێری ئەوە بكرێ، كە چـاوچنۆكی و شت وەرگرتن سوكایەتی و زەبونی‌یە.

---

[1] أخرجه الترمذي برقم (١٩٧٨) و الحاكم في (المستدرك) ج١/١٢-١٣.

[2] إحياء علوم الدين، ج٣/٧٣.

پێویسته منداڵ رابهێنرێ، که له کۆڕ و مەجلیسیدا تف و بەڵغەم ڕۆ نەکات و چڵمی نەسڕێ، لەبەردەم کەسانی تر باوێشکی نەیەتەوە و پشت لە کەس نەکات و قاچ لەسەر قاچ دانەنێ و دەستی نەخاتە ژێر چەناگەی، سەری نەخاتە سەر دەستەکانی، چونکە ئەمە مانای تەمبەڵی‌یە. هەروا منداڵ فێری چۆنیەتی دانیشتن بکرێ و نەهێڵرێ زۆر قسە بکات و بۆی ڕون بکرێتەوە زۆر قسەکردن نیشانەی چەقاوە سوی و بێ حەیاییە)[1].

لە کۆتاییدا ئادابە گشتی‌یەکان و ڕەوشتە جوانەکان زۆرن و سەرچاوەی تایبەتی هەیە، کە دەکرێ بۆ پەروەردەکردنی منداڵان سودی لێ وەربگیرێ وەك هەردو زنجیرەی (الاداب الاسلامية) و (الاخلاق الاسلامية)ی مامۆستا محمد خیر فاطمة، کە لە دیمەشق لە دار الخير دەردەچێت.

هەندێ نمونەمان باس کرد، تاوەکو بەدیاری خەین، کە ئیسلام گرنگی داوە بە ڕەوشتە گشتی‌یەکان بۆ منداڵان.

---

[1] إحياء علوم الدين، ج٣/٧٢-٧٣ بەدەستکاری‌یەوە.

## بنیات نانی کەسایەتی سەربەخۆ و سەنگین

گرنگترین ئامانجەکانی پەروەردە لە ئیسلام بریتی‌یە لە پێگەیاندنی منداڵان بۆ ئەوەی سەبەینێ ببنە پیاوی ئوممەت، ئەمەش لەرێگەی پچڕانی پلەپلەیی پەیوەندی منداڵ بەخێزانەکەی و پشت پێ بەستنی بۆ بنیات نانی کەسایەتی بەهێز و سەربەخۆ کە بکرێ پشتی پێ ببەسترێ.

یەکێ لە زانایانی پەروەردە دەڵێ: (پشت لەسەر منداڵ ببەستن و وایان پیشان بدەن، ئەوان گەورە دەبن، ئێوە لە زۆر ئەرك و کاردا پشتیان پێ دەبەستن..)[1].

جا ئیسلام لەپێناو بەدیهێنانی ئەم مەبەستە چەندەها رێی گرتۆتە بەر وەك:

**١-سەلام کردنی پێغەمبەر ﷺ لە منداڵان:**

کە گەورەکان بەبەردەمی منداڵان تێپەڕ دەبن و سەلامیان لێ دەکەن، ئەمە متمانە دانێکە بۆ دەرونیان و هەست کردنە بە بایەخ دانیان و سەربەخۆیی کەسایەتیان.

..لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ مکوڕبو لەسەر ئەوەی هەر کاتێك بەلای منداڵان تێپەڕیبا سەلامی لێدەکردن.

لە ئەنەسەوە گێڕراوەتەوە، کە خۆی بەلای منداڵان دا تێپەڕ بوە و سەلامی لێ کردون و گوتویەتی: ((کان رسول الله ﷺ یفعله: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا سەلامی لە منداڵان دەکرد.))[2].

لە فەرمودەیەکی تردا، ((**کان رسول الله ﷺ یزور الانصار، فیسلم علی صبیانهم و یمسح علی رؤسهم ویدعو لهم**: پێغەمبەر خوا ﷺ سەردانی ئەنسارەکانی دەکرد و سەلامی لە منداڵەکانیان دەکرد و دەستی بەسەردا

---

[1] العلاقة بين الاباء و الابناء، ص١٠.
[2] أخرجه البخاري برقم (٦٢٤٧) و مسلم برقم (٢١٦٨).

دەهێنان و دوعای بۆ دەکردن.))[1].

**٢-پەیمان وەرگرتنی پێغەمبەر ﷺ لە منداڵان:**

پەیمان وەرگرتنی پێغەمبەر شەرەفێکە، هیچ شەرەفێکی تری ناگاتێ، سەرەڕای ئەمەش دوپات کردنەوەیە لەسەر توانای پەیماندەر بۆ هەڵگرتنی بەرپرسێتی و وەفاکردنی ئەو پەیمانەی کە داویەتی، هەر چەند منداڵی بچوک لەسەری نی‌یە پەیمان بدات، بەڵام وێرای ئەمەش پێغەمبەر ﷺ پەیمانی لە حەسەن و حوسەین و عبداللەی کوڕی عەباس و عبداللەی کوڕی زوبێر وەرگرتوە کە منداڵیش بون، ئەمەش بەمەبەستی هاندانیان و زیاتر گەرم و گوڕ کردنیان.

گێڕدراوەتەوە کە عبداللەی کوڕی زوبێر تەمەنی حەوت یان هەشتساڵان بو بۆ پەیمان دان هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ، کە زوبێر ﷺ فەرمانی پەیمان دانی پێ‌کردبو، جا پێغەمبەری خوا خەندەی هات و پەیمانی لێ وەرگرت.[2]

**٣-ئامادەبونی منداڵ لە کۆڕی گەوراندا:**

ئامادەبونی منداڵان لەگەڵ گەوران لە شەوانەیان و کۆڕی قسەکردنیان، فراوان کردنی مێشکیان و گەشە پێدانی تواناکانیان و ورە بەرزیانی تێدایە، لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانی مکوڕ بون لەسەر ئامادەبونی منداڵانی هاوەڵان لە هەندێ کۆڕی گەوراندا.

لە ئیبن عومەرەوە گێڕراوەتەوە کە گوتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (نمونەی ئەو دارەم پێ بڵێن کە وەك مسوڵمان وایە هەمو کاتێ بە ئیزنی خوا بەر دەدات و گەڵاکەی ناوەرێ؟ منیش بەدڵم داهات کە دار خورمابێ، حەزم نەکرد قسە بکەم، وام دانابو کە ئەبوبەکر و عمر دەیڵێن کە ئەوان قسەیان نەکرد؛ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "ئەوە دار خورمایە"، کاتێك لەگەڵ باوکم دەرچوم

[1] أخرجه النسائي برقم (٨٣٤٩).
[2] أخرجه الهيثمي في (مجمع الزوائد) ج٩/٢٨٥.

گوتم: بابە گیان بەدڵم دا هات کە ئەو دارە دار خورمایە، گوتی: ئەدی بۆچی قسەت نەکرد، گەر قسەت بکردبایە، لە لای من لەمەو لەمەم پێ خۆشتر بو[1].

لە نمونەی مکوڕبونی هاوەڵانی پێغەمبەر لەسەر هەست کردن بە بەرپرسیتی و متمانە بەخۆ بون لەلای منداڵان ئەوەیە، کە گێڕراوەتەوە ئیمام عومەر ﷺ ڕێی بە ئیبن عەباس دەدا بە ئامادەبون لە ئەنجومەنی ڕاوێژ لەگەڵ گەورە هاوڕێیانی عومەر و وەزیرەکانی (ﷺ) جا ڕاوێژی بەو دەکرد[2].

هەر لەم بارەیەوە ئیمام عومەر ﷺ هانی باوك و دایکی کچی بچوکی دەدا کە لەبەردەم خزم و ناسیاری بەدیاری بخەن، تا کەسایەتی گەشە بکات و خوازبێنی بکرێ، جا دەیفەرمو: (ئەو کچەی نەگەیشتۆتە پلەی پێگەیشتن (حەیز) بەدیاری بخەن، بەڵکە کوڕە مامەکانی ئارەزوی خوازبێنیان دەبێ)[3].

### ٤-سەردانی منداڵ لەکاتی نەخۆشیدا:

لەو کارانەی کە جێی بایەخ پێدانن، کە پێغەمبەر ﷺ چاودێری کردوە لە بەدیارخستنی کەسایەتی منداڵ، بریتییە لە سەردانی کردنی منداڵان لەکاتی نەخۆشیدا.

لە ئەنەسەوە گێڕراوەتەوە ﷺ کە گوتویەتی: منداڵێکی جولەکە خزمەتی پێغەمبەری دەکرد ﷺ، منداڵەکە نەخۆش کەوت، پێغەمبەریش سەردانی کرد و لەلای سەریەوە دانیشت و پێی فەرمو: "مسوڵمان بە" ئەویش تەماشای باوکی کرد، باوکەکەیش گوتی: بەگوێی باوکی قاسم بکە، جا مسوڵمان بو، پێغەمبەرﷺ دەرچو و فەرموی: "سوپاس بۆ خوا کە لە ئاگر ڕزگاری کرد"[4].

---

[1] أخرجه البخاري برقم (٦١) و مسلم برقم (٢٨١١).
[2] أخرجه الحاكم في المستدرك ج٣/٥٤٠.
[3] أخرجه عبدالرزاق في (المصنف) ج٦/١٥٦.
[4] أخرجه البخاري برقم (١٣٥٦) وأبوداود برقم (٣٠٩٥).

**٥-ڕاهێنانی منداڵ لەسەر کارکردن و سامان پەیداکردن:**

لەو هەڵە زۆر خراپانەی، کە دایك و باوك ئەنجامی دەدەن لە مامەڵە کردن لەگەڵ منداڵەکانیان، لە پارە زۆر بەخشینە بە منداڵ لە کاتی پێوستی و پێویست نەبونیدا، یان لە کاتی بۆنەیەکدا کەپێویست بەمە دەکات و لەکاتی نەبونی بۆنەیەکیش دا، گومانی تێدا نیە کە ئەم جۆرە رەفتارە کاریگەریی گەورەی هەیە لە چاندنی گیانی پشت بەستنی ڕەها بە باوك بۆ جێبەجێ کردنی پێویستیە مادیەکان، هەروا کاریگەری هەیە بۆ هەست کردن بەوەی پارە زۆر لەوە ئاسانترە، کە مرۆڤ رەنجی بۆ بدات و کاربکات بۆ پەیداکردنی.

لەبەر ئەوە ئیسلام هانی منداڵانی داوە، کە هەر لە بچوکیەوە هەڵسن بە هەندێ ئەزمونی بازرگانی کردەیی بۆ بەدەست هێنانی دارایی و هەست کردن بە نرخی کارکردن و زەحمەتی بەدەست هێنانی دارایی و پارە، هەروا هانی داوە بۆ هەست کردن بەتوانابون بە سەربەخۆیی مادی و بەشداریکردن با بچوکیش بێ لە هەڵگرتنی بەشێك لە بەرپرسێتی دارایی خێزان.

جا سەبارەت بەم مەسەلەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە کە بەلای عبداللەی کوڕی جەعفەر دا تێپەڕی، بینی کڕین و فرۆشتن دەکات جا فەرموی: "خوایە بەرەکەت بهاویە فرۆشتنەکەی، یان عەقدی فرۆشتنەکەی".[1]

شتێکی سود بەخشە لێرەدا وریایی ئەوە بین، کە باشتر وایە بڕە پارەیەکی دیاریکراو و نەگۆڕ لە لایەن دایك و باوکی منداڵەوە بۆ منداڵ تەرخان نەکرێ وەك خەرجی ڕۆژانەیان، چونکە ئەم جۆرە کارە منداڵەکە هان دەدات لەسەر دەست بڵاوی زێدەڕۆیی و خەرج کردنی لە کڕینی چەند پێداویستیەك، کە رەنگە زیانی پێ بگەیەنێ و سودی بۆی نەبێ، بەڵکە دەبێ دایك و باوك بۆ خۆیان تەنها پێداویستیە پێویستیەکانی منداڵان دابین بکەن، سەرەڕای بەخشینی پاداشتێکی دارایی لەکاتی هەڵسانیان بە هەندێ کاری چاك.

[1] أخرجه الهيثمي في "مجمع الزوائد" ج٩/٢٨٦.

هەروەها شتێکی سود بەخشە، کــە هــانی منـدالآن بدرێـت لەســەر دەسـت گرتنەوە و پاشە کەوت کردن و کۆکردنەوەی دیاری و پاداشتەکان، دەست بــڵاوی تێدا نەکات، بەڵکە کۆبکرێتەوە و شتی بەسود و خۆشی پــێ بکـڕدرێ، کـە لـە ژیانی داهاتویاندا سودیان پێ ببەخشێ.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی: ((الاقتصاد نصف المعیشـــة: ئـابوری نیـوەی ژیان و گوزەرانە.))[1].

جا لەبەر ئەوەی تۆوی ڕەزیلی لەلای منداڵ لە تەمــەنی خۆناسـینەوە بـەدیار دەکەوێ، باشتر وایە هانیـــان بدرێـت لەســەر خـێر و چاکـەکردن بـە هـەژاران و یارمەتی دانی نەداران و هاوکاری کردنیان.

٦-هەروەها لە دیاردەکانی بنیـــات نـانی کەسـایەتی پێگەیشـتوی بـەهێزی منـدالآن بریتی‌یە لە ڕاهێنانیـــان لەســەر ڕەقـی و زبـری (خشـونة) و خۆنـەگرتن بەجۆرێك لە خواردن و خواردنەوە، هەروا ڕاهێنانیان لەسەر پیـاوەتی نوانـدن لـە قسە و جل و بەرگیان و قژیان و کاروباری تریاندا.

ئیمام غەزالی دەربـــارەی پـەروەردەی منـدالّ دەڵـێ: (منـدالّ لەســەر خـۆش گوزەرانـی ڕانـەهێنرێ و جوانــی و ڕازاوەیــی و ڕەفاهیـەتی لـەلا خۆشەویســـت نەکرێت)[2].

٧-لەوێنەی پشتگیری کردنی کەسایەتی منداڵ، کردنیان بە پێشـــەوا (إمـام) لە نوێژدا لە تەمەنی باڵغیدا، گەر منداڵ شارەزای یاساکانی نوێژ بـوو، بـەچاکی و بەڕاستی بەجیّی دەهێنا.

شەرع ناسان بەرەهایی هاو دەنگن لەسەر ئەوەی، دروستە منــداڵ لـە نوێـژی سوننەتدا پێش نوێژی بۆ باڵغ بوان بکات.

حەسەنی بەصری و شافعی و ئیسحاق گوتویانە دروستە منداڵ پێشنوێژی بـۆ

---

[1] أخرجه البيهقي في "الشعب".
[2] إحياء علوم الدين ج٣/٧٣.

گەوران بکات لە نوێژی فەرزدا.[1]

لە عومەری کوڕی سەلەمەوە گێڕراوەتەوە، کە بەوەفد چونە خزمەتی پێغەمبەرﷺ جا کاتێك ویستیان بڕۆن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا کێ پێش نوێژیمان بۆ بکات؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "کامەتان قورئانی زۆرتر لەبەر کردوە" جا منیان بەپێش دا، کە ئەو کاتە من منداڵ بوم و پۆشاکێکی فراوانم لەبەر بو، جا لەهەر کۆمەڵە خەڵکێك ئامادە بوبام، من پێش نوێژیم بۆ دەکردن و نوێژم لەسەر مردوەکان دەکرد، تا ئەم ڕۆژەی ئێستا[2].

جا ڕابمێنە و بزانە پێش نوێژی کردنی بۆ گەوران چ پاڵنەرێکی مەعنەوی و متمانە بەخۆبونێك پێشکەش بە منداڵی بچوك دەکات، کە منداڵ ئامادە و ساز دەکات بۆ کاری سەرکردەیی لە بانگەوازیکردن بۆ خەیر و چاکەدا.

لە نمونەی پەیڕەوکردنی پیاوچاکان بەپێغەمبەر ﷺ لە پێش نوێژی منداڵ دا ئەوەیە، کە مامۆستا دکتۆر عبدالله الخالدي بۆی باس کردوم باپیرەکەی (شێخ محمد شەریف یەعقوبی) پێشەوای مالکیەکان لە مزگەوتی بەنی ئومەییە لە دیمەشق، کە تەمەنی شەش ساڵی بوە کردویەتیە پێش نوێژی ئامادەبوانی مزگەوت، ئەمەش بۆ ڕێزگرتنی و هاندانی بوە، بەرهەمەکەشی بریتی بووە لە متمانە بەخۆبون جابوە مامۆستا لە زانکۆی عەرەبی و زانکۆی لوبنانی لە بێروت، هەروا بوە پێش نوێژ و وتاربێژی مزگەوتی عومەری کوڕی عبدالعزیز لە بێروت دا.

لەو کارە ترسناکانەی کە شایستەی وریاکردنەوەبێ ئەوەیە، کە زۆر لە دایك و باوکان گیانی ترس لەسەربازان یان دێوەزمە یان سوڵکەر یان شتی تر لە دەرونی منداڵەکانیان دروست دەکەن، وا دەزانن بەمە دەتوانن بەسەر منداڵان زاڵ و بن و ملکەچی فەرمانەکانیان دەکەن. بێئاگا لەوەی کە بەم ڕەفتارە

[1] المغني و الشرح الكبير، ج٢/٥٤.
[2] أخرجه أبوداود برقم (٥٨٧٠).

ترسیان لەلا زیاتر دەکەن، ڕەنگە لەدوایدا ترسەکە ببێتە گرێیەکی دەرونــی کـە لەگەڵ منداڵەکە دا هــاودەم بێـت و ڕێگـری دەکـات لـە چونـە نـاو کۆمەڵگـە بەشێوەیەکی ڕاست و دروست، هەروا لە ئاشنا بونی بە دەوروبەری و دۆزینــەوەی خەڵکانی تر، کە ئەمەش گەورەترین کاریگەری دەبێت لەسەرنەکەوتنی لە ژیانی کردەوەییدا.

پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانی منداڵەکانیان لەسەر بوێری و نەترسان پەروەردە دەکرد.

لە نمونەی ئەمــەش گێڕانەوەیەکـە، کـەوا ئیمـام عومـەر ﷺ بەڕێگایـەکدا ڕۆیشت کە منداڵان یاریان دەکرد، جا کەلی‌یان نزیك بۆوە گشتیان هەڵاتن تەنـها یەکێکیان نەبێ، جا عومەر پرسیاری لیٚ کــرد: بۆچـی لەگـەڵ هاوڕێکـانت ڕات نەکرد؟ ئەویش بەهەمو متمانە و بوێریەکــەوە وەڵامــی دایـەوە گوتـی: گونـاهم نەکردوە تا لێت بترسم، ڕێگاکەش تەسك نیە، تا بۆت چۆڵ بکەم.

ئەوەی لە واقعی لاوانی ئوممەت رابمێنیٚ جیاوازیەکی زۆر دەبینیٚ لە نێوان ئەو نمونانەی باسمان کرد دەربارەی پیاوێتی پێگەیشتنی منداڵان لە نێوان حـاڵی لاوان و پیاوانی ئەمڕۆی ئوممەت، ئەوانەی لە قۆناغێکی دواکەوتوی منداڵیدا دەژیـن و ناتوانن هەستن بە ئەرکی بەرپرسیارێتی، زۆریان دەبینین وەکـو منـداڵان نـاتوانن بەبیٚ جۆرێکی دیــارکراو لـە شـیرنەمەنی یـان ساردەمەنی بژیـن، کـە لەسـەر خواردنی ڕاهاتون. کەواتە چ خێر و چاکەیەك لەم جۆرە کەسـانە داوا دەکـریٚ بـۆ خۆیان و ئوممەتەکەیان؟!

گەر ئەمە واقیعی لاوەکانمان بێت، کەواتە چۆن بەسەر دوژمنەکانمان زاڵ دەبین و مافەکانمان لە دەستی دوژمنەکانمان دەستێنینەوە؟!

دووبارە جەخت دەکەینەوە لەسەر گرنگی پەروەردەکردن لە بنیاتنانی ئوممەت، و پتەوکردنی تەلاری شارستانیەتەکەی.

# راهێنانی منداڵان بۆ سود وەرگرتن لە کاتەکانیان

گەورەترین سامان کە ئادەمیزاد هەیبێ بریتی‌یە لەکات، جا گەر ئادەمیزاد توانی هەست بەنرخی کات بکات و لەکاری چاکە و بەسود بەکاری بهێنێ، ئەوا ڕێڕەوی ژیانی دەگۆڕێ و ئاییندەیەکی ڕۆشنی بۆ دروست دەکات.

خوای گەورەش لەسەر گرنگی کات ئاگاداری داوە و لەزۆر ئایەت سوێندی پێ خواردوە وەك دەفەرموێ: "والعصر" "والضحى والليل.." و چەندەهای تر.

لە گرنگترین توانا بەهەدەر بردوەکانی کە نەقۆزتراونەتەوە لە کۆمەڵگەی ئیسلامیماندا، ئەو کاتە بەنرخەیە کە بەباشی بەکاری ناهێنین و سودی لێ وەرناگرین، ئەم دیاردەیەش لەلای گەورە و بچوکەوە بەرچاو دەکەوێ، جا تەماشاکردنێکی خێرا بۆ گازینۆکان و یانەکان و باخچەکان و جادەکان و سینەماکان و شوێنەکانی تری لەهو، قەبارەی ئەو توانا گەورەیە بە دیار دەخات کە ئوممەت هەمو ڕۆژ زیانی لێ دەکەوێ.

لە کاتێکدا ئێمە لە دڕندەترین جەنگ داین لە دژی دوژمنانی ئەم ئوممەتە، کە جولەکەکان و خاچ پەرستەکان و کەسانی ترن.

لەگرنگترین هۆیەکانی بڵاوبونەوەی ئەم دیاردە نەخۆشیە لە زۆرینەی توێژەکانی کۆمەڵگەدا بریتی‌یە لەوەی، کە تاکەکانی کۆمەڵگە ڕانەهاتون لەسەر بەسەربردنی کاتەکانیان لەکاری سودبەخش بەخۆیان و بەکۆمەڵگەیان.

جالێرەدا ڕۆڵی گرنگ دەگەڕێتەو بۆ دایك و باوك لە ڕاهێنانی منداڵەکانیان لە بەکارهێنانی قۆزتنەوەی کاتەکانی بەتاڵیان لە گەشەپێدانی ئارەزووە (الهواية) بەسودەکان لە یەك کاتدا، کە ئەمەش هەر لەسەرەتای منداڵیەوە دەست پێدەکات، لەو کاتەی منداڵ دەست بە سکاڵا و بێزاری و وەرز بون دەکات، جا ئەو کاتە دایك و باوك پەلە دەکەن لە یاریدەدانی منداڵ بۆ دۆزینەوەی ئارەزوە

پەنگ خواردوەکان لە دەروونیدا کــە دەکـرێ کـاتی خـۆی پـێ بەسـەر ببـات و بۆشایی کاتەکانی پڕبکاتەوە.

بێگومان دۆزینەوەی ئارەزوەکـانی منـداڵ کردارێکـی زەحمـەت و زۆر وردە، هەندێ جار پێویستی بە ئارام گرتن و کاتی زۆر هەیە.

دایك و باوك دەتوانن ئـەم ئـارەزوە بدۆزنـەوە و ئاشـکرای بکـەن، ئەمـەش بەبەشداری کردنیان لە یاریکردن لەگەڵ منداڵان لە هەندێ کاتیان دا و لەمیانەی ئەم بەشداریکردنە ئاشنابون بە ئـارەزو کردنیـان بـە هونـەرەکان، یـان ئـارەزوە کردەیی‌یەکان، یان جگە لەمانە و شتی تر.

پێویستە وریابن کەوا هەر منداڵە و ئارەزویەکی تایبەتی هەیە، یـان مـەیلی جـۆرە کـارێکی دیـاری کـراوی هەیـە، بـەڵام ئـەم ئـارەزوە لـەلای زۆر منـداڵ پێنەگەیشـتون، جـا لەبـەر ئەمـە پێویسـتی بـەچاودێری و گەشـەپێدانی سەرپەرشتیارانەوە هەیە.

گەر دایك و باوك توانیان منداڵەکانیان بگەیەننە قۆناغی توانـابون بـە سـود وەرگرتن لەکاتە بەتاڵەکانیان بە ئارەزوە بەسودەکان، ئەوا ئەمە دەبێتـە مایـەی نەمانی زۆر گرفتی دەرونی و کۆمەڵایەتی ژیانی منداڵان و باوکان، کە زۆر جـار گرفتەکان لە ئەنجامی بەتاڵی و، پـڕ نەکردنـەوەی کاتەکانـە بەشـتە بەسودەکان دروست دەبێت.

یەکەم شت کە پێویستە دایك و باوك لەم ڕوەوە دەستی پێ بکـەن بریتی‌یـە، لە فێرکردنی منداڵان بەڕیزگرتنی کات و مکوڕبون لەسەر بەفیڕۆنەدانی، مەگـەر بۆ چاکە و سود بەخشین بێ، ئەمەش بـەوە دێتـە دی، کـە سـەرنجیان بـۆ ئـەوە ڕابکێشرێ کە کات بە نرخە و ئەوەی دەڕوات ناگەڕێتەوە، ئـەوەی بـەفیڕۆ ڕۆیـی قەرەبو ناکرێتەوە.

دوەم شت ئەوەیە ئاگاداری منداڵ بکرێتەوە لەوەی، کە منداڵ چی بۆ دەکـرێ

لەم کاتە بەفیرۆ چوانەدا ئەنجامی بدات، ئەمەش بەئاشـنابون بـەو شـتانەی کـە سەرنجیان رادەکێشێ و خۆیان بەئارەزوی خۆیان ئارەزوەکانیان جێبـەجێ بکـەن، هەروا ئەم ئارەزوەش گەشەی پێ بدرێ.

جا گەر دایك و باوك هەسـتیان کـرد، کـە منـداڵ ئـارەزوی لـە پێکـەوەنان (ترکیب) و نەخشەسازی (تصمیم)ە، ئەوا دەکرێ ئەم ئارەزوە گەشەی پێ بـدرێ، ئەویش بەکڕینی کۆمەڵێك شت، کە پێکەوە ببەسترێن بۆ دروست کردنـی شـار و خانو.

گەر بینیان منداڵەکە ئارەزوی یاریکردن بەکاروبارە ئەلیکترۆنیـەکانی هەیـە و، بەمەبەستی چاکردنـەوەی هـەوڵی هەڵوەشـاندنەوە و کردنـەوەی شـتە لـەکار کەوتوەکان دەدات، ئەوا با گەشە بەو ئـارەزوە بـدەن ئـەویش بـەکڕینی هـەندێ پارچەی ئەلیکترۆنی و ئەو کتێبانەی، کە ڕاڤەی چۆنیەتی پێکەوەنان و کارکردنی دەکات.

هـەروەها شـتێکی سـود بەخشـە کچـان رابـهێنرێن لەسـەر بەسـەربردنی کاتەکانیان بە کـاری ماڵـەوە و فێرکردنیـان بـە چـاودێری کردنـی، تـاوەکو لـە ئاییندەدا ئامادە بن بۆ بینینی ڕۆڵی خۆیان بەشێوەیەکی باش لـەو کاتـەی، کـە کچ دەبێتە هاوسەر و دایك، کـە بـەرپرس دەبـێ لـە چـاودێری کردنـی خـێزان، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((لنعم لهو المرأة مغزلها: باشترین شت ئـافرەت خـۆی پێوە خەریك بکات و کاتی خۆی پێ ڕابوێرێ، شت ڕستنیەتی.))[1]

دەبێ ئەوەش بگوترێ ئەرکی دایك و باوکە، کە هـەندێ کـاتی منـداڵان پـڕ بکەنـەوە بـە خـوا پەرسـتی و خوێندنـەوەی قورئـان و ویردەکـان هـەروا هـانی خوێندنەوەیان بدەن و هاندانیان بدەن بە پاداشـتی مـادی و مەعنـەوی، تـاوەکو لەسەر ئەم ئارەزوە بەسودانە ڕابێن.

[1] أخرجه الديلمي في (الفردوس) برقم (٦٧٨٦).

**ئارەزوی خوێندنەوە و کاتەکانی بەتاڵی:**

هەروەها شتێکی بەسودە منداڵان هان بدرێن لەسەر خوێندنەوە کەوا دایك و باوك چەند پەرتوکێکی سەرنج ڕاکێش و کات بەسەر بەر بۆ منداڵان بکڕن و بەشێکیشی لیٚ بکەنە خەڵات و پاڵنەر، کە لە چەند بۆنەیەکدا پێشکەش بە منداڵان بکریٚ، هەروا دروستکردنی پەرتوکخانەیەکی هەمە چەشنی ماڵەوە و منداڵان هان بدرێن لەسەر سود لیٚ وەرگرتنی و فێرکردنیان بەگرنگی خوێندنەوە، کە پێویستە وەك خواردن و خواردنەوە لە پێشەوەی گرنگی دانەکانیان بێت.

هەروەها دەرکردنی گۆڤارێکی زانستی، یان ڕۆشنبیری مانگانە لە لایەن خێزانەوە بۆ گەورە و بچوکان؛ هاندانە بۆ منداڵان کە گرنگی بە خوێندنەوە بدەن.

ئەمەش نمونەی چەند پەرتوکێکە، دەشیٚ بکرێتە ناوك بۆ دامەزراندنی پەرتوکخانەی ماڵەوە:

١-پەرتوکەکانی زانستەکانی قورئانی پیرۆز: پێویستە پەرتوکخانەی ماڵەوە پەرتوکەکانی ڕاڤەکردنی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و موفرەدات لەخۆ بگریٚ، ئامۆژگاریش دەدەم بەهەڵبژاردنی یەك لەم تەفسیرانەی خوارەوە:

-(تفسير الجلالين)ی ئیمام سیوطی.

-(مختصر تفسير ابن كثير)ی دکتۆر محمد علی الصابونی.

-(مختصر تفسير الخازن)ی شێخ عبدالغني الدَّقر.

-(التفسير المنير)ی دکتۆر محمد وهبة الزُّحيلي.

-(تفسير المراغي) کە بە ئاسانی و مەنهەجیەت جیا دەکرێتەوە.

٢-زانستەکانی سوننەت و فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری دەدەم بە هەڵبژاردنی ئەم پەرتوکانەی خوارەوە:

-(التاج الجامع للأصول)ی شێخ منصور علی ناصف.

-(رياض الصالحين)ی ئیمام نەوەوی.

-(الاذكار)ی ئیمام نەوەوی.
-(جامع العلوم و الحكم)ی ئیبن رجب الحنبلی.
-(السيرة النبوية)ی ئیبن هشام.
-(صفوة السير)ی دکتۆر محمد الحبش.
-(فقه السيرة)ی دکتۆر محمد سعيد رمضان البوطي.
-(فقه السيّرة)ی شێخ محمد الغزالي.
-(سيدنا محمد رسول الله ﷺ)ی شێخ عبدالله سراج الدين.
٣-پەرتوکەکانی پەروەردە و ڕەوشت:
ئامۆژگاری دەدەم بە هەڵبژاردنی ئەم پەرتوکانەی خوارەوە:
-(إحياء علوم الدين)ی ئیمام غەزالی.
-(موعظة المؤمنين)ی شێخ محمد جمال الدين القاسمي.
-(مختصر منهاج القاصدين)ی ئیبن قدامة المقدسيّ.
-سلسلة الخير (الآداب و الاخلاق)ی مامۆستا محمد خير فاطمة.
٤-پەرتوکە فقهیـــەکان: ئامۆژگـاری دەدەم بەهـەڵبژاردنی ئـەم پەرتوکانـەی خوارەوە:
-(فقه السنة)ی سيد سابق.
-(الحلال و الحرام)ی دکتۆر يوسف القرضاوي.
-(سلسلة الفقه المنهجي)ی دکتۆر مصطفى الخن، دکتۆر مصطفى البغا، شێخ علي الشُّربجي.
-(سلسلة الفقه الشّيّق)ی شێخ رمضان ديب، حاجی غادة، ضاهر.
٥-پەرتوکەکانی مێژو: ئامۆژگاری دەدەم بەم پەرتوکانەی خوارەوە:
-(فجر الاسلام)ی ئەحمەد ئەمین.
-(ضحى الاسلام)ی ئەحمەد ئەمین.
-(ظهر الاسلام)ی ئەحمەد ئەمین.

-(تأريخ الاسلام)ی حسن إبراهيم حسن.
-(الدولة الاموية)ی دكتۆر يوسف العش.
-(الدولة العباسية)ی دكتۆر يوسف العش.
-(الاسلام في حضارته و نظمه)ی دكتۆر أنور الرفاعي.
-(التراتيب الادارية)ی شێخ عبدالحي الكتاني.
-(سلسلة أعلام المسلمين) كه له دار القلم دەرچوه.

٦-پەرتوكه فيكريـه جۆراوجۆرەكـان: پەرتوكخانـەی ئيسـلامی كۆمـەڵێكی گەوره لەم پەرتوكانه لەخۆ دەگرێ وەك:

-دانراوەكانی شێخ محمد غزالی.
-دانراوەكانی دكتۆر يوسف القرضاوي.
-دانراوەكانی دكتۆر عبدالرحمن حسن حبنكة.
-دانراوەكانی دكتۆر رۆجيه گارۆدی.
-دانراوەكانی دكتۆر مراد هوفمان.
-دانراوەكانی دكتۆر شێخ أبو الحسن النَّدويّ.
-دانراوەكانی شێخ عەلی طنطاوی.
-دانراوەكانی دكتۆر محمد سعيد رمضان البوطي.

٧-كۆمەڵە پەرتوكێكی زانستی له بواری سروشت و بيركاری و زانسـتی تـر، گرنگترينيان مەوسوعه زانستيەكان، وەك مەوسوعەی زانستی، كه له وەزارەتی رۆشنبيری كۆماری عەرەبی سوری دەرچوه.

دەشكرێ چەند پەرتوكێكی تر بـۆ ئـەم پەرتوكخانەيـە زيـاد بكـرێ، وێـڕای ئاگادار بون كه ئەم پەرتوكخانەيـە پەرتوكخانەيـەكی پسـپۆر (تخصـص)ی نيـە، بەڵكه پەتوكخانەيەكه بۆ خوێنەری ئاسايی‌يە.

هەروەها شتێكی سود بەخشه كه لەبواری قۆزتنـەوەی كـاتی بـەتاڵ، منـداڵ رابهێنرێ بۆ ئامادەبون له نوێژی هەينی و كۆڕی زانستی، كه سوپاس بۆ خوا لـه

گشت مزگەوتەکان، کۆڕ سازدەدرێ. ئەم کارەش کاریگەریەکی گەورەی هەیە لە دڵ بەستنی منداڵ بە مزگەوت، کە بنکەیەکی پەروەردەیی و زانستی و کۆمەڵایەتی هەرە گرنگی ژیانی مسوڵمانە.

هەروەها منداڵان ڕابهێنرێن لەسەر بەجێ هێنانی پەیوەندی خزمایەتی و سەردانی خزمان، کە توانستە کۆمەڵایەتیەکانیان فراژو[1] دەکات، هێزی پەیوەندی نێوان ڕۆڵەکانی کۆمەڵگە پتەو دەکات.

بەشداری کردنیش لە خولەکانی فێرکردنی زمانەکان؛ کاریگەریەکی گەورەی هەیە لە زیادبونی ڕۆشنبیری منداڵان و ئارەزودانێکە بۆ پڕکردنەوەی کاتی بەتاڵیان بەشتی سودبەخشی کات بەسەر بەر.

ئەمڕۆش کە کۆمپیوتەر گرنگترین دەروازەی زانستەکانە و خێراترین سەرچاوەی زانست و ڕۆشنبیرییە، کەواتە دەبێ مکوڕ بین لەسەر فێرکردنی منداڵان و مامەڵەکردن لەگەڵی و سود وەرگرتن لە توانستە زۆرەکانی. جا گەر باری مادی خێزان لەباربو بۆ کڕینی کۆمپیوتەری تایبەت بەخێزان، ئەوا با پەلە بکەن بۆ کڕینی، ئەمەش لەبەر ئەوەی خێزان پێویستی بە زانست و ڕۆشنبیری هەیە.

**منداڵ و تەلەفزیۆن:**

ئەمڕۆ تەلەفزیۆن لە زۆربەی ماڵدا ڕەگەزێکی بنەڕەتی پێك دەهێنێ، بەڵکو زۆر لەو ماڵانە لەهەمو ژورەکانی ئامێری تەلەفزیۆنی لەخۆ گرتوە و بەپێوانەی جیاجیا، کە باشترین شوێنی ماڵی بۆ هەڵدەبژێردرێ بۆ دانانی ئەم ئامێرە و پاشکۆیەکانی.

ئێمە بانگێشەی ئەوە ناکەین ئەم ئامێرە لەماڵ دەربهێنرێ، ڕێگری هەبونیشی ناکەین، چونکە دەزانین ئەم ئامێرە چەندەها سودی زانستی و

---

[1] فراژو: گەشە.

کۆمەڵایەتی و دەرونی هەیە، سەرەڕای زیانەکانیشی کە نکوڵی لێ ناکەین.

بەڵکە بانگێشەی مام ناوەندی و پشت نەبەستن بەم ئامێرە دەکەین، کە وەك تەنها ئامرازێك بێت بۆ بەسەر بردنی کاتی منداڵەکانی ناو خێزان، کە لەبەردەم شاشەکەیدا بەدرێژایی چەند کاتژمێرێك بەبێ بێزاربون و ماندوبون کات بەسەر دەبەن یان بێ ئەوەی ئاخێك هەڵکێشن بۆ ئەو کاتەی بەفیڕۆ دەڕوات، کە بەرنامە و سەردانەکانیان رێك دەخەن، کە بگونجێ لەگەڵ بەرنامە و زنجیرە تەلەفزیۆنیەکان و ناتوانن وازی لێ بهێنن، گرفتەکەش گەورەتر بوە، کە سینی سەتەلایتەکان زۆربەی بینایە و خانوەکانی داگرتوە، کە هەڵبژاردنی کەناڵەکان زۆر و فراوانتر بوە، ئەو کاتەی کە بینەر لە دوای تەلەفزیۆن دەیباتە سەر؛ گەورەتر بوە.

گرفتی هەرە گرنگیش لە نەوەکانی تازە پێگەیشتو دایە، کە هەر لە منداڵیەوە لەسەر کردنەوەی تەلەفزیۆن و سۆراخ کردنی بەرنامە جیاجیاکان بەچاك و خراپیەوە ڕاهاتون. هەر لە سەرەتای دەست پێکردنی بەرنامەکان، تنا کۆتایی هاتنی لەکاتێکی درەنگ دا.

جا بەخوێندنەوەیەکی خێرا بەو ئامارانەی، کە ئەندازەی ئەو کاتەی منداڵان لە تەماشاکردنی تەلەفزیۆن بەفیڕۆی دەدەن، ئەوا مەترسی بابەتەکە و گرنگیەکەی بەدیار دەکەوێ، ئەمەش هەندێ نمونەن:

کۆتا ئامار دەڵێ: گەر ماوەی تەماشاکردنی منداڵ بۆ تەلەفزیۆن کۆ بکەینەوە، کە لە تەمەنی دو ساڵیەوە دەست پێ دەکات، دەبینین لەو ماوەیە زۆرترە، کە منداڵ لە قوتابخانە بەسەری دەبات.

لە ئەوروپا تەماشاکردنی منداڵان بۆ تەلەفزیۆن دەگاتە بیست و چوار کاتژمێر لە هەفتەیەکدا، لە ئەمریکاش دەگاتە چواردە کاتژمێر لە هەفتەیەکدا.

لە مەغریبی عەرەبی سی و پێنج کاتژمێرە لە هەفتەیەکدا، بەواتای ساڵانە

هەزار و هەشت سەد و بیست کاتژمێر، کـەچی لـە قوتابخانـەدا هـەزار و پـەنجا کاتژمێر ساڵانە کات بەسەر دەبات[1]!

لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر باوکان کاری خۆیان رێك و پتەو بکـەن لـەماوە و جۆری بەرنامە و ئەو بابەتانەی منداڵان لەم ئامێرەوە تەماشای دەکەن، هەروەها پێویستە فێریان بکەن، کە سود لـە کاتـەکانیان وەربگـرن دور لـە تەلـەفزیۆن و فراژوکردنی ئارەزوە بە سودەکانیان، لێنەگەڕێن تەلەفزیۆن، هەر لە بەیانیەوە تـا ئێـوارە کـار بکـات بەڵکـە کۆشـش بکـەن بـۆ کـورت کردنـەوەی کاتـــەکانی تەماشاکردن بۆ کاتی دیاریکراو.

هەروەها راهێنـانی منـداڵان لەسـەر تەماشـا نـەکردنی تەلـەفزیۆن لـەکاتی تاقیکردنەوەکان و ئەزمونەکاندا، گەر لە ماڵ ئامێری ڤیدیۆ هەبو، ئەوا لەسـەر دایك و باوکە، کە بەکارهێنانی ئەم ئامێرەیان لێ تەسك بکەنەوە، هەرگیز رێگە نەدرێ بە منداڵان بەبێ سەرپەرشتی دایك و باوك بەکاری بهێنن.

دەبێ بایەخ بە هەبونی ئەرشیفێکی ڤیدیۆ لە ماڵ بدرێ، کـە ژمارەیـەك لـە شریت و فلیمی ئامانجدار و زانستی و کات بەسەربەر لەخۆ بگرێ.

گرنگترین جێگیر (بدیل)ی دڵبەستن بە تەماشاکردنی تەلەفزیۆن بریتیـە لـە دانیشتنی خێزانیی شەوانەی بەکۆمەڵی ئاراستەکەر و، چونە دەرەوەی خێزان بـە کۆمەڵ بۆ گەشت و کات ڕابواردن.

دیسان دوپاتی دەکەمەوە، کە رێکخستنی تەماشاکردنی تەلەفزیۆن لە لایـەن خێزانەوە سودی زۆری زانستی و کۆمەڵایەتی و دەرونی لێ دەکەوێتەوە، چونکـە زۆر بەرنامەی بەسود لەم ئامێرەوە نمایش دەکرێ.

[1] دور البيت في تربية الطفل المسلم، ص١١٠، لە وتارێکی مامۆسـتا ئیدریـس کـەتانی لـە گۆڤـاری الاصلاح ی ئیماراتی ژمارە (١٢١) ساڵی ١٩٨٨م گواستراوەتەوە.

**منداڵ و وەرزش:**

زۆر فەرموودە هاتوە، هانی باوك دەدات منداڵەكەی فێری وەرزش كردن بكات، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((علموا أبناءكم السباحة و الرماية: منداڵەكانتان فێری مەلەوانی و تیرهاویشتن بكەن.))[1]

پێغەمبەر ﷺ بەلای چەند گەنجێك تێپەڕی و فەرمووی: ((أرموا يا بني اسماعيل فإن أباكم كان راميا: ئەی نەوەی ئیسماعیل، تیر بهاوێن چونكە باوكتان تیرهاوێژ بوە.))[2]

بێگومان وەرزش چەند سودێكی جەستەیی و دەرونی هەیە و حەسانەوە و ئارەزودانێكە كە منداڵان زۆر كاتی بەتاڵیان پێ بەسەر دەبەن، بەڵام گرفت لەوەدایە، كە وەرزش ببێتە ئامرازی لەدەست دانی كات و دارایی و ئیفلیج كردن و كۆتبەنكردنی توانستەكانی ئوممەت و گرنگی دانی بگۆڕی بۆ كاری نا سەرەكی، كە لە جەنگی چارەنوسی لادەدات.

لەبەر ئەوە، شتێكی سود بەخشە كە لاوان بۆ بنیات نانی جەستەیان بەشێكی كاتیان لە وەرزش بەسەر ببەن، بەڵام زۆر سامناكە وەرزش ببێتە هەمو شتێك، كە لە گرنگترین ئەركەكانی خوێندن و كۆمەڵاتیان بكات، لەبەر ئەوە ئەركی دایك و باوكە، كە ئاگاداریان بكەنەوە لە بایەخدان بە وەرزش زێدە ڕۆیی نەكەن.

---

[1] أخرجه البيهقي في الشعب.برقم (٨٦٦٤).
[2] أخرجه البخاري برقم (٢٨٩٩).

## منداڵ و گەشت و گوزار:

بەڵگە نەویستە، کە هەر یەکێك لە ئێمـــە هەســت بــە شــوێنەواری گـەورەی گەشت و گوزاری کورت خایەن بکات بۆ چالاك کردنــی جەســتە و دەرون. لەبــەر ئەوە ئەرکی دایك و باوکە، کە هەفتانە یان مانگانە ڕۆژێــك تــەرخان بکـەن بـۆ گەشتی بەکۆمەڵ، کە خێزان بۆ دەرەوەی شار دەربچن و ئەو ڕۆژەی تێـدا بەسـەر ببەن دور لەژیانی شار و ڕۆتینیاتی شار، چی تیانیە گەر لەم گەشتەیاندا هـەندێ هــاوڕێی منداڵــەکانیان لەگـەڵ خۆیــان ببــەن کــە پــەیوەندیان لەگـەڵ هـــاوڕێی منداڵەکانیان پتەو دەبێت و پێیان ئاشنا دەبن.

شتێکی زۆر بەسودە لەبەرنامــەی کــات بەســەربردنی گەشــتەکەدا، زانیــاری بەسود دەربارەی مێژو و جوگرافیا و نوژەن کردنەوەی ئەو ناوچەی، کە خێزانەکـە سەردانی دەکەن باس بکرێ.

گومانی تێدا نیــە منــداڵان زۆر یادگــاری جـوان و وروژێنــی ئــەو گەشــت و گوزارانەیان لە مێشکدا دەچەسپێ و لەبیر نــاکرێ، کــە بــە منداڵــی چێژیــان لێ وەرگرتوە.

هەروەها گەشتی درێژ خایــەن، کــە چــەند ڕۆژێــك بــەردەوام دەبێــت، چـەند سودێکی هەیە، کە ئاماژە بە گرنگترینیان دەکەین:

١-چالاك کردنی جەستە و تەندروست باشی و چاك بونەوە لە زۆر نەخۆشـــی: پێغەمبەریش ﷺ سەبارەت بەمە فەرمویەتی: ((سافروا تصحـــوا و تغنمـــوا: گەشت بکەن تەندروستیتان باش دەبێت و شت بەدەست دێنن.))[1]

٢-ڕاهــاتنی منــداڵان لەســەر زبری و زەحمــەتی و بــەهێزکردنی ویســـت و ئیرادەیان لەکاتی کەمی خواردن و خواردنەوەیان و ئارام گرتن لەسەر برســێتی و

---

[1] اخرجه البيهقي في "السنن" ج٧/١٠٢.

زەحمەتی. دەربارەی ئەمەش پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((**السَّفرُ قطعةٌ من العذاب يمنع أحدكم طعامه و شرابه و نومه**: گەشت کردن پارچەیەکە لە ئازار، چونکە هەر کامێك لە ئێوە لە خواردن و خواردنەوە و نوستن دەکرێ.))[1]

٣-هەروەها ڕێگە بە پەروەردیار دەدات ڕەفتاری منداڵان و کاردانەوەیان بەرامبەر چەندەها هەڵوێستی جیاواز ببینێ، گێڕڕاوەتەوە کەوا ئیمام عومەرﷺ گوێی لە پیاوێك بو ستایشی پیاوێکی دەکرد، ئیمام عومەر فەرموی: گەشتت لەگەڵ کردوە؟ پیاوەکە گوتی: نەخێر، فەرموی: شەریکایەتیتان پێکەوە کردوە؟ گوتی: نەخێر. فەرموی: سوێند بەو خوایەی، کە هیچ خوای تر نیە تۆ ئەو کەسەت نەناسیوە.

[1] أخرجه البخاري برقم (١٨٠٤) و مسلم برقم (١٥٢٦).

# دەروازەی چوارەم

## شێوازو ئامرازەکانی پەروەردەی سەرکەوتوو

پرۆسەی پەروەردەیی پرۆسەیەکی ئالۆزە، کە هەوڵدەدات بۆ جێبەجێ کردنی کۆمەڵە ئامانجێکی تاکەکەس و کۆمەڵگە. جا بۆ بەجێ هێنانی باشترین ئەندازەی ئەم ئامانجانە، دەبێ چەندە ئامرازێك بەکاربهێنرێ بۆ پەروەردە و ڕێك و پێك کردن، جا بۆ ئەم مەبەستە گرنگترین ئامراز و ڕێگاکانی پەروەردەی ئیسلامی باس دەکەین.

# سۆز و بەزەیی

ئـەو سـۆز و بەزەیی‌یـەی دایـك و بـاوك دەیدەنـە منداڵـەكانیان، ڕۆڵێكـــی پەروەردەیی گەورە و گرنگی هەیە، لەبەر ئەوەی پەیوەندی و پەیوەسـت بونێكـی دەرونـی و گیـانی لـە نێـوان منـداڵان و باوكـان دروست دەكـات و، منــداڵان ئامۆژگاریەكانی دایك و باوكیان بە گرنگ وەردەگــرن و لــە ڕەفتاریـاندا پێـوەی پابەند دەبن.

هەروەها هەست كردنی منداڵ بە سۆز و بەزەیی دایك و باوكی و كەسانی تر؛ كاریگەریـەكی گـەورەی هەیـە لـە پێگەیشـــتنی كەســایەتی و تەندروســتیە دەرونیەكەی، لەبەر ئەوە تێربونی سۆزی منداڵ بەشێوەیەكی هاوسەنگ و دور لە زێدەڕۆیی و بەزایەدان (أفراط و تفریط) و، لە هەل ڕەخســاندن بـۆ منــداڵان بـۆ گوزارش كردن لە سۆز و هەستیان بە شێوەیەكی ڕاست و دروست؛ شـوێنەوارێكی گەورەی هەیە لە بنیاتنانی كەسایەتیان بە بنیاتنـانێكی ڕاسـت، هـەروا لـە ڕۆڵ بینیان بە شێوەیەكی راست لە كۆمەڵگەدا.

جا بۆ بەدیارخستنی گرنگی سۆز و بەزەیی، وتـەی نوسـەرێكی ئـافرەتت بـۆ باس دەكەم، كە لە یاداشتەكانی نوسیویەتی: (خوا لــە بـاوكم ببـورێ، یـاریدەی نەداین گەشە بكەین، هەردەم لە خۆشی و شادی ڕێگری دەكردین، هەمو خـەمی ئەوەبو، گەر دەنگە دەنگێمان لەدەم دەرچویا، یا دەنگمــان بـەهۆی پێكەنینــەوە بەرز بویاوە بێ دەنگمان بكات، هەر كاتێكیش یاریمان بكردایە بـێزاری و وەرزی خۆی زۆر دەردەبڕی)[1].

زۆر فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ هاتوە، كە پڕە لــە دەربڕینــی سـۆز و بـەزەیی پێغەمبەر ﷺ بۆ منداڵان.

---

[1] العلاقة بین الاباء و الإبناء، ص٨.

ئەنەسی کوڕی مالك دەڵێ: ((**مَا رَأَيْتُ أَحَدًا كَانَ أَرْحَمَ بِالْعِيَالِ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ**: هیچ کەسێکم نەدیوە وەك پێغەمبەری خوا بەبەزەیی تر بێت بۆ منداڵان.))[1]

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**إن الله لا يرحَمُ من لا يرحم ولده، والذي نفسي بيده، لا يدخل الجنة إلا رحيمٌ**: خوای گەورە بەزەیی بە کەسێکدا نایەتەوە کە بەزەیی بە منداڵەکەیدا نەیەتەوە، سوێندم بەو کەسەی گیانمی بە دەستە، کەسێك ناچێتە بەهەشت گەر بەبەزەیی نەبێت.))[2]

ڕواڵەتەکانی بەزەیی دایك و باوك بەرامبەر منداڵەکانیان ژمارەیان زۆرە، گرنگترینیان:

## ١-لە ئامێز گرتن و ماچ کردن:

هیچ کەسێك ناتوانیباسی ئەو بەختەوەریە گیانیە بکات، کە منداڵ هەستی پێ دەکات کاتێك کە لەسەر ڕانی دایك و باوکیەتی، کە گەمەی لەگەڵ دەکات و ماچی دەکات. لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ لە زۆر بۆنەدا مکوڕ بوە لەسەر تێرکردن و بەجێ هێنانی ئەم ئارەزوەی منداڵان.

لە ئوسامەوە ﷺ گێڕاوەتەوە کە گوتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵی دەگرتم و لەسەر ڕانی دایدەنام، حەسەنیشی لەسەر ڕانەکەی تری دادەنا، پاشان لە ئامێزی دەگرتین و دەیفەرمو: ((**اللَّهُمَّ ارحمهُما فإني أرحمهما**: خوایە بەزەییت پێیان بێتەوە، چونکە من بەزەیم پێیان دێتەوە)).

پێغەمبەر ﷺ حەسەنی کوڕی عەلی ﷺ ماچ کرد، جا ئەقرەعی کوڕی حابس گوتی: من (دە) منداڵم هەیە و هیچیانم ماچ نەکردووە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((**من لا يَرحم لا يُرحَم**: هەر کەسێك بەبەزەیی

---

[1] أخرجه مسلم برقم (٢٣١٦).
[2] أخرجه البزاز برقم (١٨٨٩).

نەبێ، کەس لەگەڵی بەبەزەیی نابێ.))[1]

لەگەڵ ئەوەشدا ئەمڕۆ زۆر لە باوکان خــو و ڕەوشــتی نەزانــەکانیان گرتــوە و مــاچ کردنــی منداڵانیــان بــە نــەگونجان لەگــەڵ تــەواوی پیــاوەتی دادەنێــن و منداڵەکانیان بێبەش دەکەن لە مافێك لەو مافانــەی، کــە کاریگــەری گــەورەی هەیە لە بنیاتنانی کەسایەتیان و پەروەردەی خۆیان.

## ٢-دەست هێنان بەسەر سەر و گەمە کردن لەگەڵی:

دەست هێنان بەســەر ســەری منــداڵ بەمەبەســتی گەمــە و یــاری، شــادی و بەختەوەری هەیە بۆ منداڵ. لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ لە زۆر بۆنــەدا مکوڕبــوە لەسەر دەست هێنان بەسەر ســەردا، وەك ئەنــەس گێڕاویەتــەوە کــە گوتویــەتی: (پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی ئەنساریەکانی دەکرد و سلاوی لە منداڵەکانیانی دەکرد و دەستی بەسەردا دەهێنان)[2].

عبداللە‌ی کــوڕی جەعفــەر ﷺ گوتویــەتی: (پێغەمبــەری خــوا ﷺ دەســتی بەسەرم داهێنا)[3].

## ٣-بەباشی پێشوازی کردنی منداڵان و بەباشی دواندنیان:

منداڵان تەماشای ڕەفتاری گــەوران دەکــەن، بەشــێوەیەکی بــەرچاو تێبینــی کاردانەوەی کردارەکانی گەوران بەرامبەریان دەکەن، کە ڕەنگە منداڵان ڕەچــاوی نەکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ مکــوڕ بــوە لەســەر گرنگیــدان بەباشــی پێشــوازی کردنی منداڵان و پێك گەیشتنیان لە لایەنە جیاجیاکاندا وەك:

ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕاویەتیەوە کاتێ بەری میــوە پێدەگەیشــت پێغەمبــەر

[1] أخرجه البخاري برقم (٥٩٩٧) و مسلم برقم (٢٣١٨).
[2] أخرجه النسائي برقم (٨٣٤٩).
[3] أخرجه الحاكم في المستدرك ج١/٣٧٢.

ﷺ دەهات و دەیفەرموو: ( خوایە شارەکەمان پیرۆز بکەی، خوایە بەرەکەت بخەیە بەروبومەکانمان و کێشانمان، بەرەکەت لەگەڵ بەرەکەت)، پاشان دەیدا بە بچوکترین کەس کە لەوێ ئامادە دەبو[1].

لە جابرەوە رضي الله عنه گێڕراوەتەوە کە گوتویەتی: (لەگەڵ پێغەمبەری خوا بوینﷺ جا بانگهێشت کراین بۆ نان خواردن، لەرێگادا حوسەین لەگەڵ منداڵان یاری دەکرد، پێغەمبەریش ﷺ لەپێش خەڵکەکە بەپەلە ڕۆیی و پاشان دەستی کردەوە و لێرە و لەوێ ڕای دەکرد، پێغەمبەری خوا حوسەینی بە پێکەنین دەهێنا، هەتا گرتی و دەستێکی خستە چەناگەیەوە و دەستەکەی تریشی لە نێوان سەری و گوێی، پاشان لە ئامێزی گرت و ماچی کرد، پاشان فەرموی: ((حسين مني وأنا منه، أحبَّ الله من أحبه، الحسن و الحسين سبطان من الاسباط: حوسەین لە منە و منیش لەوم، ئەو کەسەی ئەوی خۆش دەوێ خوا خۆشی بوێ، حەسەن و حوسەین لە چاکە و خەیردا ئوممەتێکن لە ئوممەتەکان.))[2]

## ٤-لەخۆگرتنەوە بۆ منداڵان:

لە ڕواڵەتەکانی سۆز و بەزەیی بۆ منداڵان ئەوەیە، کە باوکان دەست لە زۆر پێداویستی هەڵگرن و لە خۆیان بگرنەوە لەبەر منداڵان.

لە ئەنەسەوە رضي الله عنه گێڕراوەتەوە کە گوتویەتی: ئافرەتێك هاتە لای خاتو عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) و سێ خورمای پێ بەخشی، جا دایکەکە هەر منداڵەی خورمایەکی پێدا و خورمایەکیشی بۆ خۆی هەڵگرت، دو منداڵەکە خوارمایەکەیان خوارد و تەماشای دایکیان دەکرد، دایکەکە خورماکەی کردە دو لەت و هەر منداڵە و لەتێکی پێ بەخشین، جا کە پێغەمبەر ﷺ هاتەوە ماڵ، خاتو عائیشە هەواڵەکەی بۆ باس کرد. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((وما يعجبك

---

[1] أخرجه مسلم برقم (١٣٧٣).
[2] أخرجه الترمذي برقم (٣٧٧٥) و ابن ماجة برقم (١٤٤).

**من ذلك، لقد رحمها الله برحمتها صبيتها:** چ شتێك لەمە سـەرت دەسـوڕمێنێ، بەهۆی بەزەیی هاتنەوەی بە منداڵەکانی؛ خوای گەورە ڕەحمی پێکرد.))[1]

## ٥-دادگەریی و یەکسانی لە نێوان منداڵان:

دیاردەی جیاوازی کردن لە نێوان منداڵان و خۆش ویستنی یەکێکیان بەسـەر ئەوی تر، مەخابن دیاردەیەکە بە زۆری لە کۆمەڵگەکـەماندا بـەرچاوە، کـە زۆر دایك و باوك کوڕی گەورەیان خۆش تر دەوێ، یان کوڕی بچوکیـان خۆشـتر دەوێ لە برا و خوشکەکانی، یان کچیان خۆشتر دەوێ لە کوڕ یان کوڕ لە کچ، جـا ئـەم خۆش ویستنە لە زۆر جاردا دەبێتە پێشێل کردنی بەشێکی مافەکانیان لـە سـۆز و چاودێری منداڵاندا. ئەمەش شوێنەوارێکی خراپ لە دەرونـی منـداڵان بـەجێ دەهێڵێ، وایان لێ دەکات کە هەست بەوە بکەن، کە لەو خێزان و کۆمەڵگەیـەی تێیدا دەژین، خۆش ناویسترێن و بێزراون، ئەم ڕەفتارە لـە گرنگـترین هۆیـەکانی لەڕێ لادانی منداڵانە و سەرکێشانیانە بەرەو ڕەفتاری چەوت و هەڵە.

زۆر فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ هاتوە کە هانی ئەوە دەدات دادگەری لە نێوان منداڵان بکرێت، هەروا لە نێوان نێر و مێ وەك:

لە ئەنەسەوە ؓ گێڕراوەتەوە پیاوێك لە لای پێغەمبـەر بـو، جـا کوڕێکـی پیاوەکە هاتە لای، پیاوەکەش ماچی کرد و لەسەر ڕانی داینـا، پاشـان کچێکـی هات و لەبـەردەمی داینـا، پێغەمبـەری خـواش ﷺ فـەرموی: **((الا سـويت بينهم؟!:** ئەوە بۆ یەکسانیت لە نێوانیاندا نەنواند.))[2]

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: **((من كانت له أنثى فلم يئدهـا، ولم يهنها، ولم يؤثر ولده عليها، أدخلـه الله الجنـة:** هـەر کەسـێك کچـی هـەبو، زیندەبـەچاڵی نـەکرد و بەسـوکی سـەیری نـەکرد و کوڕەکـەی بەسـەر ئـەودا

[1] أخرجه إبن ماجة برقم (٣٦٦٨). برواية أخرى.
[2] أخرجه الهيثمي في "مجمع الزوائد"ج١٥٦/٨.

هەڵنەدەبژارد و خۆشتر نەدەویست، ئەوا خوای گەورە دەیباتە بەهەشت.))[1]

هەروا دەفەرمویّ: ((سوّوا بين أولادكم في العطية، ولو كنت مفضلا أحدا لفضلت النساء: بەیەکسانی شت ببەخشنە منداڵەکانتان، گەر یەکێکم لە یەکێکی تر بە باشتر دانابا، ئافرەتم بەباشتر دادەنا.))[2].

لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە ﷺ گێڕراوەتەوە کە گوتویەتی: باوکم هەندێ لە سامانەکەی پێ بەخشیم، جا دایکم (عومرەی کچی رواحە) گوتی: رازی نابم تا پێغەمبەری خوا ﷺ نەکەیە شایەت، جا باوکم چو بۆ لای پێغەمبەر، تا ببێتە شایەت لەسەر بەخشینەکەم، پێغەمبەری خوا فەرموی: "بەگشت منداڵەکانت بەخشیوە؟" گوتی: نەخێر. پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((اتقوا الله، واعدلوا في أولادكم: لەخوا بترسن، سەبارەت بە منداڵەکانتان دادگەر بن))، جا باوکم لەم بەخشینە پەشیمان بوەوە.[3]

هەروەها یەکسانی نەکردن لە نێوان منداڵان، پاڵیان دەنێ بۆ دورکەوتنەوە لە دایك و باوکیان و چاکە نەکردن لەگەڵیان بەشێوەیەکی خوازراو.

لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویّ: ((اعدلوا بين أولادكم في النحل، كما تحبون أن يعدلوا بينكم في البر: لە شت بەخشین دا لە نێوان منداڵەکانتان دادگەر بن، هەروەك چۆن حەز دەکەن لە چاکەکردن دا لە نێوانتان دادگەر بن.))[4]

بەڵام دەبێ لەوە ئاگاداربین، کە ئەو خۆشەویستی و سۆز و بەزەیی‌یەی باوکان دەیدەن بە منداڵان، پێویستە بە چەند ڕێکخەرێك ڕێك بخرێ، لە گرنگترینیان ئەمانەن:

[1] أخرجه أبوداود برقم (٥١٤٦).
[2] أخرجه البيهقي في "السنن الكبرى" ج٦/١٧٦.
[3] أخرجه البخاري برقم (٢٤٤٧) و مسلم برقم (١٦٢٣) و اللفظ لمسلم.
[4] أخرجه الطبراني في "الكبير".

-خۆشویستنی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ و جێبەجێ کردنی شەرعەکەی و فەرمانەکانی، پێش خۆشویستنی منداڵ و پەیوەست بون پێی بخرێ، ئەمەش لە فەرمایشی خوای گەورە بەڕونی دەبینرێ:

﴿قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ: بێژە: ئەگەر باب و برا و ژن و خزمەکان و ئەوماڵەی پەیداو کردوە و کەل و پەلی بازرگانی کە دەترسن لە برەو کەوێ، و خانوبەرەی ڕند و دڵخۆشکەری خۆتان، پێ لە خودا و پێغەمبەر و غەزاکردن لە ڕێی خوادا گرینگترە؛ چانوەڕ بن تا فەرمان لە خوداوە دێ، ئەوانەی لەڕێ لادەرن، خوا شارەزایان ناکا.﴾التوبة:٢٤.

هەروا لە فەرمودەی پێغەمبەر بەڕونی دەردەکەوێ کە دەفەرموێ: ((وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَلَدِهِ وَوَالِدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ: سوێندم بەوەی کە گیانمی بەدەستە بڕوای هیچ کامێکتان تەواو نابێ، تا منی لە باوك و منداڵ و هەمو خەڵکی خۆشتر نەوێت.))[1].

جا منداڵ تاقیکردنەوەیەکە خوای گەورە ناردویەتی، تا ئادەمیزادی پێ تاقی بکاتەوە و بزانرێ تا چەند مل کەچی خوای گەورە دەبێت و بە قەزا و قەدەری خوا رازی دەبێت، هەروا تا چەند پەلە دەکات لە پیادەکردنی فەرمانەکانی، کاتێك ئەم فەرمانانە پێچەوانەی ئارەزوەکانی و خۆشەویستی بۆ منداڵەکانی دەبێت.

خوای گەروە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ: ئەو دارایی و

---

[1] أخرجه البخاري برقم (١٤).

منالآنەی هەتانن، مایەی ئەزمونن.﴾التغابن:١٥.

لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕراوەتەوە کە فەرمویەتی: ((إنَّ الْوَلَدَ مُبْخَلَةٌ مَجْبَنَةٌ مَجهلةَ مَحزنةَ: منداڵ مایەی بەخیلی و ترسنۆکی و نەزانی و پەژارەییە.))[1]

مانای ئەمەش ئەوەیە کە خۆشەویستی زۆری باوك بۆ منداڵەکەی، پاڵی دەنێ بۆ ڕەزیلی کردن تا مکوڕ بێ لەسەر مانەوەی سامانەکەی، هەروەها پاڵی دەنێ بۆ نەزانی و کۆشش نەکردن بۆ داواکردنی زانست لەبەر سەرقاڵ بونی بە منداڵەکەی و لەترسی جیابونەوەی، هەروا پاڵی دەنێ بۆ ترسنۆکی لە ترسی ئەوەی نەبادا بکوژرێ و پاش ئەو منداڵەکەی ون ببێ، جا هەمو ئەمانە خۆتخوتەی شەیتانە، چونکە ڕزق و ڕۆزی و تەمەن بە ئەندازە دانراوە.

لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە بۆی باس کردوین، کە چۆن کاتێك زۆر خۆشویستنی ئیبراهیمی بۆ ئیسماعیلی کوڕی بینی، کە خوای گەورە دوای تەمەنێکی گەورە و بێ ئومێدی لە منداڵ بون پێی بەخشی، ئیبراهیمی تاقی کردەوە بۆ ئەوەی دەرکەوێ، کە خۆشەویستی ئیبراهیم بۆ ئیسماعیل، هەرگیز لەبەجێ هێنانی فەرمانی خوای نەکردبو. جا فەرمانی کرد بەسەربڕینی ئیسماعیل، ئیبراهیمیش (عليه السلام) پەلەی کرد لە جێبەجێ کردنی فەرمانی خوا، ئەوەبو ویستی سەری ببڕێ، بەڵام خوای گەورە بەرانێکی نارد لە جیاتی کوڕەکەی سەری ببڕێ، دیارە ئەمەش ڕاگەیاندنی سەرکەوتنی ئیبراهیمە لە تاقیکردنەوەکەدا.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ مِن ثُلُثَيِ اللَّيْلِ وَنِصْفَهُ وَثُلُثَهُ وَطَائِفَةٌ مِّنَ الَّذِينَ مَعَكَ ۚ وَاللَّهُ يُقَدِّرُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ ۚ عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۖ فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْآنِ ۚ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَىٰ ۙ وَآخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي الْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ

[1] أخرجه البيهقي في "السنن الكبرى" ج١٠/٢٠٢.

ٱللَّهِ وَءَاخَرُونَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَٱقْرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَقْرِضُواْ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا وَمَا تُقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيْرًا وَأَعْظَمَ أَجْرًا وَٱسْتَغْفِرُواْ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ: پەروەرندەرت ئاگادارە کە تۆ و هێندێك لەو کەسانەی دەگەڵ تۆ دان، نزیك دو بەش لە سێ بەشی ئەو شەوگارە و نیوەیی و سێیەکیشی، بۆ شەونوێژان هەڵدەستنەوە، هەر خوداشە کە ئەندازە بۆ شەو و رۆژان دادەنێ، ئەو دەزانێ هەرگیز بۆتان ناژمێردرێ، ئەوا چاوپۆشی لێکردن. دەسا هەر لە قورئانەکە -چەندی بۆو دەلوێ- بخوێنن، خوا دەیزانێ هێندێکو نەخۆش دەکەون؛ هێندێکیشتان بۆ بژێوی خودا بیدا، بە ولاتا بلاو دەبن، کۆمەلێکیش لە رای خوا دەچنە خەزا؛ سا چەندی بۆتان بۆز دەخوا، لێی بخوێنن، نوێژ بکەن و زەکات بدەن و ماڵی خۆتان بەدەستەواو -بە دەستەواوێکی پەسند- بدەن بەخوا، هەر پێش بارێ بەرێی بکەن، باشترەکەی لای خودا پێو دەگاتەوە، وێرای پاداشتی گەورەتر، هەر بوردن لە خوا بخوازن؛ خوا لە گوناهان خۆش دەبێ و دلۆڤانە﴾المزمل/٢٠.

هەروەها پێغەمبەری ئازیزمان محمد ﷺ بە مردنی ئیبراهیمی کوڕی تاقی کردەوە پێغەمبەریش بە قەزا و مل کەچ بون بە قەدەری خوای گەورە ڕازی بوو. ئەو وتە بەناوبانگەشی لێ نەقل کراوە، کە پڕە لە سۆز و بەزەیی و باوەڕی ڕاستگۆ و تەواو: "إِنَّ الْعَيْنَ تَدْمَعُ وَالْقَلْبَ يَحْزَنُ وَلَا نَقُولُ إِلَّا مَا يَرْضَى رَبُّنَا وَإِنَّا بِفِرَاقِكَ يَا إِبْرَاهِيمُ لَمَحْزُونُونَ: چاو فرمێسك دەڕژێنێ و دڵیش پەژارە دەبێ، بەڵام شتێك نالێین مەگەر پەروەردگارمان پێی ڕازی بێ. ئێمەش ئەی ئیبراهیم بەمردنی تۆ خەمبار و پەژارەین.))[1]

بەڵام پێغەمبەر ﷺ سەرەڕای خەمباربونی مل کەچە و ڕازییە بەوەی خوا

[1] أخرجه البخاري برقم (١٣٠٣) و مسلم برقم (٢٣١٥).

هەڵی بژاردوە، خەم و پەژارە لە ڕەزامەندی و ئیمانی دەرنەهێنا.

بڕوانە وێنەیەکی تری ئارام نەگرتن لەکاتی مردنی منداڵ دا، کەئەنەسی کوڕی مالك ﷺ دەگێڕێتەوە، کەوا پێغەمبەر ﷺ بەلای ئافرەتێکەوە تێپەڕی لە لای گۆڕێك دەگریا، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمو: (لە خوا بترسە و ئارام بگرە)، ئافرەتەکە گوتی: لێم گەڕێ ئەوەی من توشم بوە، تۆ توشی نەبوی، ئافرەتەکە نەیدەزانی ئەوە پێغەمبەرە، جا بە ئافرەتەکەیان گوت: ئەوە پێغەمبەر بو ﷺ، جا ئافرەتەکە چوە بەردەرگای پێغەمبەرﷺو دەرگاوانی لێ نەبو بە پێغەمبەری گوت: من تۆم نەناسی کە پێغەمبەری، پێغەمبەریش ﷺ فەرموی: ((إِنَّمَا الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الْأُولَى: بەڕاستی ئارام گرتن لە سەرەتای بەند و موسیبەتەوەیە.))[1]

خوای گەورە بەبەردەوامی بەندەکانی بەنەخۆش بون و مردنی منداڵەکانی تاقی دەکاتەوە و بۆ دەرکەوتنی ڕادەی زاڵ بونی خۆشەویستی خوا بەسەر خۆشویستنی کەسانی تر لە دڵیاندا، جا گەر تاقیکردنەوەکەیان بەسەرکەوتویی بڕی، ئەوا لە خوای گەورە زیاتر نزیك دەبێتەوە و بەخشین و ڕەزامەندی خوا بەدەست دێنێ.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((ما يزال البلاء بالمؤمن و المؤمنة في نفسه و ولده و ماله، حتى يلقى الله وما عليه من خطيئة: هەردەم بەلا و ناخۆشی و موسیبەت بەسەر بڕواداری پیاو و ژن دادەبەزی، لە خودی خۆیی و منداڵەکەیی و ماڵ و سامانی، هەتا بەخوای گەورە دەگات کە بەهۆی ئەم بەلایە گوناهی لەسەر نامێنێ.))[2]

هەروەها ﷺ دەفەرموێ: ((مَا مِنَ النَّاسِ مُسْلِمٌ يَمُوتُ لَهُ ثَلَاثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ لَمْ يَبْلُغُوا الْحِنْثَ إِلَّا أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ إِيَّاهُمْ: هەر مسوڵمانێك سێ

---

[1] أخرجه البخاري برقم (١٢٥٢) و مسلم برقم (٩٢٦).
[2] أخرجه الترمذي برقم (٢٤٠١).

منداڵی بمرێ کە باڵغ نەبوبن، ئەوا خوای گەورە بە هۆی چاکەی بەبەزەیی بون لەگەڵیان دەیباتە بەهەشت.))[1]

لە کۆتاییدا: دەبێ جەخت لەسەر ئەوە بکرێتەوە، کە لەسەر دایك و باوکانە پردێك لە خۆشەویستی و سۆز لە نێوان منداڵەکانیان دروست بکەن. چونکە ئەمە یاریدەی زۆریان دەدات لەپرۆسەی پەروەردەیی، هەروا یاریدەی منداڵان دەدات لە وەرگرتنی ڕا و ئاڕاستەکانی باوکان و فراژوبون و پێگەیشتنی کەسایەتیان بە شێوەیەکی ڕاست و دروست دور لە گرێ دەرونیەکان، کە ڕەنگە ببێتە لەمپەر و کۆسپ لەبەردەم هاتنە ناوەوەی منداڵ بۆ ناو کۆمەڵگە و، هەڵس و کەوت کردن لە گەڵیان بەشێوەیەکی یەکسانی و دروست.

هەروەها ئەرکی دایك و باوکانە، کە زۆر ئاگادار بن لە هەڵس و کەوتیان لەگەڵ منداڵاندا لە سۆز و بەزەیی و نواندندا زێدە ڕۆیی نەکەن،چونکە ئەو کارە ئاکام و ئەنجامی بە پێچەوانەی لێ دەکەوێتەوە وەك دواکەوتنی پێگەیشتنی دەرونی و کۆمەڵایەتی منداڵان و نەتوانینیان لە هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ کۆمەڵگە بەشێوەیەکی سەربەخۆ، هەروا دارمانی پردی متمانە و وەرگرتن لە نێوان باوکان و منداڵان.

---

[1] أخرجه البخاري برقم (١٢٤٨).

## پێشەنگی باش (القدوة الحسنة)

پێداویستی خەڵك بەپێشەنگی باش، لــە غەریزەکەیــەوە هــەڵقوڵاوە کـە لــە دەرونی گشت ئادەمیزادێك حەشاردراوە، کە بریتی‌یە لە لاســایی کردنــەوە، کــە ئارەزویەکی پێداگیرە، کە منداڵ و لاواز و دار و دەستە پاڵدەنێ لاسایی ڕەفتاری پیاو و بەهێز و سەرۆك بکەنەوە، هەروەها غەریزەی مل کــەچ بــون لــە کــەرتدا گشت تاکەکانی پاڵدەنێ بۆ شوێنکەوتنی سەرکردەکەی و شوێن پێ هەڵگرتنی.[1]

پێشەنگی و لاسایی‌کردنەوە لەلای منداڵ لەسەر بونی ئارەزوە سروشــتیەکەی دەوەســتێ لــە لاســایی‌کردنەوە و بەپێشــەنگ دانــانی ئــەو کەســەی کــە پــێی موعجەبە لە شێوازی قســەکردنی و شــێوازی جوڵانــەوە و هــەڵس و کــەوتی و، ڕەفتار و نەریتەکانی، لەبەر ئەوە شتێکی ترسناکە خراپە لە ڕەفتــاری پێشــەنگ ببینرێ، چونکە بەم ڕەفتارە، هەر کەسێك لاســایی بکاتــەوە؛ ئــەوا گوناهەکــەی هەڵدەگرێ.

ئەو پێشەنگی‌یە باشەی کە کوڕ و کچ لــە دایــك و بــاوکی و کــەس و کــاری دەبینێ؛ گرنگرتین ئامرازە لە ئامرازەکانی پەروەردەی کوڕ و کچان، چونکە کــوڕ و کچ بەتایبەتی منداڵ زۆر مکوڕ دەبێ لەســەر چاودێری کردنــی دەوروبــەری و لاسایی کردنەوەی ئەو ڕەفتارانەی، کــە لــە دایــك و بــاوکی و لــە کەســانی تــر دەردەچێ، کە لە لای ئەوەوە بەنمونە دادەنرێ.

لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر دایك و باوك زۆر مکوڕ بن لەسەر پیشان نــەدانی ڕەفتاری ناشیرین لەبەردەمی منداڵەکانیان، بەڵکــە ڕەفتــار و ڕەوشــتی جــوان و پەسندیان پێشان بدەن، لەسەریانە بزانن، کە منــداڵ لەبــەردەمی ئــەواندا وەکــو ئامێرێکی وێنەگرتنی ســینەمایی‌یە، کــە جوڵــە و ڕەفتارەکــان وێنــە دەگــرێ و

[1] أصول التربية الاسلامية و أساليبها، ص٢٥٧.

دەنگ تۆمار دەکات، پاشان هێندەی پێ ناچێ هەمان ڕەفتار و وشە لەبەردەم دایك و باوکی، یان کە لەوێ نابن دوبارە دەکاتەوە.

خوای گەورەش ئاماژەی کردوە بەگرنگی پێشەنگیی لە پەروەردەی منداڵاندا وەك دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا: ئەوانەی کە دەڵێن پەروەردگارمان لە هاوسەرەکانمان و وەچەکانمان ڕوناییچاومان پێ ببەخشە، بشمانکە پێشەوای لەخوا ترسانان.﴾الفرقان/٧٤.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگاداری ئادەمیزادی بەگشتی کردۆتەوە بەوەی، هەر کەسێك کاریگەر بێ بەرەفتاری کەسانی تر، ئەوا لە ئاکامی لاسایی کردنەوەکەی هەڵدەگرێ جا بەچاکە بێ یان خراپە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((مَنْ سَنَّ فِي الإِسْلَامِ سُنَّةً حَسَنَةً فَلَهُ أَجْرُهَا وَأَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا إلى يوم القيامة مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْءٌ، وَمَنْ سَنَّ فِي الإِسْلَامِ سُنَّةً سَيِّئَةً كَانَ عَلَيْهِ وِزْرُهَا وَوِزْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا إلى يوم القيامة مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْءٌ: هەر کەسێك ڕێ و شوێنێکی باش لە ئیسلام دابنێ، ئەوا پاداشتی بۆ هەیە و پاداشتی ئەوەشی بۆ هەیە، کە کاری پێ دەکات هەتا ڕۆژی قیامەت، بێ ئەوەی هیچ لە پاداشتیان کەم ببێتەوە، هەر کەسێکیش ڕێ و شوێنێکی خراپ لە ئیسلام دابنێ، ئەوا گوناهەکەی و گوناهی ئەوانەی کاری پێ دەکەن هەتا ڕۆژی قیامەتی بۆ دەنوسرێ، بێ ئەوەی هیچ لە گوناهیان کەم ببێتەوە.))[1]

پێغەمبەر ﷺ لە زۆر هەڵوێست دا ئاگاداری لەم دیاردەیەی داوە، بە تایبەتی لە لای منداڵاندا.

لە نمونەی ئەمەشدا وەك فەرمویەتی ﷺ: ((أحبّوا الصبيان وأرحموهم، وإذا

[1] أخرجه مسلم برقم (١٠١٧).

وعدتموهم فوفوا، فإنهم لا يرون إلا أنكم ترزقونهم: منداڵانتـان خـۆش بـوێ و لەگەڵیان بەبەزەیی بن، گـەر بـەڵێنتان پێـدان بـەجێی بـهێنن، چونکـە ئـەوان وادەبینن کە ئێوە رۆزیان دەدەنێ.))[1]

لە عبداللەی کوڕی عامر ﷺ گێڕڕاوەتەوە ، کە گوتویەتی: "رۆژێـك دایکـم بانگی کردم و پێغەمبەری خوا ﷺ لەماڵمان دانیشـتبو، گوتـی: وەرە شـتێکت بدەمێ، پێغەمبەر بە ئافرەتەکـەی فـەرمو: (نەتویسـت شـتی پـێ ببەخشـی؟) ئافرەتەکە گوتی: ویستم خورمای بدەمێ. جا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمو: ((أَمَـا إِنَّكِ لَوْ لَمْ تُعْطِهِ شَيْئًا كُتِبَتْ عَلَيْكِ كِذْبَةٌ: گەر شتێکت نەدابایـە، ئـەوا بـەدرۆ لەسەرت دەنوسرا.))[2] .

لەم دو فەرمودەیەی پێشو تێبینی ئـەوە دەکـەین، کـە ئاگـاداری و وریـایی پێغەمبەر ﷺ ی تێدایە بۆ دایك و باوکان، کە ڕەفتاری وا نەکەن منداڵـەکانیان متمانەیان پێ نەمێنێ، کە بەهۆیـەوە کـرداری ئاڕاسـتە و ڕێنمـایی کردنیـان و وەرگرتنی لە لایەن منداڵانەوە زۆر زەحمەت بێ. لەبەر ئەوە لەسەر دایك و باوك پێویستە زۆر سور بن، کە نەهێڵن منداڵان بەرامبەریان بێ متمانە بن.

گوێم لە مامۆستام شێخ ڕەمەزان دیب بوو (خوا بیپارێزێ) کە گوتی: جارێك بە کوڕەکەم گوت، گەر (جوزئی عمّ) لەبەر بکەی پایسکلێکت بـۆ دەکـڕم، گـەر (دە) جوزئت لەبەر کرد ماتۆڕێکت بۆ دەکڕم، گەر هـەمو قورئـانت لەبـەر کـرد ئۆتۆمبیلێکت بۆ دەکڕم، جا کوڕەکە لە خۆشیا چوە لای شێخ ئەحمـەد کفتـارۆ و پێی گوت: شێخ ڕەمەزان ئەم بەڵێنەی پێداوە، شێخ ئەحمەد گوتی: ئەرێ ڕاسـتە تۆ بەڵێنت بەکوڕەکـەت بەمـە و بەمـە داوە؟ گوتـی: بـەڵێ، پـێی گـوت: جـا بەڕاستی دەتوانی ئەوەی بەڵێنت پێداوە بۆی بکڕی؟ گوتی: نەخێر، شێخ ئەحمـەد گوتی: نەکەی بەڵێن بە کوڕەکەت بدەی، کە ناتوانی بەجێی بێنی، چونکە بەمـە

[1] أخرجه الطحاوي.
[2] أخرجه أبوداود برقم (٤٩٩١).

متمانەی پێت نامێنێ.

ئەوەی جێی تێبینی‌یە حەزکردن بەلاسایی‌کردنەوە لەلای منداڵ، هەر لە سەرەتای ساڵی یەکەمی تەمەنی منداڵەوە دەست پێ دەکات، کە لە جوڵانەوە و رۆیشتن و دانیشتن و تەماشاکردنی بەدەردەکەوێ و لەگەڵی گەشە دەکات، لەکاتی زمان کردنەوەی وەکو توتی ئەو وشانەی کە لە دەوروبەری گوێ بیستی دەبێ دەیلێتەوە، با لە ماناکەشی تێ نەگات، جا لەگەڵ گەشەکردن و پێگەیشتنیدا ئەم رەفتارەی لەلا دەچەسپێ، جا نمونەیەکی دیاریکراو لە خێزانی و ناسیاوەکانی بۆ خۆی هەڵدەبژێرێ و بە تەواوی هەوڵی لاسایی‌کردنەوەیان دەکاتەوە.

لەم قۆناغەدا کوڕ حەز بەوە دەکات، باوکی بکاتە پێشەنگی خۆی، کچیش حەز دەکات، دایکی بکاتە پێشەنگی خۆی.

لەگەڵ سەرەتای هەرزەکاری (مراهقة) و لاوێتی دا منداڵان لە دەرەوەی خێزان دا، بەدوای پێشەنگی‌یەکی گەورەتر دا دەگەڕێن، پێشەنگی‌یەك ئەو سیفەتانەی تێدا بەرجەستە بێ، کە ئەوان حەزی پێدەکەن و خەون بە بەدیهێنانی دەبینن.

لەبەر ئەوە دەبینین ئەو منداڵانەی هەڵیان بۆ نەڕەخساوە لە لایەن کەس و کاریانەوە ئاڕاستە و ڕێنمایی بکرێن، پاڵەوانانی سینەما و وەرزش و گۆرانی بێژە بەناوبانگەکان دەکەنە نمونە و پێشەنگی ژیانیان.

بەڵام گەر دایك و باوك توانیان ئاگاداری ئەم لایەنە بن، ئەوا لەسەریان پێویستە ئەم فیترەتە تێر بکەن بە ئاراستەکردنی منداڵان کەوا کەسایەتیە ئیسلامیە گەورەکان بکەن بە پێشەنگی خۆیان، لەسەروی هەمویانەوە سەروەری بونەوەر محمد ﷺ.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ: بێگومان پێغەمبەری خوا سەرمەشقی چاکە بۆ ئێوە﴾الاحزاب/٢١.

ئەم پێشەنگیەش بەوە دێتە دی کەوا منداڵان ئاراستە بکرێن، بایەخ بەم کەسایەتیانە بدەن ، هەروا کڕینی پەرتوك و ئەو چیرۆکانەی کەباسیان لێوە دەکات، بەتایبەتی پەرتوکەکانی ژیاننامەی پێغەمبەر و ژیانی هاوەڵە بەڕێزەکان (ڕەزای خوایان لێبێ)، جا ئەو کاتە منداڵان لەسەر خۆشویستنیان و موعجەب بون پێیان پێدەگەن و هەوڵی چاولێکردنی ڕەفتارەکانیان دەدەن.

لەسەر باوکە کە بەباشی لە کەسایەتی و ئارەزووەکانی کوڕەکەی، یان کچەکەی تێبگات، هەروا لە پێشەنگی‌یەك بگەڕێ کە لەگەڵ ئەم کەسایەتی و ئارەزوانە دا بگونجێ.

هەروەها لەسەر دایك و باوکە کە سور بن لەسەر ئەوەی پێشەنگی‌یەکی باش بنوێنن، کە منداڵ ڕەفتاری باش و ڕەوشتی بەبەهای لێ وەربگرێ، بشزانێ کە منداڵەکانی زۆر سورن لەسەر چاودێری‌کردنی و وەرگرتنی ئەو کارەی ئەنجامی دەدات و لەبەردەمیان ڕەفتاری پێ دەکات.

سەبارەت بە چاولێکردنی منداڵان بۆ گەوران و چاودێری کردنیان و سوربونیان لەسەر لاسایی کردنەوەیان، هەواڵی یاوەران و پێشینە (سلف) (ڕەزای خوایان لێبێ) وێنەی زۆر هاتوە.

لە ئیبن عەباسەوە گێڕراوەتەوە ﷺ کە گوتویەتی: (شەوێك لەلای مەیمونەی پورم[1] مامەوە، جا پێغەمبەر ﷺ هەڵسا و لە مەشکەیەك کە هەڵواسرا بو دەستنوێژێکی سوکی هەڵگرت، پاشان نوێژی کرد، منیش وەکو ئەو دەست نوێژم هەڵگرت، پاشان لەلای چەپیەوە وەستام، جا پێغەمبەر ﷺ منی هێنایە لای ڕاستیەوە، پاشان چەندی حەز کرد نوێژی کرد)[2] .

لە عبداللەی کوڕی ئەبی بەکرەوە ﷺ گێڕراوەتەوە کە گوتویەتی: (بەباوکم گوت: باوکە هەمو ڕۆژ گوێم لێتە دەڵێی: (**اللَّهُمَّ عَافِنِي فِي سَمْعِي، اللَّهُمَّ**

---

[1] خوشکی دایکی.
[2] أخرجه البخاري برقم (٧٢٦).

عَافِنِي فِي بَصَرِي، لَا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ) سێ جاریش دوبارەی دەکەیتەوە، سبەینان و، ئێواران، ئەویش گوتی: گوێ بیستی پێغەمبەری خوا ﷺ بوم، کە ئەم دوعایەی دەخوێند، منیش حەزدەکەم سوننەتی ئەو جێبەجێ بکەم.

جا سەرنج بدە چۆن ئیبن عەباس ﷺ مکوڕ بوە لەسەر چاودێری کردنی پێغەمبەر ﷺ و چاولێکردنی کردارەکەی بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ داوای ئەنجامدانی لێ بکات، هەروا چۆن عبداللە چاودێری باوکی دەکرد و ویردەکانی لەبەر، دەکرد بۆ ئەوەی باوکی فەرمانی ئەنجامدانی پێ بکات.

بۆ زیادە دڵنیابون لە کاریگەری پێشەنگ لە ڕەفتاری منداڵاندا، ئەم سەربردەیە لەسەر زمانی یەکێ لە جگەرە کێشانت بۆ باس دەکەین، کە دەڵێ: (توشی بەڵای جگەرە کێشان ببوم، منداڵێکم هەبو تەمەنی چوار ساڵ بو، بەیانیەکی ڕەمەزان، دوای ئەوەی پاکەتی جگەرەم لە نزیک پێخەفم دانابو، نوێژی بەیانیم کرد و نوستم، کاتێك بە دەنگی هاوسەرەکەم لە خەو هەڵسام، کە بەگوێم چرپاندی بچمە چێشتخانە و تەماشای کوڕەکەم بکەم، منیش چوم بینیم جگەرەی داگیرساندوە و بەدەمیەوە دەکات، کە لێیم پرسی بۆچی جگەرە دەکێشی؟ پێی گوتم: باوکە وەك تۆ دەکەم)[1].

هەمومان دەبینین چۆن منداڵە بچوکەکەی لەبەردەمی دەوەستێ و کردەوەکانی لاسایی دەکاتەوە لەو کاتەی نوێژ دەکات یان قورئان دەخوێنێ یان شتی تر.

هەر یەکێك لە ئێمە دەبینێ چۆن منداڵەکەی لەبەر دەمی دەوەستێ و لاسایی کردەوەکانی دەکاتەوە، لەو کاتەی نوێژ دەکات، یان قورئان دەخوێنێ یان شتی تر دەکات، هەروەها شتێکی سود بەخشە وریایی بدرێ بۆ ئەوەی باوکان سوربن لەسەر ئەوەی منداڵەکانیان لەگەڵ خۆیان نەبەنە ئەو ماڵە خزم و هاوڕێیانەی کە پیشەنگی باش نین بۆیان، ئەمەش بۆ سوربونە لەسەر ڕەفتار

[1] دور البيت في تربية الطفل المسلم، ص٧٠.

باشیان و فیترەت پاکیان.

شتێکی جوانە لێرەدا باسی بکەین ئەویش ئەوەیە، کە هەندێ پەروەردیارانی خواناس هیچ ئامۆژگاریان نەدەدا بە پەیڕەوانیان، بەڵکە تەنها لەبەر دەمیان پێشەنگی باشیان دەنواند و خۆشەویستیان لە دڵیاندا دەڕواند، ئەمەش پاڵی دەنان بە لاسایی کردنەوەیان و پەیڕەوکردنی مەنهەجەکەیان.

لە کۆتاییدا دەڵێین: هەر ئامۆژگاریەك کە دایك و باوك ئاراستەی منداڵی دەکەن هیچ نرخی نیە، گەر ڕەفتاری ئامۆژگاری کار پێچەوانەی ئامۆژگاریەکە بو.

لەبەر ئەوە ئەبو ئەسوەدی دەئولی سەبارەت بەو پیاوەی کە ئامۆژگاری کەسانی تر دەکات و خۆی لەبیر دەکات، دەڵێ:

یـا أیـهـا الـرّجُـلُ المُعلـم غیــرهُ هَلاّ لِنَفْسِـكَ کـان ذا التعلیـمُ
إبْـدأ بِنَفْسِــكَ فانهــا عَنْ غَیِها فَـإذا انْتَهَتْ عنهُ فانتَ حکیـمُ
فهناكَ یُسـمَعُ ما تقـولُ و یُشـتَفی بِالقـولِ منـك وینفـعُ التعلیـمُ
لا تَنْهَ عن خُلُـقٍ و تَأتـي مِثْلَـهُ عـارٌ عَلَیْـكَ إذا فعلت عظیـمُ
تَصِفُ الدواء لِذي السقامِ وَ ذي الضنا کَیْـما یَصِحَّ بِهِ، وِ أنْتَ سَقیـمُ

# یاریکردن لەگەڵ منداڵان

ئارەزوی منداڵان بۆ یاریکردن؛ ئارەزویەکی سروشتی‌یە، کە خوای گەورە بۆ بەجێ هێنانی زۆر پێویستی تیایاندا دروستی کردوە کە تەنها لەمیانەی یاریکردن دەستەبەر دەکرێ.

ئارەزو نەکردنی منداڵیش بۆ جوڵە و یاریکردن و خۆ دورە پەرێز کردن لە کەسانی تر و ئارەزو کردنی بۆ جوڵە نەکردن دیاردەیەکی نەخۆشی‌یە. جا چ بەهۆی ئەندامی‌یەوە بێ، یان دەرونی بێ، کەواتە لەسەر دایك و باوکە گەر هەستیان بەم دیاردەیە کرد، پەلە بکەن لە توێژینەوەی هۆی ئەم ڕەفتارە و، چارەسەریشی بکەن.

زانایانی پەروەردە گەیشتونەتە ئەوەی، منداڵ کاتێك یاری دەکات، پێگەیشتنە هەستیەکانی و پاڵنەرەکانی زیرەکی و غەریزە دەرونیەکانی و کۆمەڵایەتیەکانی گەشە پێدەکات[1].

سەرەڕای ئەوەی یاریکردن بۆ گەوران ئامرازێکە بۆ پڕکردنەوەی کاتی بەتاڵی، بەڵام بۆ منداڵ بریتی‌یە لە کارێکی زۆر گرنگ، جا لەمیانەی ڕۆچون لەیاریکردندا، منداڵ پەرە بە هەریەك لە ژیری و جەستەیی دەدات و تەواوکاری لە نێوان ئەرکە کۆمەڵایەتی و هەڵچون و ژیریەکانی بەدی دەهێنێ کە پێك دێ لە بیرکردنەوە و دادوەریەکانی ژیری و چارەسەری گرفتەکان و بەپەلە خەیاڵ کردن، هەروا ژینگەی سروشتی و ئاراستەی باوکان؛ لەمیانەی یاریکردندا ڕۆڵی حەسم کەر دەبینێ.

ماوەی پێش چونە قوتابخانەش؛ لەمیانەی یاریکردندا ماوەیەکی زۆر گرنگە بۆ گەشەکردنی ژیری منداڵ کە پێی دەگاتە ئەوپەڕی وزەکانی پێگەیشتن.

[1] علم التربية و سيكولوجية الطفل، ص١٩٧.

هەروەها لەمیانەی یاریکردندا؛ منداڵ شارەزاییەکانی پێشوی دوبارە دەکاتەوە هەتا بتوانێ وەری بگرێ و ببێتە بەشێك لە کەسایەتیەکەی. هەروا یاریکردن منداڵ ئامادە دەکات بۆ ڕاهاتن لە ئاییندە ئەویش لەمیانەی وەڵام دانەوە نوێیەکانەوە دەبێت، کە کاتی یاریکردنی پێی هەڵدەستێ، لەبەر ئەوە یاریکردن لەلای منداڵ بەوە تەماشا ناکرێ، کە کات بەفیرۆدان بێ، بەڵام لەسەر بنەڕەتێك کە یاریکردن پێویستی گەشە کردنی منداڵە.

ئەو باوکانەی منداڵەکانیان بێبەش دەکەن لەیاریکردن لەماڵدا، یان لەگەڵ منداڵانی دراوسێکان دا؛ ئەوا منداڵەکانیان بێبەش دەکەن لە پێویستیە بنەڕەتیەکانی گەشەکردن[1].

دکتۆر محي الدين تۆق[2] باسی کردوە، کە یاریکردن چەندەها سود و بەهای هەیە، کە لەبەر گرنگی‌یەکەی وەکو یاریدەدانێك بەکاری دەهێنین، چەند شتێکی پێویستی تریشی بۆ زیاد دەکەین:

١-بەهای جەستەیی: یاریکردنی چالاکانە پێویستە بۆ گەشەکردنی ماسولکەکانی منداڵ، هەروا پێویستە بۆ بزواندنی سوڕی خوێن و بەجێ هێنانی ئەرکەکانی ئەندامەکانی لەش بەشێوەیەکی ڕاست و دروست.

٢-بەهای پەروەردەیی و فێرکردن: یاریکردن بوار لەبەردەم منداڵ خۆش دەکات، تاوەکو لەمیانەی کەل و پەلە جیاجیاکانی یاریکردن شتی زۆر فێر بێت، وەك ئاشنابونی منداڵ بەشێوە جۆراوجۆرەکان و ڕەنگەکان و قەبارەکان و جل و بەرگ، هەروا منداڵ لەمیانەی یاریکردندا چەند زانیاری و کارامەییێك دەستەبەر دەکات، کە ناتوانێ لەسەرچاوەی تر دەستەبەری بکات.

٣-بەهای کۆمەڵایەتی: منداڵ لەمیانەی یاریکردندا فێری چۆنیەتی دروستکردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەگەڵ کەسانی تر دەکات، هەروا چۆن

---

[1] منهج التربية النبوية للطفل، ص٢١٥.
[2] منهج التربية النبوية للطفل، ص٢١٦.

بەسەرکەوتویی هەڵس و کەوتیان لەگەڵدا بکات، هەروەها لە یاریەکەیدا هەڵدەستێ بە بەجێهێنانی چەندەها رۆڵی کۆمەڵایەتی، کە یاریدەی دەدات لە تێگەیشتنی سروشتی هەمو ڕۆڵێك لە کۆمەڵگەدا، ئامادەشی دەکات کە لە ئایندەدا سەرکەوتو بێ لە بەجێهێنانی ئەرکە کۆمەڵایەتیەکەی، هەروەها فێری بەخشین و وەرگرتن و ژیانی هاریکاری دەبێت.

٤-بەهای ڕەوشتیی: منداڵ لەمیانەی یاریکردن دا فێری چەمکەکانی چەوت و راست دەبێت، هەروەها فێری کەمێك لە چەمکەکانی دادگەری و ڕاست گۆیی و دەستپاکی و خۆڕاگری و وازهێنان لە خۆپەرستی دەبێت، لەپێناو یاریکردن لەگەڵ کۆمەڵەکەدا، هەروا فێری گیانی وەرزشی لێبوردەیی دەبێت.

٥-بەهای داهێنان: منداڵ لەمیانەی یاریکردن دا توانای زۆری دروست کردن و پێکهێنان و کۆکردنەوە و بەئەزمون کردنی بیرۆکە روتەکانی بۆ ئاشکرا دەبێت.

٦-بەهای خودی (الذاتي): منداڵ لە ڕێی یاریکردندا زۆر شت دەربارەی خۆی بۆ ئاشکرا دەبێت، وەك زانینی توانستەکانی و کارامەیی و لێزانینی و ئارەزوەکانی، ئەمەش لەمیانەی هەڵس و کەوت کردنی لەگەڵ ئەوانەی بەشداری یاریکردنەکە دەکەن و خۆی پێیان بەراورد دەکات. هەروەها لەمیانەی گرفتەکانیەوە فێری شت دەبێت و چۆنیش لە گرفتەکانی دەرباز دەبێت.

٧-بەهای چارەسەری دەرونی: یاریکردن ڕۆڵێکی گەورە دەبینێ لە چارەسەرکردنی نەخۆشی و قەیرانە دەرونیەکان و، نەهێشتنی ڕودانی بەر لە هەبونی، چونکە منداڵ لەڕێی یاریکردنەوە دەتوانێ شڵەژانی دەرونی لەخۆی لاببات، کە لەو کۆتە جیاجیایانە پەیدا بوە، کە بەسەری دا دەسەپێنرێ، لەبەر ئەوە دەبینین ئەو منداڵانەی لە ماڵێك دەژین، کە کۆت و فەرمان کردن و قەدەغەکردنی تێدایە؛ زۆرتر لە منداڵانی تر یاری دەکەن. هەروا یاریکردن

باشترین هۆیەکانی لابردنی دوژمنی خەفەکراوە، کە لەلای منداڵ هەیە.

هەمو ئەوانەی کە باس کرا گرنگیەتی یاریکردنی منداڵان و ڕۆڵی گرنگیمان بۆ دەردەکەوێ لە لایەنە جیاجیاکانی ژیانیاندا. لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر باوکان سوربن لەسەر دانانی کاتی تایبەت و شوێنی گونجاو بۆ یاریکردنی منداڵان، هەروا سازدانی یاری گونجاو کە لەگەڵ تەمەن و توانستەکانیان بسازێ.

لەبەر ئەوە لە پێغەمبەر ﷺ گێڕراوەتەوە کە فەرمویەتی: ((إلهوا والعبوا، فإني أكره أن يرى في دينكم غلظة: گاڵتە و گەپ و یاری بکەن، چونکە حەزناکەم ئاینەکەتان بەتوندی و تیژی ببینرێ.))[1]

گومانی تێدا نیە کە بەرهەمی چاوەڕوانکراو لەیاریکردنی منداڵاندا پەیوەندیەکی توندی بەهەڵبژاردنی ئەو یاریانەی، کە دەبێتە مایەی بەرزکردنەوەی ئاستی فیکری و کۆمەڵایەتی منداڵ، هەروا کارامەیی و لێزانی نوێی بۆ بەدەست دەهێنێ.

لەسەر دایك و باوکە ئاگادار بن، کە پێویستی کچان بۆ یاریکردن جیاوازی هەیە لە پێویستی کوڕان؛ کچان بەسروشتی خۆیان ئارەزوی ئەو یاریانە دەکەن، کە ئامادەی ژیانی خێزانیان دەکەن و ڕۆڵی دایکایەتی دەبینن، وەك بایەخ دان بەبوکە شوشە و کەل و پەلەکانی و پێداویستیەکانی ماڵ ، کوڕانیش ئارەزوی یاریەکانی پێکەوەنان (تركيب) و خانو دروست کردن و جەنگ و شار دروست کردن و کڕین و فرۆشتن دەکەن.

زانایانی مسوڵمانان لە زۆر شوێن جەختیان کردوە لەسەر گرنگیەتی یاریکردن و وەرزش بۆ منداڵان، نمونەی ئەمەش وتەی ئیبن مسکویە، کە لە کتێبی (تهذيب الاخلاق)دا گوتویەتی:

(پێویستە لە هەندێ کاتدا ڕێ بەکوڕ بدرێ چەند یاریەکی جوان بکات کە بحەسێتەوە لە ماندویەتی پەروەردە، یاریەکەش ئازار و ماندویونی زۆری نەبێ،

[1] اخرجه البيهقي في "الشعب" برقم (٦٥٤٢).

که بوه خورتێکی خورت[1] ، ئەوا کوڕەکە لەسەر ڕۆیشتن و جوڵـەکردن و وەرزش و پاشان سواربونی ئەسپ رادەهێنرێ).

ئیمـام غـەزالی دەڵـێ: (ڕێگریکردنـی منـداڵ لــە یـاریکردن و هــەردەم ماندوکردنی بەفێرکردن، دڵی دەمرێ و زیرەکی ناهێڵێ و ژیانی لێ تـاڵ دەکـات هەتا وای لێ دێ فێڵ دەدۆزێتەوە بۆ ئەوەی لێی دەرباز بێ)[2].

یەکەم هۆی سوربونی زانایانی مسوڵمانان لەسەر پێدانی منداڵان بە بەشێکی پێویست بـۆ یـاریکردن ئەوەیـە، کـە پێغەمبــەر ﷺ هـانی منداڵانــی داوە بــە یاریکردن، لەزۆر شوێنیش بڕیاری لەسەر داوە.

لە خاتو عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) که فەرمویەتی: ((كُنْـــتُ أَلْعَـــبُ بِالْبَنَات عِندَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَكَانَتْ تَأتِينِي صَوَاحِبِي، فَيَعَمَّقْنَ مِـــنْ رَسُـــولَ اللَّهِ، وَكَانَ يُسَرِّبُهُنَّ إِلَيَّ فَيَلْعَبْنَ مَعِي: لەلای پێغەمبــەری خـوا یـاریم بـە بوکـە شوشەکانم دەکرد و هاوڕێکانم دەهاتنە لام و لەبەر پێغەمبەری خـوا دەڕۆیشـتن و بەدوامیاندا دەنارد و لەگەڵم دا یاریان دەکرد.))[3]

هەروا پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((عرامة الصبي في صغره زيادة في عقلـــه في كـبره: زیـادە یـاریکردنی منـداڵ لـە بچوکیـەوە، زیـادکردنی ژیریـەتی لـە گەورەییدا.))[4]

## ڕۆڵی باوکان لەیاریکردن لەگەڵ منداڵاندا:

باوکان ڕۆڵێکی زۆر گەورە دەبینن لە یاریکردنی منداڵاندا، لە پێشەوە باسمان کرد، کە چـۆن ئـەرکی باوکانــە هەڵسـن بـەدانانی کـات و شـوێنی گونجـاو بـۆ

[1] خورت: توانا، بەهێز، بە قەوەت.
[2] إحياء علوم الدين ج٣/٧٣.
[3] أخرجه البخاري برقم (٦١٣٠) و مسلم برقم (٤٩٣١).
[4] أخرجه الحكيم في نور "نوادر الاصول" برقم (١٠١٥).

یاریکردنی منداڵان و یاری گونجاویان بۆ هەڵبژێرن. هەروا لە ئەرکی باوکانە گەر بەشێکی بچوکیـــش بـێ لـەکاتی خۆیـان تـەرخان بکـەن بـۆ یـاریکردن لەگـەڵ منداڵەکانیان، چونکە ئەم بەشداری کردنەی نێوان باوکان و منداڵان سودی زۆری هەیە، کە گرنگترینیان باس دەکەین و بریتین لە:

١-بەشـداری کردنـی باوکـان لـە یـاریکردنی منداڵـەکانیان؛ باوکـان نزیـك دەکاتەوە لە منداڵان، خۆشەویستی منداڵان بۆیان زیاد دەبێت، ئەمەش بـەزۆری یاریدەدەر دەبێت بۆ وەرگرتنی ئاڕاستەکان و ئامۆژگاریەکانیان.

٢-یاریکردنی باوکان لەگەڵ منداڵان رێگە خـۆش دەکـات بـۆ باوکـان، کـە ئاشنا بن بە بیرۆکەکانی منداڵان، هـەروا لەمیانـەی یاریکردنـەوە بەشـێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەتوانن ئاڕاستەیان بکەن.

٣-یاریکردنی باوکان لەگـەڵ منـداڵان؛ وا لـە باوکـان دەکـات ئارەزوەکـانی منداڵان بدۆزنەوە، کە ئەمەش یاریدەی زۆریان دەدات بۆ ئەوەی لە ئاییندەیـاندا رێگای گونجاویان بۆ هەڵبژێرن.

٤-هەروەها بەیاریکردنی گەوران لەگەڵ منداڵاندا، منداڵان هەست بە بەهای کەسایەتیان دەکەن و متمانە بەخۆیان زیاد دەکات.

سەبارەت بە یاریکردنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ منداڵان، وێنەی زۆر هەیە، کە بەڵگەی گرنگیدانی پێغەمبەرە بەم کارە، وەك:

لە ئەبو ئەیوبی ئەنساری ﷺ گێڕراوەتەوە کــە گوتویــەتی: چومــە خزمــەت پێغەمبەری خوا ﷺ و حەسەن و حوسەین لەبەردەمی، یان لە ژوورەکەی یاریان دەکرد، لە گێڕانەوەیەکی تردا لە ســەر سـکی یاریـان دەکـرد، جـا گـوتم: ئـەی پێغەمبەری خوا خۆشت دەوێن؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((وكيف لا أحبـــهما، وهما ريحانتاي من الدنيا أشمهما: چۆن خۆشم ناوێن، ئەوانە لە دنیا رەیحانی منـن بۆنیان دەکەم))[1].

[1] اخرجه الهيثمي في "مجمع الزوائد"ج٩/١٨١.

له عومەری کوڕی خەتتابەوە ﷺ گێڕڕاوەتـەوە کـە گوتویـەتی: حەسـەن و حوسەینم لەسەر شانی پێغەمبەری خوا ﷺ بینـی، گـوتم: باشـترین سـواری لـە ژێرتانە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: "ئەوانیش باشترین سوارچاکن"[1].

له جابرەوە ﷺ گێڕڕاوەتەوە کە گوتویەتی: لەگەڵ پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـۆ خواردن بانگ کراین، حوسـەینیش لـەرێگا لەگـەڵ منـداڵان یـاری دەکـرد، جـا پێغەمبەر ﷺ لەبەردەمی خەڵکەکە پەلەی کرد و پاشان دەستی کـردەوە و لـێرە و لەوێ ڕای دەکرد. پێغەمبەری خـوا ﷺ بـە پێکـەنینی دەهێنـا هـەتا گرتـی دەستێکی خستە ژێر چەناگەی و ئەوی تریش لـە نێـوان سـەری و گوێیـەکانی، پاشان لە ئامێزی گرت و ماچی کرد، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((حسـين مني وأنا منه، أحب الله من أحبهما، الحسن و الحسين سبطان من الاسـباط: حوسەین لەمنە و منیش لەوم، خوا ئەو کەسەی خۆش بوێ، کـە ئـەوانی خـۆش دەوێ، حەسەن و حوسەین لە چاکە و خەیردا ئوممەتێکن لە ئوممەتەکان.))[2]

تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی نوێژدا لـە یـاری و گەمـەی منـداڵان هەراسان نەدەبو.

بەرائی کوڕی عازب ﷺ گێڕاویەتیـەوە و گوتویـەتی: پێغەمبـەری خـوا ﷺ نوێژی دەکرد، جا حەسەن و حوسەین، یان یەکێکیان (ڕەزای خوای لێبـێ) هـات و سواری سەر پشتی بو، فەرموی: ((نعم المطـية مطيتكمـا: باشـترین سـواری سواریەکەتانە.))[3]

له ئیبن مەسعود ﷺ گێڕڕاوەتـەوە، کـە گوتویـەتی: پێغەمبـەر ﷺ نوێـژی دەکرد، کە سوجدەی دەبرد حەسەن و حوسەین لەسەر پشتی بازیان دەدا، جا گەر ویستیان نەهێڵن بچنە سەر پشتی؛ پێغەمبەر ئامـاژەی بـۆ دەکـردن کـە لێیـان

---

[1] أخرجه الهيثمي في (مجمع الزوائد)ج٩/١٨٢.
[2] أخرجه الترمذي برقم (٢٧٧٥) و ابن ماجة برقم (١٤٤).
[3] أخرجه الهيثمي في مجمع الزوائد ج٩/١٨٢.

گەڕێن، کاتێ لە نوێژ تەواو بوو، هەردوکی خستە سەر ڕانی و فەرموی: ((مَــنْ أَحَبَّنِي فَلْيُحِبّ هَذَيــن: هەرکەسـێك منــی خـۆش دەوێ، بـا ئەوانەشـی خـۆش بوێ.))[1]

لە عبداللەی کوڕی شەداد ﷺ گێڕراوەتەوە، کە گوتویەتی: پێغەمبەری خـوا ﷺ نوێژیبۆ خەڵك دەکرد، کاتێك حوسەین هات پێغەمبەر ﷺ لە سوجدە دابــو سواری ملی بــو، جـا پێغەمبــەر ســوجدەکەی درێــژ کـردەوە، هــەتا خەڵکەکـە گومانیان برد، کە شتێك ڕویداوە، کاتێك لە نوێژەکە تــەواو بــوو گوتیــان: ئـەی پێغەمبەری خوا سوجدەکەت درێژ کردەوە، تا گومانمان برد کە شـتێك ڕویدابـێ، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "کوڕەکەم سواری سەر ملم بوو، منیــش حــەزم نــەکرد پەلەی لێ بکەم، هەتا پێویستی خۆی بەجێ دەهێنێ".[2]

جا لەوەی پێشو رابمێنە، کە چۆن پێغەمبــەری خـوا ﷺ مکـوڕ بـوە لەســەر یاریکردنی منداڵ و بەدیهێنانی پێویستییە سروشتیەکانیان لە پیرۆزترین کــاتی بەیەك گەیشتن و پاڕانەوە بۆ خوا، کە ئەمەش بەڵگەی گرنگــی و مەترســی ئـەم کارەیە.

جا گرنگ ئەوەیە گەوران لەکاتی یاریکردن لەگەڵ منداڵاندا؛ ئەوە بزانــن کـە لەسەریانە دابەزنە ئاستی بیرکردنەوەی منداڵان و لەگەڵ زانینە سنوردراوەکانیان و کارە سادەکان ڕێ بکەن، دەربارەی ئەمەش پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((مــن کان لە صبي فليتصاب لە: هەر کەسێ منداڵی هــەبێ، بـا خـۆی وەکـو منـداڵ لێبکات.))[3]

لە خاتو عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) گوتویەتی: ((پێغەمبــەری خـوا ﷺ لە جەنگی تەبوك یان حونەین گەڕایــەوە. لــە کۆلیتەکـەی عائیشــە پەردەیــەکی

[1] اخرجه أبو يعلى في "مسنده" برقم (٥٣٦٧).
[2] اخرجه الحاكم في "المستدرك" ج٣/١٦٦.
[3] ذكره الهندي في "كنز العمال" برقم (٤٥٤١٣).

هەبو و با هەڵی کرد، جا لایەکی پەردەکە بوکە شوشەکانی عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) بەدیار خست، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "عائیشە ئەمە چیە؟" گوتی: بوکە شوشەکانمن، جا لە نێوانیاندا ماینێکی تێدا بو کە دو باڵی هەبو. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "ئەوەی لە ناوەڕاستیان دەبینم ئەوە چیە؟" گوتی: ماینە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەوە چیە لەسەری؟ گوتی: دو باڵە، پێغەمبەرﷺ فەرموی: "ماین و باڵی هەبێ؟!" گوتی: ئەی نەتبیستوە کە سولەیمان ئەسپی باڵداری هەبوو؟ خاتو عائیشە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێکەنی، هەتا ددانەکانی بەدیارکەوت.))[1]

لە عبداللەی کوڕی حارس ﷺ گێڕراوەتەوە کە گوتویەتی: (پێغەمبەری خواﷺ عبداللە و عبیداللە و زۆر لە نەوەی عەباس (ڕەزای خوایان لێبێ) ڕیز دەکرد، ئینجا دەیفەرمو: "مَنْ سَبَقَ إِلَيَّ فَلَهُ كَذَا وَكَذَا : هەر کەسێك پێشبڕکێ بکات بۆ ئەوەی بێتە لای من ئەوا ئەوە و ئەوەی بۆ هەیە.))[2]

عبداللە گوتی: جا ئەوان پێشبڕکێیان دەکرد، کە بگەنە لای، ئەوانیش دەکەوتنە سەر پشت و سینگی پێغەمبەر، پێغەمبەریش ماچی دەکردن و لە ئامێزی دەگرتن.

جا لە ڕوانگەی ڕێبیری دابەزین بۆ ئاستی منداڵ لەکاتی یاریکردن لەگەڵیدا، یەکێ لە زانایانی پەروەردە دەڵێ: (با منداڵەکانتان گەمە لەگەڵتان نەکەن، بەڵکە ئێوە لەگەڵیاندا بکەن، منداڵەکانتان بۆ گەشت مەبەن، بەڵکە ئێوە لەگەڵیان بڕۆن)[3].

ئا بەم شێوەیە گەر باوکان فێری چۆنیەتی یاریکردن لەگەڵ منداڵەکانیان بون و بەکردەوە ئەم یاریەیان ئەنجام دا، ئەوا ئاکامێکی پەروەردەیی گەورەی دەبێت

---

[1] أخرجه أبوداود برقم (٤٩٣٢).
[2] أخرجه الهيثمي في مجمع الزوائد ج٩/٢٨٥.
[3] العقة بين الاباء و الابناء، ص١٠.

لە منداڵان دا، هەروا پەیوەندی نێوانیـان و نێـوان منداڵـەکانیان پتـەو دەبێـت، بەمەش ئاراستەکانیان لە لایان وەردەگیرێن و شایانی پەیڕەو کردن دەبێت.

بە پێچەوانەی ئەمەش، ئەو باوکانەی کە یاریکردن لەگەڵ منداڵـەکانیان بـە شتێکی هیچ و پوچ و بچوك بونەوە بۆیان دادەنێن؛ ئەوا ماوەیـەکی دور دەبینـن لە نێوانیان و لە نێوان منداڵەکانیان، کـە ئاراسـتەکانیان لـە سـەریان زەحمـەت دەبێـت، دواییـش بۆیـان ئاشـکرا دەبێـت، کـە ئـەوان زۆر لـــە کەسـایەتی و پێرۆچکەکانی منداڵەکانیان نەزان و بێ ئاگان.

# هەڵبژاردنی هاوڕێی چاك بۆ منداڵان

. ئادەمیزاد بە سروشتی خۆی و پێکهاتەکەی بونەوەرێکی کۆمەڵایەتیە، لەبەر ئەوە هەر لە منداڵیەوە سورە لەسەر پێکهێنانی تۆڕێك لە پەیوەندی هاوڕێیەتی لەگەڵ ئەو ناسیاوانەی، کە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات، ئەم مەیل و ئارەزوەش ڕەفتارێك نیە لە پەراوێزدا بێ، بەڵکە کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر ژیان و ڕەفتاری ئادەمیزاد دا.

دکتۆر عبدالحمید هاشمی چەند خاڵێکی باس کردووە، کە گرنگی چونە ناوەوەی تاك بۆناو کۆمەڵی هاوڕێیان بەدیار دەخات. جا لەبەر گرنگیەتی، بەکورتی باسی دەکەین:

١-بەدیهێنانی زۆر لەو پێداویستی‌یە سەرەتایی‌یانەی، کە بەبێ هاوکاری کۆمەڵایەتی نایەتەدی.

٢-تێرکردنی ئارەزوە دەرونیەکانی تاك، لەمیانەی هەست کردنی بە خەسانەوە و شادی و بەختەوەری، لە کۆبونەوەی لەگەڵ هاوڕێیاندا لە جەژنەکان و شادیەکان و کاتي مۆڵەتەکانی کار.

٣-بەختەوەری پێکهێنان و ژوانی هاوڕێیان و کردارەکانی نوێ کردنەوەی هاوڕێیەتی.

٤-ڕێکخستن و تاوتوێ کردنی ڕایەکانی تاك لە میانەی گوێ بیستی ڕای کەسانی تر.

٥-فێربونی کارامەیی و شارەزایی و ئەزمونەکانی ڕەفتاریی، لە ڕێگەی دیداری کەسانی ترەوە، ئەویش بە پێشەنگی و لاسایی کردنەوە و گفتوگۆکردنەوە دێتە دی.

٦-یاریدەدانی ئادەمیزاد لەسەر ناسینی هەڵەکانی و سلبیاتەکانی لەمیانەی تێکەڵاوی کردن بە کەسانی تر، چونکە ئادەمیزاد ئاوێنەی برایەکەیەتی.

٧-هاوکاری کردنی کەسانی تر بۆی لە چارەسەرکردنی گرفتەکانی لە ڕێگەی ڕاوێژکردن و یارمەتی دانی.

٨-هەست کردن بە نەفس بەرزی و بەهێزی لەمیانەی هەست کردنی تاك، کەوا ئەندامێکە لە کۆمەڵێکدا.

٩-ئاسودە بونی تاك و هەست کردنی بە هێمنی دەرونی ئەمەش لە ئاکامی هەست کردنیەتی بەوەی، کە ئەندامێکە لە جەستەی ئەو کۆمەڵگەیەی تێیدا دەژی.

١٠-بەدەستهێنانی بەهای ڕۆحی و ڕەوشتی ئادەمیزاد لە ڕێگەی کۆمەڵەوە.[1]

ئا بەم جۆرە مرۆڤ منداڵ بێ یان گەورە لە هاوڕێیانیەوە زۆر نەریت و ڕەوشت و چەمکان وەردەگرێ، هەروا کاریگەری هاوڕێ لەسەر ئادەمیزاد لە قۆناغی منداڵیەوە زیاد دەکات، لەبەر ئەوە زۆر گرنگە بەپێی توانا هاوڕێی چاك بۆ منداڵ هەڵبژێرێ.

دەربارەی ئەمە ئیمام غەزالی دەڵێ: (منداڵ قەدەغە بکرێت لەقسەی پوچ و ناشیرین و لە نەفرەت (لعنة) و جنێودان و تێکەڵ بونی ئەوانەی شتێك لەمانەی لەسەر زمان دێتە دەر، چونکە ئەوە مەحاڵە کە لە هاوڕێی خراپەوە دەردەچێ، بنەڕەتی پەروەردەی منداڵانیش؛ پاراستنیانە لە هاوڕێی خراپ)[2].

ڕەنگە مرۆڤ نەریت و ڕەوشت و چەمکەکان لە هاوڕێکانی زیاتر وەربگرێ وەك لەوەی کە لە دایك و باوك وەربگرێ.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی: ((الْمَرْءُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ: مرۆڤ لەسەر ئایینی هاوڕێیەکەیەتی، جا هەر یەکێك لەئێوە با سەرنج

[1] الرسول العربي المربي، ص٣٠٥-٣٠٦.

[2] إحياء علوم الدين ج٣/٧٣.

بدات چ هاورێیەك هەڵدەبژێری.))[1]

قورئانی پیرۆز وریایی داوە لە شوێنەواری گەورەی هاوڕێی لە گۆڕینی ڕێگەی ژیانی ئادەمیزاد و لە بەختەوەری و بەدبەختیدا.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ۝ قَالَ قَائِلٌ مِّنْهُمْ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٌ ۝ يَقُولُ أَإِنَّكَ لَمِنَ الْمُصَدِّقِينَ ۝ أَإِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَإِنَّا لَمَدِينُونَ ۝ قَالَ هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ۝ فَاطَّلَعَ فَرَآهُ فِي سَوَاءِ الْجَحِيمِ ۝ قَالَ تَاللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ ۝ وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّي لَكُنتُ مِنَ الْمُحْضَرِينَ: بۆ وتوویژ ڕوویان دەکەنە یەکتری، یەکێ لەو ناوەدا ئێژێ: ئەمن هەمدەمێکم هەبو، لێی دەپرسیم: تۆش لەوانەی کە باوەڕیان بە خوا هەیە؟ ئاخۆ ئەگەر ئێمە مردین، بوینە ئاخ و چەند هەستییەك، هەر حیسابمان لێدەکێشن؟ پرسی: ئاخۆ هیچ ئاگایەکیتان لێ هەیە؟ ئەوسا خۆشی چاوی گێڕا، لە دوڕ جەهەنەمدا دیتی، گوتی بەخوا هەر وەخت بو لە بەینم بەری.ئەگەر چاکەی پەروەرندەی من نەبوایە، ئێستا منیش وێڕای تۆ بوم.﴾الصافات: ٥٠-٥٧.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلًا ۝ يَا وَيْلَتَىٰ لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ۝ لَّقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ الذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَاءَنِي وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِلْإِنسَانِ خَذُولًا: لەو ڕۆژەشدا کە ناهەقکار بەدەستی خۆیدا دەنوسێ و ئێژێ: ئەی کاشکایە منیش وەل پێغەمبەر چوبامە ڕێ، ئەی مخابن، خۆزێ هەرگیز نەبوبام بە دۆستی فلان. لە پاش ئەوەی کە ئەم قورعانەم پێ گەیشت، هەر ئەو منی لێ

[1] أخرجه الترمذي برقم (٢٣٠٠).

کلا کرد؛ شەیتان هەمیشە مرۆ بەرەڵا دەکا﴾الفرقان:٢٧-٢٩.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**إِنَّمَا مَثَلُ الْجَلِيسِ الصَّالِحِ وَالْجَلِيسِ السَّوْءِ كَحَامِلِ الْمِسْكِ وَنَافِخِ الْكِيرِ، فَحَامِلُ الْمِسْكِ إِمَّا أَنْ يُحْذِيَكَ وَإِمَّا أَنْ تَبْتَاعَ مِنْهُ وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحًا طَيِّبَةً، وَنَافِخُ الْكِيرِ إِمَّا أَنْ يُحْرِقَ ثِيَابَكَ وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ رِيحًا خَبِيثَةً**: نمونەی ئەو کەسەی لەگەڵ مرۆڤی چاك دادەنیشێ و لەگەڵ مرۆڤی خراپ دادەنیشی وەکو هەڵگری بۆنی میسك و فوکەری کورەی ئاگرە، هەڵگری بۆنی میسك یان پێت دەبەخشێ یان لیێ دەکڕی، یان بۆنی خۆشی لێ بەرهەست دەکەی، فوکەری کورەی ئاگریش: یان جلەکەت دەسوتێنێ یان بونی ناخۆشی لێ بەرهەست دەکەی.))[1]

لە وتەی بەنرخیشەوە گوتراوە: پەروەردەکاران چوارن: مامۆستا، پەرتوك، هاوڕێ، ڕۆژگار.

پێویستە لەسەر ئەو باوکەی دەیەوێ منداڵەکەی چاك بێ، هاوڕێکانی کوڕەکەی بناسێ ئەمەش بەوە دەبێت، کە لە قوتابخانەکەی سەردانی بکات، یان هاوڕێکانی بۆ ماڵەکەی بانگ بکات و پیێان ئاشنا بێت، باشتریش وایە باوك هەوڵ بدات سەردانی سەرپەرشتیارانی هاوڕێیانی کوڕەکەی بکات لە ماڵەکانیان و ئاشنا بێت بەو کەش و ژینگەیەی تێیدا پێگەیشتون.

هەروەها لەسەر باوکە کوڕەکەی لەگەڵ خۆی بباتە ماڵی هاوڕێکانی، تاوەکو ئاشنا بێت بە کوڕەکانیان و هاوڕێیەتیان لەگەڵ ببەستێت.

گەر باوك نەیتوانی کەشێکی پاك و چاك لە هاوڕێیان بۆ منداڵەکانی ساز بکات، ئەوا کوڕەکە خۆی کۆمەڵێك هاوڕێ بۆ خۆی دادەنێ، باوکیش نازانێ ئەو ژینگەیە چییە کە ئەم هاوڕێیەتیەی تێدا گەشە دەکات.

گرنگە ئاگاداری بدەین بەڕۆڵی گەورەی مزگەوت لە دروست کردنی هاوڕێیەتی چاك، ئەویش لەمیانەی ئامادەبونی کوڕ لە نوێژی بەکۆمەڵ و چونی

[1] أخرجه البخاري برقم (٥٢١٤).

بۆ زنجیرەکانی زانست و لەبەرکردنی قورئان، بەمەش منـــداڵ وردە وردە دەچێتـە ناو کۆمەڵێ هاوڕێی چاك، ئەوانەی هاوکاریان دەکەن لەسەر فەرمانبەری خـوای گەورە و چاك کردنی ڕەوشتی.

لەو کارە گرنگانەی کە پێویستە دایك و بـاوك رەچـاوی بکـەن ئەوەیـە، کـە کەس و کاری منداڵان لەبـــەردەم هاوڕێکانیـان ڕیزیـان بگـرن، هـەروەها ڕیـزی هاوڕێکانیان بگرن و ریزیان بگرن گەر چاکەیان لێ بەدی کـــردن، چونکـە ئەمـە پەیوەندی نێوانیان و نێوان منداڵەکانیان و هاوڕێی منداڵەکانیان بەهێز و پتـــەو دەکات.

با دایك و باوك ئاگاداربن لە چونی منداڵەکانیان بۆ ماڵی ئەو هاوڕێیانـــەی، کە دایك و باوك هێشتا ئاشنا نەبونە بە کەس و کاریان و حاڵی ماڵیان.

## نوستنی منداڵ و وانەکردنی لەدەرەوەی ماڵدا:

زۆر لە منداڵان حەز بە وانەکردن لەگەڵ هاوڕێکانیـــان لـە ماڵیـاندا یـان لـە ماڵی هاوڕێکانیاندا دەکەن، جا وێڕای ســودی ئـەم چەشـنە وانـە کردنـە، ئـەوا پێویستی بە ئاگاداری هەیە، کــە ڕێ نـەدرێ بەمانـەوەی منـداڵان لـە دەرەوەی ماڵیاندا، جا مانەوەکە لە ماڵی هاوڕێکانیان بێت، یان ماڵی خزمەکانیان بێـت، مەگـەر لەحاڵـەتی زۆر پێویســت دا بێـت وەك سـەفەرکردنی دایـــك و بـــاوك، نەتوانینی مانەوەی منداڵان لەماڵدا بەبێ کەس و کاریان. مانەوەشیان دەبێ لـــە لای ئەو کەسانە بێت، کە متمانە بەڕەوشتیان و ڕەوشتی خێزانیان دەکرێ.

شتێکی زۆر بەسودە بۆ کوڕ و خێزان، کە کوڕەکە بەر لە دەرچونی ئاگـــاداری دایك و باوکی بکات لە جوڵــە و هــەڵس و کـەوتی لــە دەرەوەی مــاڵی، هــەروا هەواڵی شوێنی چونە دەرەوەیان پێ بڵێ.

جا گەر ناچاربو دەربچێ هەر دەبێ ئاگــاداری خـێزانی بـەم دەچونـە بکــات، چونکە ئەم کارە وا لە منداڵ دەکات، کە هەست بەوە بکات لــە لایـەن دایـك و

باوکیەوە چاودێرە. ئەمەش شوێنەوارێکی دەرونی گەورەی هەیە لە ساغی و دروستی ڕەفتار و ڕەوشتیدا.

پێویستە لەسەر دایك و باوك پەیڕەو (منهج)ێکی مام ناوەندی لەنێوان توندی و نەرمی دابنێن لە ئازادی دان بەمنداڵ بۆ چونە دەرەوەی لەگەڵ هاوڕێکانیدا، چونکە زۆر توندی نواندن و بەرتەسك کردنەوە دەبێتە مایەی لەدەست ڕۆیشتنی منداڵ لەژێر ڕکێفیَ دایك و باوکی و یاخی بون لێیان. هەروەها نەرمی نواندن لەمەدا منداڵ توشی خراپەکاری دەکات، کەواتە باشترین کاروباریش مام ناوەندیە.

# پلە پلەیی لە پەروەردەدا

پلەپلەیی لە گۆڕینی ڕەوشت و وەرگرتنی چەمکەکان ڕێبیر (مبدأ)ێکی پەروەردەیی و فێرکردنێکی زۆر گرنگە لە مامەڵەکردن لەگەڵ گەورە و منداڵ بەیەکسانی.

ئیسلام لە زۆر کاروبارەکاندا پەیڕەوی ڕێبیری پلەپلەیی لە یاسادانانی کردوە وەك: قەدەغەکردنی مەی، پێویست کردنی نوێژ و ڕۆژو و زەکات و شتی تریش، ئەوەش مانای ئەوەیە پلەپلەیی ڕێبیرێکی بنەڕەتی ئیسلامیە.

پلەپلەیی لە پەروەردەی منداڵدا، شوێنەواری گەورەی هەیە لە یاریدەدانی بۆ لابردنی بەربەستی دەرونی ئەو کارانەی لێی داواکراوە و ڕاهێنانی لەسەر بەجێ هێنانی.

خوای گەورەش وریایی داوە بە پێویستیەتی پەیڕەوکردنی ئەم ڕێگەیە لە مامەڵەکردن لەگەڵ منداڵ و ڕێك کردنی ڕەفتارەکانی، ئەمەش لە ئایەتی مۆڵەت وەرگرتن (إستئذان)دا هاتوە وەك دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِيَسۡتَـٔۡذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ وَٱلَّذِينَ لَمۡ يَبۡلُغُواْ ٱلۡحُلُمَ مِنكُمۡ ثَلَٰثَ مَرَّٰتٖۚ مِّن قَبۡلِ صَلَوٰةِ ٱلۡفَجۡرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ وَمِنۢ بَعۡدِ صَلَوٰةِ ٱلۡعِشَآءِۚ ثَلَٰثُ عَوۡرَٰتٖ لَّكُمۡۚ لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ وَلَا عَلَيۡهِمۡ جُنَاحُۢ بَعۡدَهُنَّۚ طَوَّٰفُونَ عَلَيۡكُم بَعۡضُكُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! با ئەوانەی خولام و کەنیزی ئێوەن، ئەو کەسانەش لە ئێوە کە بلوق نەبون، سێ جار ئیزنو لێ بخوازن: لە پێش نوێژی بەیانی دا و نیوەڕۆیان، کاتی شمەکان دادەنێن و لە پاش نوێژی خەوتنانیش؛ کە ئەم سێ کاتە وەختی تەنیایی ئێوەیە. لە پاش

ئەوە، نە بۆ ئێوە قەیدی دەکا، نە بۆ ئەوان، کە بــە دەور و بــەرتاندا بێــن؛ ئێــوە پێکەوە تێکەڵن. ئا بەم جۆرە خودا نیشانەکانی خۆی بــۆ ئێـوە ئاشـکرا دەکـا. خودا زانای لەکارزانە﴾النور:٥٨-٥٩.

جا سەرەڕای ئەوەی کە منداڵ بەر لە بلوغ بونی بەبێ مۆڵــەتی چونــە ژورەوە بۆ لای دایك و باوکی قەدەغــە نیــە، مەگــەر دڵنیــا بــن لــەوەی، کــە دەیــەوێ تەماشایان بکات کە لە حاڵەتی ڕوتی دان، ئــەوا خــوای گــەورە مۆڵــەتی چونــە ژورەوەی تەنها لە سێ کاتدا دانا کە بریتی‌یە لە: بــەر لــە نوێــژی بــەیانی، دوای نیوەڕۆ، دوای عیشا.

هەر چەندە ئەم کاتانە لای دایك و باوك کــاتی پشــو و حەســانەوەیە، هــەروا کاتەکانی تریش هیچ جیاوازی نیە بۆ پێویســتیەتی داواکردنــی مۆڵــەتی هاتنــە ژورەوە، مەبەستیش لەمە ڕاهێنانی منداڵە لەسەر مۆڵەت وەرگرتن، ئەمەش بۆ ئەوەیە تاوەکو منداڵ دوای بلوغ بونی سەرسام نەبێ و لێی نەبێتە ناکاو، کــاتێ ڕێگری دەکرێ لە چونە لای دایك و باوکی، مەگەر بە ئیزن بــێ، لەهــەر کــاتێك کە حەز بکات بچێتە لایان.

جا ئەم نمونەیەی پەروەردەکردن بــە پلەپلــەیی؛ ئــەو مانــا قــوڵ و شــوێنەوارە گەورەمان بۆ بەدیار دەخات، کە بەرەنجامی پەیڕەوی ئەم بەرنامەیــە دەبێــت لــە پەروەردەدا.

هــەروەها لــە نمونــەی ئەمــە ئەوەیــە، کــە پێغەمبــەر ﷺ فــەرمانی کــردوە بەڕاهێنانی منداڵ لەسەر نوێژ کردن، با لەسەریشی پێویست نەبێ، با نەشــتوانێ لە هەمو کاتەکان بەجێی بهێنێ، ئەمەش بــۆ ئەوەیــە تــاوەکو پابــەند بــێ بــە بەجێهێنانی، بەر لەو کاتەی پێویست دەبێ، ئــەو کاتــەش هیــچ زەحمــەتێك لــە نوێژکردن نابینێ و هیچ نوێژێك لە دەست نادات.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی نوێژکردنی منداڵ دەفەرموێ: ((إِذَا عَـــرَفَ الوَلَدُ يَمِينَهُ مِنْ شِمَالِهِ فَأْمُرُهُ بِالصَّلَاةِ: گەر منداڵ ڕاســت و چــەپی زانــی، ئــەوا

فەرمانی نوێژی پێ بکە))[1]

ئەوەی زانراویشە ئەوەیە، کە منداڵ بەزۆریی لە پێش تەمەنی پێنج ساڵی ڕاست و چەپی خۆی دەزانێ، نوێژیشی لەسەر پێویست نابێ، مەگەر دوای تەمەنی پازدە ساڵی.

لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر پەروەردیاران لە مامەڵەکردن لەگەڵ منداڵ دا و، لە چاندنی بەهای پەروەردەیی بۆ منداڵان؛ خۆیان بە ئارامی و خۆڕاگری برازێننەوە، هەروا لەسەریانە چاك بزانن بۆ ئەوەی منداڵ ئەو بەها پەروەردەییان لێ وەربگرێ کەئاراستەیان دەکەن؛ پێویستە بەشێوەیەکی سادە و ئاسان ئاراستەیان بکەن، بۆ هۆشیاریشی هەر لە سەرەتای ساڵەکانی یەکەمییەوە بە پلەپلەیی پێی ئەنجام بدەن، بەمەش باشترین بەرەنجامی پەروەردەیی دەستە بەر دەکەن.

[1] أخرجه الهيثمي في "مجمع الزوائد" ج١/٢٩٤.

# ئاڕاستەی ڕاستەوخۆ

شێوازی ئاڕاستەکردنی ڕاستەوخۆ؛ ئاسانترین و زۆرترین وبڵاوەترین شێوازی پەروەردەیی‌یە، کە شێوازێکی تەقلیدی و ناسراوە لەلای زۆرینەی خەڵکدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا نازانن چۆن ئاراستەی ڕاستەوخۆ، بکەن لە دەروونی ئاڕاستە کراودا کاریگەری زۆری هەبێ.

خوای گەورە لە قورئانی‌پیرۆزدا، دەربارەی ئاڕاستەی ڕاستەوخۆ، ئەویش لە ڕێگەی ئامۆژگاری و ڕاسپاردەییەوە زۆر نمونە دەهێنێتەوە.

بۆ نمونە خوای گەورە لەسەر زمانی لوقمان (ﷺ) کە کوڕەکەی پەروەردە دەکات و ئامۆژگاری دەکات دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ : کاتێك لوقمان ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکرد و گوتی: کوڕەکەم هاوەڵ بۆ خوا پەیدا مەکە، چونکە هاوەڵ پەیداکردن بۆ خوا ستەمێکی گەورەیە.﴾لقمان:١٣.

﴿يَٰبُنَىَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِى صَخْرَةٍ أَوْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوْ فِى ٱلْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴿١٦﴾ يَٰبُنَىَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ ۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٧﴾ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿١٨﴾ وَٱقْصِدْ فِى مَشْيِكَ وَٱغْضُضْ مِن صَوْتِكَ ۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلْأَصْوَٰتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ: کوڕەکەم بێگومان بزانە ئەگەر کردەوەیەکی چاك یان کردەوەیەکی خراپ بەقەد سەنگی دانە خەردارەیی بێ و ئەو دانە خەردارە لەناو بەردێکدابێ، یان لە ئاسمانا بێ، یان لە زەویدا؛ خوای گەورە ئامادەی دەکا و موحاسەبەی لەسەر دەکات، بەڕاستی خوا بەلوتفە

و هیچ شتیّ ڕێگەی ئیدراك و زانینی ناگریّ، (خبیر)ە و ئاگادارە لە زۆر و کـەم. کوڕەکەم نوێژەکەت بەباشی بەجیّ بهێنە و چاودێری ئـاداب و ئـەرکان و کـات و شوێنی بکە و هەر چاکەیەك پێش چاوت کەوت فەرمانی بـەکردنی بـدە و هـەر کار و کردەوەیەکی ناڕەوا و خراپ ئاگادار بوی لیّی نەهی و قەدەغەی لیّ بکە.. گەر توشی بەلاّ و ناخۆشیەك بوی ئـارامی لەسـەر بگـرە چونکـە ئەمـە لـە ورە بەرزیەوەیـە، هـەرگیز لەبـەر فـیز و لـوت بـەرزی ڕوی خـۆت لـە خـەڵك هەڵمەچەرخێنە، بە لەنجەی لە خۆبایی بونەوە بەسەر زەویدا مەڕۆ، چونکە خـوای گەورە مرۆڤی بەفیزی خۆش ناویّ، ئەگەر بۆ ئیش و کاری خـۆت ڕێگـەت بـڕی، میانە بڕۆ بەڕێدا، نەئەوەندە پەلە بکە کە جوانی ڕوخسارت بڕوا و نە ئـەوەندەش سست بڕۆ، کە وەکو ناساغ و دو دڵ دەرکەوی، لە کاتی قسەکردندا دەنگی خۆت نزم بکەرەوە و زیاد لـە ئـەندازەی پێویستی هاودەمەکـەت هەڵمـەبڕە، چونکـە ناخۆشترین دەنگ دەنگـی زەڕەی کـەرە و زۆربـەی ناسـازییەکەی لەبـەر هـێزی ئاوازەکەیەتی.﴾لقمان:١٦-١٩.

لە سوننەتی پێغەمبـەردا ﷺ فـەرمودەی زۆر هـاتوە، کـە پێغەمبـەر ﷺ بەڕاستەوخۆیی ئامۆژگاری منداڵانی کردوە.

لەوانە وەك کە بەئەنەسی فەرمـوە: "کوڕەکەم! گەر توانیت بـەیانی و ئێـوارە بکەیتەوە و لەدڵت دا گریّ و کینەت بەرامبەر هیچ کەسێك نـەبێت، ئـەوا ئـاوا بکە، کوڕەکەم ئەمە ڕێوشوێنی منە، هـەر کەسـێکیش ڕێوشـوێنی مـن زیتـدو بکاتەوە، منی زیندو کردۆتەوە، هەر کەسێکیش من زینـدو بکاتـەوە ئـەوا لـە بەهەشت لەگەڵ منە".[1]

جا لێرەدا ئـەرکی دایـك و باوکـە کـە هـەل بقۆزنـەوە و ئـەو ئامۆژگاریانـە پێشکەش بە منداڵەکانیان بکەن، کە مانای جوان لەخۆ دەگریّ، ئەمەش ئـەریت و کاری پیشینەی چاك بوە لەگەڵ منداڵەکانیان.

---

[1] أخرجه الترمذي برقم (٢٦٠٢).

پەرتوکخانەی ئیسلامی لە پەرتوکەکانی مێژو وئەدەب دا؛ چەندەها ئامۆژگاری باوکان بۆ مندالەکانیانی کۆ کردۆتەوە، کە تێیدا کورتەی ئەزمونەکانیان و فێربونیان لە هەڵوێستە جیاجیاکانی ژیانیان، پێشکەش دەکەن، ئەمەش چەند نمونەیەکە:

ئیمام عەلی کوڕی ئەبوتالیب ﷺ ئامۆژگاری حەسەنی کوڕی کرد و گوتی: "کوڕەکەم گوێ بیستی پێغەمبەری خوا بوم ﷺ دەیفەرمو: هیچ هەژاریەك نیە، کە لە نەزانی خراپتر بێ، هیچ سامانێکیش لە ژیری باشتر نیە، هیچ تەنیاییەکیش لە لەخۆ ڕازی بون (العجب) ناخۆشتر نیە، هیچ هاوکاریەك لە ڕاوێژکردن بەتین تر نیە، هیچ ژیریەکیش وەك تەدبیر نیە، هیچ ڕەچەڵەك و نازناوێك وەك ڕەوشت باشی نیە، هیچ پارێزکاریەك وەك قەدەغەکردن نیە، هیچ پەرستنێك وەك بیرکردنەوە نیە، هیچ ئیمانێك وەك شەرم نیە، سەری ئیمانیش ئارام گرتنە، دەردی قسەکردن درۆکردنە، دەردی زانست لەبیرکردنە، دەردی نەرم و نیانی گێلیە، دەردی پەرستن کەمتەرخەمیە، دەردی ئازایەتی ستەم کردنە، دەردی لێ بوردەیی منەت کردنە، دەردی جوانی خۆ بەزل زانینە و دەردی ڕەچەڵەك شانازی کردنە"، پاشان ئیمام عەلی گوتی: کوڕەکەم هەر پیاوێك دەبینی هەرگیز بەسوکی تەماشای مەکە، گەر لە خۆت گەورەتر بو وەك باوکتی دابنێ، گەر وەك خۆت بو وەك برای خۆتی دابنێ، گەر لە خۆت بچوکتر بو وای دابنێ کوڕتە)[1].

موعازی کوڕی جەبەل ﷺ ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکرد و دەیگوت: (کوڕەکەم گەر نوێژت کرد نوێژی ماڵئاوایی بکە، چونکە نازانی جارێکی تر بۆی دەگەڕێیەوە، کوڕەکەم بزانە بڕوادار لە نێوان دو چاکە دەمرێ، چاکەیەك بە پێشی داوە و چاکەیەك دوای خستوە، تۆ لەگەڵ قەومێك دادەنیشی قسە دەکەن، جا گەر بینیت بێ ئاگابون چەند جارێك حەز و ئارەزوت ببە بۆ لای خوای گەورە

[1] أخرجه أبو نعيم في "الحلية" ج٢/٣٦- ج٦/٣٤٣.

و لیێ بپاڕێوه)[1].

طاوسی کوڕی کەیسانی یەمەنی ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکرد و دەیگوت: (کوڕەکەم، هاوەڵی خاوەن ژیرەکان بکە، گەر لەوانیش نەبی بەوان دەناسریێ، هاوڕێیەتی نەزانان مەکە، گەر لەوانیش نەبی بەوان دەناسریێ، بزانە بۆ هەمو شتێك مەبەستی خۆی هەیە، مەبەستی مرۆڤیش؛ ژیر باشیەتی)[2].

[1] هکذا تکلم الاولیاء و الصالحون ج۱/۳۰.
[2] هکذا تکلم الاولیاء و الصالحون ج۱/۱۰۱.

# هاندان و ترساندن

سروشتی کاریگەریی لەسەر دەرونی مرۆڤ، لە مرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی تر جیاوازی هەیە، لەهەمان کەسیش جیاوازی هەیە لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر، هەندێ دەرون بە هاندان و نەرمی و خۆشەویست کردن ڕێك دەبێ، جا گەر ترساندنی لەگەڵ بەکاربهێنرێ ئەوا لێی هەڵدێن و بەزەحمەت کاریگەریان لەسەر دەکرێ.

بەهەمان شێوە هەندێ کەس بە ترساندن و سزادان ڕێك دەبن، گەر هانیان بدرێ، ئەوا لە بەجێ هێنانی ئەرکەکانیان ئاسانکاری دەنوێنن و ئامۆژگاری کاریان تێناکات. کەسی واش هەیە پێویستی بە هەردو چەشن هەیە، جارێك بە ئارەزودان و جارێك بە ترساندن.

قورئانی پیرۆز لە زۆر جێگەدا هەردو شێوازی پێکەوە بەکار هێناوە، جا باسی ڕەزامەندی هەمیشەیی کردوە، کە بۆ چاکەکاران دانراوە، باسی ئازاری بەئێشی کردوە، کە بۆیاخی بوان و تاوانباران دانراوە.

بۆ وێنە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ۝ وَإِنَّ ٱلْفُجَّارَ لَفِى جَحِيمٍ : چاکەکاران لە نیعمەت دان، فاسق و خراپەکاران لە دۆزەخ دان. ﴾الانفطار:١٣-١٤.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ : هەرکەسێك بەقەد گەردیلەك چاکە بکات دەیبینێتەوە، هەر کەسێکیش بەقەد گەردیلەیەك خراپە بکات دەیبینێتەوە. ﴾الزلزلة:٧-٨.

جا پەروەردیاری سەرکەوتوو خۆی لەم دو وەسیلەیە ناکات، هەتا باشترین بەرەنجامی پەروەردەیی بەدەست دێنێ.

## جۆراوجۆری هاندان:

ئارەزوودان چەند جۆرێکی هەیە، کە هەر ڕوانینی لە بەچاکەدانان و ئیعجابەوە دەست پێ دەکات تا وتەی شیرین و هاندەر، تا دیاری ڕەمزی سادە، تا پاداشتی گەورە.

ئەم هاندانەش بە جیاوازی ئەو کارەی، کە منداڵ پێ هەڵدەستێ و بەجیاوازی تەمەنەکەی جیاوازی دەبێ.

بۆ وێنە منداڵی بچوك هەڵقومێك یان چوکلێتێکی لەلا باشترە لە گشت جۆری پاداشتەکان.

منداڵ لەتەمەنی خۆناسیدا پاداشتی مادی بەلاوە باشترە. کاتێك منداڵ دەگاتە تەمەنی پێگەیشتن (بلوغ)؛ ئەوا پاداشتی مەعنەوی کاریگەری زۆری دەبێت لەسەر دەروونیدا.

زۆر گرنگە منداڵ هۆی پاداشتەکەی بزانێ، تاوەکو ئەو چەمکە دروست و ڕەفتارە ڕاستە لە دەروونیدا بچەسپێ و، سووربێ لە سەر دووبارەکردنەوی لە ڕەفتاریدا.

پێویستە هۆشیاری بدرێ لەسەر ئەوەی دایك و باوك بەڵێنی پاداشت بە منداڵ نەدەن، کاتێ ناتوانن پاداشتەکەی پێ بدەن، یان بەڵێنی پاداشتی پێ بدەن و پاشان پێچەوانەی بەڵێنەکە ڕەفتار بکەن و بەجێی نەهێنن، چونکە ئەم ڕەفتارە وا لە منداڵ دەکات جارێکی تر لە پاداشتێکی تردا متمانە بە بەڵێنی دایك و باوکی نەکات، کە ئەوەش دەبێتە پوچ کردنەوە و نەهێشتنی شوێنەواری خوازراو لە پرۆسەی هانداندا.

هەروەها زۆر گرنگە دایك و باوك لە بڕی پاداشتی کارێکی بچوکی منداڵ پاداشتێکی گەورەی پێ نەبەخشن، بەڵکە پێویستە پاداشت و دیاری لەگەڵ قەبارە و شوێنەواری ئەو کارەی بگونجێ کە پێی هەڵساوە.

لە دیاری و پاداشت دا، کە پێشکەش بە منداڵ دەکرێ، گرنگە جۆراوجۆر بێت و بەبەردەوامی یەك جۆر نەبێت، چونکە وا لە منداڵ دەکات لەم دیاریە دوبارە بوانەدا بێزار بێت.

پێغەمبەر ﷺ وریایی داوە بە شوێنەواری گەورەی دیاری لە دەرونی مرۆڤ دا و لەزیادکردنی خۆشەویستیدا، کە فەرمویەتی: ((تَهَادَوْا تَحَابُّوا: دیاری بەیەکتری بدەن، لەلای یەکتری خۆشەویست دەبن.))[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ سوربوو لەسەر پێشکەش کردنی دیاری بەتایبەتی بۆ منداڵان، تاوەکو بە هۆیەوە خۆشی و شادی بخاتە ناو دڵیان و خۆشەویستی ئەوانیش بۆ ئەو زیاد ببێ، کە وایان لێ بکات ئامۆژگاری و ڕێنمایی یەکانی زۆر چاك وەربگرن.

لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەی بەری میوە و دانەوێڵە پێدەگەیشت دەهات و دەیفەرموو: "خوایە بەرەکەت بهاویە مەدینەکەمان و بەروبوم و کێشان و پێوانمان، بەرەکەت لەگەڵ بەرەکەت بێ، پاشان دەیبەخشی بەبچوکترین منداڵ کە لەوێ ئامادە دەبوو".[2]

لە ئیسحاقی کوڕی یەحیای کوڕی طەلحە ﷺ گێڕاوەتەوە، کە گوتویەتی: (لە مزگەوت لەگەڵ عیسای کوڕی طەلحەی مامم بوم ﷺ، سائبی کوڕی یەزید هاتە ژورەوە ﷺ و منی ناردە لای و گوتی: بڕۆ لای ئەم پیاوە گەورەیە و پێی بڵێ: عیسای کوڕی طەلحەی مامم دەڵێ: ئایا پێغەمبەری خوات بینیوە ﷺ؟ ئەویش گوتی: بەڵێ، پێغەمبەری خوام بینیوە ﷺ ، من و چەند کوڕیژگەیەك کە لەگەڵم بون چوینە خزمەتی، بینیمان خورمای لە سینیەك دەخوارد، هاوەڵەکانیش لەلای بون، جا چنگێکی بۆمان هەلگرت و پێیداین و دەستی

[1] أخرجه مالك في الموطأ برقم (١٨٩٦).
[2] أخرجه مسلم برقم (١٣٧٣).

بەسەر سەرماندا هێنا)[1].

لە خاتو عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێ) گوتویەتی: چەند دیاریەك لەلایەن نەجاشی‌یەوە هاتبو، ئەنگوستیلەیەکی حەبەشی تێدابو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بەبێ بایەخیەوە بەدارێك یان بەهەندێ لەپەنجەکانی هەڵی گرت، پاشان بانگی ئومامەی کچی ئەبی عاصی کرد، کە کچی زەینەبی کچی پێغەمبەر بوو، فەرموی: "کچەکەم بەمە خۆتی پێ برازێنەوە"[2].

زاناکانی مسوڵمانان دەرکیان بەگرنگی هاندانی منداڵان کردوە لەسەر پاکخویی و پەروەردەکردن دا، ئاگاداریشیان لێ‌ی داوە.

بۆ وێنە ئیمام غەزالی گوتویەتی: (منداڵ هەر ڕەوشتێکی جوان و کارێکی باشی لێ بەدەرکەوت، پێویستە لەسەر ئەمە بەو شتە خەڵات بکرێ و پاداشتی لەسەری بدرێتێ، کە پێ‌ی شاد دەبێ، لەناو خەڵکیش ستایش بکرێ)[3].

ئەوەی دەربارەی پاداشت و دیاری دەگێردرێتەوە و شوێنەواری لەسەر پەروەردە و فێرکردن هەبوە، ئەوەیە کە لە دێرینەوە هەندێ دەوڵەمەندی چاکەکاری شاری دیمەشق نۆکی سورکراوەی بەشەکراویان وەقف کردبوو، تاوەکو لە قوتابخانەکان پێشکەش بەمنداڵان بکرێت بۆ هاندانیان لەسەر فێربون و بە ئەدەب بون.

## جۆراوجۆری ترساندن:

بەهەمان شێوە ترساندن چەند شێوازێکی هەیە، کە لە روانینێکی دڵ ڕەقیانە و سەرکۆنەکەر دەست پێ دەکات، تا هەڕەشەکردن بە بێبەش کردن لە یاری و موچە، یان گەشت و پیاسەکردن، تا لێدان و ترساندن بەسزادانی خوای گەورە و

---

[1] أخرجه الهيثمي في مجمع الزوائد ج٥/١٨.
[2] أخرجه أبوداود برقم (٤٢٣٥).
[3] إحياء علوم الدين ج٣/٧٣.

توڕەبون لیی.

ئەمەش بەجیاوازی نەفسیـ [illegible] ی و خێرا وەڵام دانەوەی جیاوازی هەیە، چونکە ئەو منداڵەی بەسەر کۆنەکردن ژیر دەبێ پێویست بەبێ بەشی کردنی ناکات، ئەو منداڵەش بەبێ بەشیکردن ژیر دەبێ پێویست بە بەکارهێنانی لێدانی ناکات، ئەمەش شتێکی گرنگە پێویستی بە وریابونە.

هەروەها لەو کارانەی پێویستە وریابن لیی بریتین لە:

-توندی سزا کە بگونجێ لەگەڵ ئەو کارەی منداڵەکە ئەنجامی داوە.

-لەگەڵ هەمو کردەوەیەکی منداڵ، بچوك یان گەورە سزا دوبارە نەبێتەوە، بەڵکە کردەوەکان هەمو کۆبکرێتەوە، ئینجا یەکجار لەسەری سزا بدرێ.

-منداڵ بە تەواوی هۆی سزادانەکەی بزانێ، تاوەکو ئەم هۆیە لە بیر و هۆشیدا بەسزادانەکە ببەسترێ.

ئەوەی پەیوەنداره بە هاندان و ترساندن، دەکرێ لەم خاڵانەی خوارەوە کورت بکەینەوە:

١-پێویستە سزادان و هاندان لەگەڵ تەمەنی منداڵی سزادراو بگونجێ، چونکە نەگونجانی سزادان و هاندان لەگەڵ تەمەنی منداڵ، ڕەنگە ببێتە کۆسپ و لەمپەر لەبەردەم ئەو سودە خوازیارەی لەهەردوکیان چاوەڕێ دەکرێ.

٢-سزا و پاداشتەکان هەمە چەشنە بێت و لەسەر یەك جۆر بەردەوام نەبێت.

٣-لەسەر دایك و باوکە کاتێك بەڵێنی سزادان یان پاداشت وەرگرتن بە منداڵان دەدەن، پێویستە جۆرەکەی دیاری نەکەن، بۆ ئەوەی بوار بۆ هەڵبژاردنی سزا یان پاداشت کراوە بێ.

٤-زۆر وریا بن لە بەجێ نەهێنانی بەڵێن و هەڕەشەکان، چونکە ئەم جۆرە ڕەفتارە دەبێتە مایەی گوێ نەدانی منداڵ بە بەڵێن و هەڕەشەکانی جاری داهاتو.

٥-پێویستە منداڵان بەباشی بزانن بۆچی سزا دەدرێن و بۆچی خەڵات

دەكرێن.

٦-لە پاداشت دانەوە و سزادانی مادی و بەرهەست دا، پێویستە پلەپلەیی لە مامەڵە كردن لەگەڵ منداڵان بەكاربێ بۆ پاداشت دانەوە و سزادانی مەعنەوی لە مامەڵەكردن لەگەڵ منداڵانی تەمەن گەورەتر.

٧-لە حاڵەتی توڕەبوندا پێویستە لەسەر دایك و باوك خۆیان لە سزادان دور بگرن، چونكە سزادان لەو كاتەدا دەگۆڕێ بۆ تۆڵە سەندنەوە.

٨-زۆر سزا نەدان و خەڵات نەكردن، تاوەكو مانا خوازیارەكەی وەكو خۆی بمێنێ.

٩-سوربون لەسەر جیاوازی نەكردن لە نێوان منداڵان گەر ئەو رەفتارەی پاداشت و سزاكەی لەسەر دەدرێ یەك شت بێت، هەروا سوربون لەسەر ئەوەی كە پاداشت دانەوە نەبێتە هۆی غیرە و ئێرەیی[1] لە نێوان منداڵاندا.

١٠-وریایی زۆر لەوەی، كە نزا لە منداڵان بكرێ، یان بێژە (لفظ)ی بریندارکەر وەك ئامرازێكی سزادان بەكاربهێنرێ.

## لێدانی منداڵ و جیاڕای پەروەردیاران:

زۆربەی زاناكان ڕای جیاوازیان هەیە لەبەكارهێنانی ئامڕازی لێدان لە تەمێ كردن و سزادانی منداڵ دا، كە لە نێوان پشتگیریكردن و پشتگیرینەكردن دایە.

زۆربەی زاناكانی پەروەردەی ڕۆژ ئاواییەكان شێوازی لێدانیان ڕەتكردۆتەوە لە پەروەردەدا و قەدەغەی بەكارهێنانیان كردوە، ئەم بیرۆكانەش بۆ وڵاتانی مسوڵمانان گوێزرایەوە و لەنێوەندی فێرخوازان و ڕۆشنبیران بڵاوبویەوە و دیدیان بۆ بەكارهێنانی لێدان ئەوەبو، كەوا شێوازێكی پەروەردەیی دڕندانە و دواكەوتویی‌یە، پاشان هێندەی پێ نەچو زاناكانی ڕۆژئاوا بانگەشەی چەوتی بیردۆزەكەی پێشویان دەكرد و داوای گەڕانەوەی بەكارهێنانی لێدانیان دەكرد

[1] ئێرەیی: حەسودی.

وەك شێوازێکی پەروەردەیی، کە لەکاتی سەرنەکەوتویی شێوازەکانی تر پەنای بۆ دەبردرێ.

(سبوك)ی پەروەردیاری ئەمریکی دەڵێ: (لە کتێبەکەمدا کە پازدە جار چاپ کراوەتەوە؛ مرۆڤم گومرا کرد بەوەی، کە بڕیاری لابردنی سزادانم تێدا دابو، بەڵام ئێستا بۆم دەرکەوت، لە پەروەردەی منداڵ دا هەر دەبێ سزادان هەبێ)[1].

دکتۆر دوشی- زانای نەخۆشیە دەرونیەکان- دەڵێ: (سزانەدانی منداڵ لە هەرچی کارێك دەیکات؛ شێوازێکی هەڵەیە لە پەروەردەدا)، هەندێ جار هەر دەبێ تۆڵەی جەستەیی بەکاربهێنرێ، بەڵام بە هاوسەنگی و مام ناوەندێتی[2].

دکتۆر بنجامین سبوك دەڵێ: (لێدانی منداڵان بۆ پەروەردەکردنیان شتێکی پێویستە، ئەوەی کە منداڵ تێکدەدات ئەوەیە، کە هەڵە بکات و پاشان لێی نەدەین، بەڵکە بە وشەیەکی ڕەق یان ڕوانینێکی دڵ ڕەقانە وازبێنین). پاشان بڕیار دەدات کە حاڵی زۆر لە لاوان و پیاوانی تۆژیوەتەوە و بۆی دەرکەوتوە کە: (باشترین ڕەوشتیان ئەوەبو کە لەکاتی منداڵیدا هەڵەی دەکرد، باوکی لە لێدانی تەمبەڵی نەدەکرد، خراپترین رەوشتیشیان و لاوازترین کەسایەتیان ئەوە بوو، کە لە ساڵانی یەکەمیەوە لە لێدانی دایك و باوکی پارێزراو بوە)[3].

پێشتر زانایانی مسوڵمانان دوپاتی پێویستیەتی لێدانیان کردۆتەوە بۆ ڕێك و پێك کردنی و ڕاست کردنەوەی ڕەفتارەکان.

وەك وتەی ئیبن خەلدون دەڵێ: (سزادانی جەستەیی دوا ڕێگەیە، کە پەروەردیار پەنای بۆ دەبات دوای بێ سود بونی گشت ڕێگاکانی تر).

ئیمام غەزالی دەربارەی چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ هەڵەکانی منداڵ دەڵێ: (گەر لە هەندێ حاڵەتدا جارێك پێچەوانەی ئەمەی دەکرد، پێویستە خۆی لێ بێ

[1] دور البيت في تربية الطفل المسلم ص١٣٣.
[2] دور البيت في تربية الطفل المسلم ص١٣٣.
[3] مع الله- دراسات في الدعوة و الدعاة:ص٢٨٩. نقلا عن مجلة المعلم العربي، عدد نيسان ١٩٥٢م.

ئاگا بکرێ و، پەردەی لەسەر دانەماڵرێ و ئاشکرا نەکرێ، واشی بۆ پیشان نەدرێ ئەو وا بێتە بەر نیگای کە کەسێکی تر دەوێری وەك ئەو بکات، بەتایبەت گەر منداڵ دایپۆشی و هەوڵی شاردنەوەیدا، جا بەدیارخستنی لەسەری، ڕەنگە زیاتر بوێری پێ بدات و گوێ بە ئاشکرا بونی نەدات، جا گەر ئەو کاتە دوبارە گەڕایەوە سەر سەرپێچیەکە؛ پێویستە بەنهێنی سزابدرێ و کارەکەی بە گەورە بگیرێ پێشی بگوترێ: نەکەی جارێکی تر ئەم کارە دوبارە بکەیتەوە، ئەگینا بە کارەکەت دەزانرێ و لەناو خەڵکی دا ئابڕوت دەچێ.

لە گشت کاتێکدا زۆر سەرزەنشت نەکرێ، چونکە بەلایەوە گوێ بیستی سەر زەنشت و کاری ناشیرینی بەلاوە سوك دەبێت و قسەی لەدڵدا سەنگی نابێ، با باوك سامی قسەکەی لەگەڵیدا بپارێزێ و سەر زەنشتی نەکات، مەگەر هەندێ جار نەبێت، با دایك منداڵەکەی بە باوکی بترسێنێ و تەریقی بکاتەوە)[1].

ئەوەی لە وتەکی ئیمام غەزالی رامێنێ؛ وردەکاری و ئاسانکاری ئەو دەبینێ، کە گەورەترین پسپۆڕی پەروەردەناسی نوێ لیێ دەستەوەستاو دەبێ، چونکە وریایی دەدات بە پێویستیەتی بەکارهێنانی پلەپلەیی لەسزاداندا، لە سوکەوە بۆ توندی، هەروا ئاگاداری دەدات بە پێویستیەتی پارێزگاری کردنی سام و هەیبەتی پەروەردیار لە دەرونی منداڵدا، ئەگینا گشت شێوازەکانی پەروەردە هیچ بەرەنجامێکی نابێت، گەر پەروەردیار سام و هەیبەتی خۆی لە دەرونی منداڵ لە دەست دا، هەروەها ئاگاداری داوە بە پێویستیەتی هاوسەنگی لە نێوان رۆڵی دایك و باوك لە کرداری پەروەردەدا.

لە هەمو ئەمانە گرنگتر بریتییە لە خۆیی ئاگاکردنی پەروەردیار لەو خلیسکانەی، کە منداڵ بەسەهو و هەڵە لیێ ڕو دەدات و سور دەبێ لەسەر داپۆشینی ئەو خلیسکانە تاوەکو منداڵ لە لای ئاسان نەبێ ئەنجامی بدات و بڵاوی بکاتەوە، دیارە شوێنەواری گەورەی دەرونی ئەمەش شاراوە نیە.

[1] إحياء علوم الدين ج٣/٧٣.

جا پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەم ڕێبیرە گرنگە وریایی داوە، کە بەر لە پەنا بردن بۆ لێدانی منداڵ، پێویستە مامەڵەی پێ بکرێ. ئەسەدی کوڕی وەداعە گێڕاویەتیەوە، کە پیاوێك پێی دەگوترا (جوزەی) هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: (ئەی پێغەمبەری خوا ماڵ و منداڵم سەرپێچیم دەکەن بەچی سزایان بدەم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (چاوپۆشی بکە)، پاشان دوەم جار گوتیەوە، هەتا سێ جاری ئەمەی گوتەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەگەر سزات دا بە ئەندازەی گوناهەکە سزا بدە، لە لێدانی دەم و چاو خۆت بپارێزە[1].

گومانی تێدا نیە بەکارهێنانی لێدان لە پەروەردەکردن و تەمێ کردندا، پرنسیپێکی ئیسلامیە کە بۆ زۆر کاری داناوە.

لە پێغەمبەرەوە ﷺ چەند فەرمودەیەك هاتوە دەربارەی ڕێدان بە بەکارهێنانی لێدان بۆ تەمێ کردنی منداڵ و پەروەردە کردنیان، لەوانە:

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**مُرُوا أَوْلَادَكُمْ بِالصَّلَاةِ وَهُمْ أَبْنَاءُ سَبْعٍ، وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا وَهُمْ أَبْنَاءُ عَشْرٍ، وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَاجِعِ**: منداڵەکانتان کە لە تەمەنی حەوتساڵیدان، پێیان بڵێن نوێژ بکەن، گەر لە تەمەنی (دە) ساڵی نەیان کرد لێیان دەن، هەروا لەو تەمەنەش جێگەی نوستنیان جیا بکەنەوە))[2].

لە عبداللەی کوڕی بشر ﷺ گوتویەتی: دایکم هێشوە ترێیەکی پێدام بۆ خزمەت پێغەمبەری خوای ببەم، جا بەر لەوەی پێی بگەیەنم لێیم خوارد، کاتێك چومە خزمەتی، گوێمی گرت و فەرموی: "ئەی غەدار"[3].

عن ابن عمر ﷺ قال رسول الله ﷺ: ((**وَلَا تَرْفَعْ عَصَاكَ عَنْ أَهْلِكَ وَأَخِفْهُمْ فِي اللَّهِ**: گۆپاڵەکەت لەسەر منداڵەکانت هەڵمەگرە، لە خواش بیان ترسێنە))[4].

---

[1] أخرجه الهيثمي في "مجمع الزوائد" ج٨/١٠٦.
[2] أخرجه أبوداود برقم (٤٩٥).
[3] أخرجه ابن السني في (عمل اليوم و الليلة) برقم (٤٠١).
[4] أخرجه الهيثمي في (مجمع الزوائد) ج٨/١٠٦.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە پیاوان کردوە قامچی، یان گۆپاڵ لە ماڵەکەیان هەڵواسێ لە شوێنێك کە هەموان بیبینن، جا گەر لە ڕەفتارێك لە ڕەفتارەکانی منداڵەکانی بەدڵ نەبو؛ هەڕەشەی بەکارهێنانی بکات، چونکە بەم هەڕەشەیە دەگەڕێنەوە و ڕەفتارە ناشیرینەکە ناکەن.

لە ئیبن عەباسەوە ﷺ گوتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((عَلقوا السوط حيثُ يراه أهل البيت فإنه آدب لهم: قامچی (دار) بەدیوار هەڵواسن بەشێوەیەك، کە ئەهلی ناو ماڵ بیبینن، چونکە قامچی تەمێ کەریانە.))[1].

لەو کاتەی دایك و باوك لێدان هەڵدەبژێرن وەك هۆیەکی تەمێ کردن و پەروەردەکردنی منالآن، پێویستە ئاگاداری چەند کارێکی گرنگ بن، کە بریتین لە:

١-ئامڕازی لێدانەکە لە نێوان ڕەق و نەرم بێت، لە عومەرەوە گێڕراوەتەوە ﷺ کەوا قامچی‌یەکی ڕەقیان بۆ هێناوە، ئەویش گوتویەتی: لەوە نەرمترم بۆ بێنن، جا قامچی‌یەکی نەرمیان بۆ هێنا و گوتی: لەوە ڕەق ترم بۆ بهێنن، جا قامچی‌یەکیان بۆ هێنا لە نێوان قامچی‌یە ڕەقەکە و نەرمەکەدا بو، گوتی: "لێدە، هەر کەسە و مافی خۆی پێ بدە"[2].

ئەمەش لەبەر ئەوەیە، گەر ئامڕازی لێدان ڕەق بێ، ئەوا دەبێتە ئازاردانی منداڵ، گەر نەرمیش بێ، ئەوا مانای مەبەستی لێدان لەدەست دەدرێ، کە ترساندنە.

٢-لێدانەکە لە نێوان توند و سوك بێت، نەبادا ئازاری تێدا بێت.

٣-لێدان لەیەك شوێن نەدرێ، بەڵکە لە چەند ئەندامێکی جەستە بدرێ، دەربارەی ئەمەش ئیمامی عومەر ﷺ دەیفەرمو: (اضرب، وأعط كلا حقه).

٤-لێدان لە ڕوخسار و سەر، یان لە ئەندامەکانی زاوزێ نەدرێ، چونکە ئەم ئەندامانە زۆر هەستیارن، کە بە لێدانێکی سوك ئازاریان پێدەگات.

[1] أخرجه الهيثمي في "مجمع الزوائد" ج٨/١٠٦.
[2] ذكره البيهقي في "السنن الكبرى" ج٨/٣٢٦.

دەربارەی ئەمەش پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إذا ضربَ أحدكم، فليتقِ الوجه: گەر یەکێك لەئێوە دەستی بەلێدان کرد، با خۆی لە ڕوخسار بپارێزێ.))[1]

ڕەنگە باشترین شوێن بۆ لێدان؛ هەردو دەست و ژێرپێیەکان و هەردو سمتی بێت، چونکە ئەو شوێنانە ئێش و ئازار دەگەیەنێ بەڵام زیان ناگەیەنێ.

٥-دایك و باوك لەکاتی توڕەبون لە منداڵ نەدەن، چونکە لێدان لە حاڵەتی توڕەبوندا وایان لێ دەکات لە حەق لابدەن و لەبەر تۆڵە سەندنەوە لێی بدەن.

٦-لە دە جار زیاتر لە منداڵ نەدرێ، لەبەر ئەوەی زیاد لەم سنورە دەبێتە زیان گەیاندن بەمنداڵ، لێدانەکە لە تەمێ کردنەوە دەردەچێ.

دەربارەی ئەمەش پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((لا يجلد فوق عشر جلدات إلا في حد من الحدود: لە (دە) جەلدە زیاتر لێ نەدرێ، مەگەر لە سنورێك لە سنورەکان بێت.))[2]

٧-وەسیلەی لێدان بۆ پەروەردە کردن لەگەڵ تەمەنی جیاجیا؛ وەسیلەیەکی سەرکەوتو نییە. لەبەر ئەوە لەسەر باوکانە وریا بن لە لێدانی ئەو منداڵانەی، کە لە تەمەنی قۆناغی کۆتایی تەمەنی هەرزەکاریدان، چونکە لێدانیان دەرەنجامێکی خراپی دەبێ.

٨-لە حاڵەتی پێویستی دا لە کاتی بەکارهێنانی لێداندا، پێویستە ئاگادار بی، کە لێدانی یەکەم لێدانێکی بەئێش بێ و ئەوانی تریش سوکتر بێ.

٩-لە کۆتاییدا هەردەبێ دوبارە وریایی بدەین، کە لەسەر دایك و باوکانە سوربن لەسەر ئەوەی بۆ پەروەردە و تەمێ کردن پەنا نەبەن بۆ لێدان، مەگەر دوای بەکارهێنانی ئامرازەکانی تر و بێ ئومێد بون لە بەرەنجامەکانی[3].

---

[1] أخرجه أبوداود برقم (٤٤٩٣).

[2] أخرجه البخاري برقم (٦٨٤٨).

[3] زۆربەی ئەم خاڵانە سودم لە کتێبی: منهج التربية النبوية، لاپەڕە ٣٦٥-٣٧٣ و کتێبی دور البيت في تربية الطفل المسلم لاپەڕە ١٣١-١٣٥ وەرگرتوە.

# ئاڕاستەی ناڕاستەوخۆ

## جێباسی یەکەم-چیرۆك:

پەروەردەکردن لە ڕێگەی ئاڕاستەی ناڕاستەوخۆ، بە هۆی ئەو چیرۆکەی ناوەڕۆکەکەی پەند و ئامۆژگاری و سود بەخشینە؛ شێوازێکی ئیسلامی ڕەسەنە، کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا و پێغەمبەر ﷺ لە زۆر فەرمودە پیرۆزەکانی دایناوە.

قورئانی پیرۆز پڕە لە بەسەرهاتی پێغەمبەران و پیاوچاکان و بێ باوەڕان و لوت بەرزان، ئەوانەی کە خوای گەورە ویستی وابوو بە تێپەڕینی کات، بەسەرهات و سەرگوزشتەیان ببێتە پەند و ئامۆژگاری بۆ بڕواداران.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز دا جەختی کردوە لەسەر ڕۆڵی چیرۆك و گرنگیی هەبونی لە پەروەردەکردندا، کە دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَآءِ مَا قَدْ سَبَقَ: ئا بەم جۆرە سەرگوزشتەی پێشینەکانت بۆ دەگێڕینەوە﴾طه:٩٩.

هەروەها فەرمویەتی: ﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ: ئێمە باشترین چیرۆکت بۆ دەگێڕینەوە﴾ یوسف:٣.

سەبارەت بە ئامانجی چیرۆك لە قورئانی پیرۆزدا، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَ: چیرۆکی هەریەك لە پێغەمبەرانت بۆ دەگێڕینەوە، تا دڵت پێی جێگیر بێت.﴾هود:١٢٠.

بێگومان ئادەمیزاد بەسروشتی خۆی حەز بەگوێ بیستی چیرۆك یان خوێندنەوەی دەکات، لەبەر ئەوەشە گەر چیرۆك لەگەڵ قسەی دارشتنی ئاسایی بەراورد بکرێ ئەوا خێراتر دەچێتە ناو دڵ و زۆرتر کاریگەری بەسەر دەروندا

دەبێ.

ئێمە تێبینی منداڵانی بچوك دەکەین، کە لە دەوری داپیرە خۆشەویستەکەیان کۆ دەبنەوە، تا چیرۆکیان بۆ بگێڕێتەوە، هەروەها تێبینی دەکەین کەوا ئەو داپیرە لە کاتی بێزاربونی لە هاوار هاواری نەوەکانی بانگیان دەکات بۆ ئەوەی چیرۆکێکیان بۆ بگێڕێتەوە، ئەوانیش خێرا دێنە لای و لە دەوری لە نزیکیەوە دادەنیشن و هەمویان گوێ بیست دەبن و بەهێمنی دادەنیشن، هیچ جوڵە و قسەیەك ناکەن و هیچ وشەیەك لە وشەکانی چیرۆکەکە و هیچ جوڵەیەکی داپیرە لە گێڕانەوەی چیرۆکەکە فەرامۆش ناکەن، جا گەر داپیرە لە باس کردنی ڕوداوەکانی چیرۆکەکە وەستا؛ دەبینین خامۆش و دڵ گران دەبن، جا گەر وەستانەکە بە مەبەست بێت بۆ پشودان یان مەبەست دار نەبێت وەك بۆ پژمین، یان باوێشك یان ئاوخواردنەوە یان دەرگاکردنەوە بێت، ئەو کاتە دەبینین منداڵان بە گەرمیەوە چاوەڕێی بە پەلە گەڕانەوەی باس کردنی چیرۆکەکە دەکەن، هەروەها شوێنەواری هەڵچون دەبینین لە گوزارشەکانی منداڵان کە گوێ بیستی ڕوداوەکانی چیرۆکەکە و بەسەرهاتی پاڵەوانەکانی دەبن، لە ترس یان خۆشی یان برسێتی یان تێنویەتی یان ماندویەتی یان دڵە ڕاوکێ و تێك چون یان سەرکەوتن یان بەزین و زەبونی و دیاردەکانی تری هەڵچونەکان و سۆزەکان.

شوێنەواری چیرۆك لەسەر دەرونی منداڵ کورت هەڵنەهاتوە لەمیانەی گێڕانەوەی یان گوێ بیستنی، یان خوێندنەوەی، بەڵکە منداڵان زۆریەیان لە ژیانی واقیعی و کردەیی ڕۆژانەیان دا لاسایی ئەو ڕوداو و ئاکار و ڕەفتارانە دەکەنەوە، کە لە چیرۆکەکەدا هاتوە.

ئەوەی لە پێشەوە باس کرا دەربارەی شوێنەواری چیرۆك لای منداڵان و گوێ بیستنیان بەباشی، لەم ڕۆژانەماندا بەوێنەیەکی زۆر گەورەتر لەلای منداڵەکانمان دەبینین، ئەویش لە ڕێی بەرنامەکانی منداڵاندا، کە لە تەلەفزیۆن پەخش دەکرێن لە زنجیرەکان و گێڕانەوەکان و چیرۆك و ڕوداوەکان.

پاشان شوێنەواری ئەم چیرۆکە لە گشت قۆناخەکانی گەشەکردنی دەرونی و پەروەردەیی و کۆمەڵایەتیدا هاودەم دەبێت، لەگەڵ کەسەکە لەبەر ئەوە قوتابی ئامادەیی و ناوەندی و دوانـاوەندی و زانکۆیی و گشت ئادەمیزادێك چ نەخوێندەوار بێت، یان ڕۆشنبیر دەکەوێتە ژێر کاریگەری چیرۆك، ئەگەر چی بابەتەکان و سروشتی بابەتەکان جیابێ بە قۆناخەکانی گەشەکردنی پێکهاتەیی و بەجیاوازی ئاستە ژیری و کۆمەڵایەتییەکان هەروەها جیاواز دەبێ بەگوێرەی جیاوازی بوارەکانی حەز و گرنگیدانەکان.

مامۆستا کاتێك چەند ڕاستیەکی ڕوت دەگێڕێتەوە، قوتابییەکانی بێزاری لێ بەدی دەکەن، بەڵام گەر چیرۆکی لەگەڵ دابێ ئەوا گۆڕانێك لە دانیشتنی قوتابیەکان بەدی دەکات و واق و وڕمان لە چاو بێ دەنگی و گوێ شل کردنیان لێ دەبینرێ.

هەروەها کاتێك باوك و پەروەردیار فەرمان و ئامۆژگاری بەوشکی و ڕوتی ئاراستەی منداڵەکانی دەکات؛ قسەکانی هیچ بەدەمەوە هاتن و وەرگرتنی پێویستی نابێ، بەڵام گەر ئەو بیرۆکەیەی دەیەوێ بخاتە ڕوو، ئەوا لەمیانەی چیرۆکێکی سەرنج ڕاکێش، زیاتر وەردەگیرێ، لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر دایك و باوك وریابن، کە ئەم کاریگەرە گەورەی چیرۆك بقۆزنەوە کە لە ئاراستەکردنی منداڵان و سەروەریاندا هەیە.

کاریگەری چیرۆك لەسەر دەرونی منداڵاندا لەمیانەی چەند خاڵێکەوە دێتە دی، کە گرنگترینیان بریتی‌یە لە:

حەزکردنی منداڵان بەزیادە فێربون، پاڵیان دەنێ بۆ موتابەعەکردنی چیرۆکەکە تا کۆتایی، بۆ ئاشنا بون بە پاشماوەی ڕوداوەکانی و کۆتایی هاتنی، من باش لە یادمە لەو کاتەی قورئانم لەبەر دەستی باوکم (خوا بیپارێزێ) دەخوێندەوە، کاتێك گەیشتمە سورەی یوسف زۆر حەزم کرد بیخوێنمەوە. پێشتریش ژمارەیەکی زۆر لە پەڕاوەکانیم خوێندبۆوە و لە خوێندنەوە ماندو

ببوم، بەڵام نەمتوانی واز لە سورەتەکە بهێنم، ئەوە بو بەرگری ماندو بـوم کـرد تاکۆتایم بەخوێندنەوەی هێنا.

دوەم شت ئەوەیە کە منداڵ لە چیرۆکەکەدا خۆی، یان یەك لـەو کەسـایەتیانە دەبینێتەوە کە ئەمـەش پـاڵی دەنـێ بـۆ بـەدواداچونی چیرۆکەکـە و ئاشـنابون بەڕوداوەکانی.

لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ زۆر چـیرۆك هـاتووە، کـە زۆر وێنەی کۆمەڵایەتی و دەرونی ڕادەنوێنێ؛ کە هەندێکی وەك نمونـەی پـەروەردەیی باس دەکەین:

**چیرۆکی بەدیهێنانی ئادەم و سوجدەی فریشتان بۆی:**

یەکەم چیرۆکە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسی دەکـات، خـوای گـەورە دەفەرموێ:

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَـٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ قَالُوا۟ سُبْحَـٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٢﴾ قَالَ يَـٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ ۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٣٣﴾ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِـَٔادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٣٤﴾ وَقُلْنَا يَـٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَـٰذِهِ

ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ (٣٥) فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا
مِمَّا كَانَا فِيهِ ۖ وَقُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ
مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ (٣٦) فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ ۚ
إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ (٣٧) قُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ مِنْهَا جَمِيعًا ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم
مِّنِّى هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَاىَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ
(٣٨)﴾البقرة: ٣٠-٣٨.

هەروەها فەرمویەتی: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَٰكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَٰكُمْ ثُمَّ قُلْنَا
لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ
(١١) قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ ۖ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِى مِن
نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ (١٢) قَالَ فَٱهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ
فِيهَا فَٱخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ (١٣) قَالَ أَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ (١٤)
قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ (١٥) قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ
ٱلْمُسْتَقِيمَ (١٦) ثُمَّ لَءَاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ
وَعَن شَمَآئِلِهِمْ ۖ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ (١٧) قَالَ ٱخْرُجْ مِنْهَا
مَذْءُومًا مَّدْحُورًا ۖ لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ أَجْمَعِينَ (١٨)
وَيَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ فَكُلَا مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا
هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ (١٩) فَوَسْوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ
لِيُبْدِىَ لَهُمَا مَا وُۥرِىَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا
عَنْ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَٰلِدِينَ (٢٠)

وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّى لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّـٰصِحِينَ ﴿٢١﴾ فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍۚ فَلَمَّا
ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ
ٱلْجَنَّةِۖ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ
ٱلشَّيْطَـٰنَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٢﴾ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ
لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ
عَدُوٌّۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَـٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٢٤﴾ قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ
وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ ﴿٢٥﴾ يَـٰبَنِىٓ ءَادَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا
يُوَٰرِى سَوْءَٰتِكُمْ وَرِيشًاۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌۚ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَـٰتِ
ٱللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٢٦﴾ يَـٰبَنِىٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ كَمَآ
أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَٰتِهِمَآۗ إِنَّهُۥ
يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْۗ إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَـٰطِينَ أَوْلِيَآءَ
لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ الاعراف: ١١-٢٧.

**راڤه و لێدوان:**

ویستی خوا وابوو، دانایی‌یه‌كه‌ی وای ده‌خواست ، كه‌ئاده‌م و نه‌وه‌كانی بـه‌دی بهێنێ تاوه‌كو له‌سه‌ر زه‌وی جێ نشین بن و نوژه‌ن و ئـاوه‌دانی بكه‌نـه‌وه. جـا بـه فریشته‌كانی ڕاگه‌یاند كه‌وا دروست كراوێكی تر به‌دی ده‌هێنێ كـه له‌سـه‌ر زه‌وی كۆشش ده‌كه‌ن و به‌سه‌ریدا ده‌ڕۆن و له هه‌مو شوێنه‌كانی زه‌ویدا وه‌چه‌كانیان بڵاو ده‌بنه‌وه و له ڕواوه‌كانی ده‌خۆن و له‌ناو زه‌ویدا خێر و بێری ده‌رده‌هێنن و هه‌ندێك هه‌ندێكیان بجێ ده‌هێڵن.

فریشته‌كان دروست كراوێكن خوای گه‌وره بۆ په‌رستنی خۆی هـه‌ڵی بـژاردون، به‌گه‌وره‌یی خۆی نیعمه‌ت و به‌خشش و خۆشه‌ویستی پێ به‌خشـیون، پشـتیوانی

·کردون بۆ ڕەزامەندی خۆی، ڕێنوێنی کردون بۆ فەرمانبەری کردنــی، جـا ئـەوان ترسان ئەو دروســت کــراوەی خــوا، دروســتکراوێکی وەك ئـەوان نـەبێ و کـەم و کورتیان لیّ بێتە دی، یان سەرپێچی بکەن، لەبـەر ئـەوە خـێرا پاکانـەی خـودی خۆیان کرد و گوتیان: چۆن کەسانی تر دروست دەکەی کە ئێمە بـە دڵسـۆزییەوە بەپاکت دادەنێین و سوپاست دەکەین و ناوت بە پیرۆز ڕادەگرین، کەچی ئەوانـەی لەسەر زەوی جیّ نشینیان دەکەی، هەر دەبــیّ لەســەر ســود و قــازانجی دنیــایی جیاوازی بکەوێتە نێوانیانەوە و ئەوەی خێر و بێرە بۆ خۆیان ڕا بکێشن، جا ئــەو کاتە خراپەی تێدا دەکەن و خوێنی زۆر دەڕێژن و گیانی پاك و بیّ تاوان دەکوژن، خوای گەورەش (پاکی و بیّ گەردی بۆ ئەو) وەڵامێکی دڵ ئارام کەری دانەوە.

خوای گەورە ئادەمی لە قوڕێکی ڕەش دروســت کــرد، لـەگیانی خــۆی فــوی پیاداکرد و بوە مرۆڤێکی ڕێك، پاشان خوای گەورە فەرمانی بە فریشتەکان کــرد سوجدەی سوپاس گوزاری بۆ ئــادەم ببـەن، ئـەوانیش بـەمل کەچیــەوە وەڵامــی پەروەردگاریانی داوە و سوجدەیان بۆ ئــادەم بــرد و بەگــەورەیان دانــا، جگـە لـە ئیبلیس، سەرپێچی فەرمانی خوای کرد و خۆی بەگەورە زانی و بوە یــەکێك لـە بیّ بڕوایان.

کاتێك خوای گەورە دەربارەی هۆی ســوجدە نـەبردنی پرسـیاری لـە ئیبلیـس کرد، ئیبلیس گوتی: بە ڕەگەز من لــە ئــادەم باشــترم و لەناوەڕۆکیشــمەوە لـەو پاکترم، گومانی برد کە کەس لەو بەتوانا تر نیە و گوتی: من لــەو باشــترم، جـا بەئاشکرا سەرپێچیّ خوای کرد و خۆی بەگەورە زانی، کە فەرمانی خوا جیّبەجیّ بکات، وەك بڵێی تانە و تەشەری دەدا لــە دادگــەری و زانســتی خــوادا، خــوای گەورەش پاداشتی سەرپێچی کردنەکەی دایــەوە بەبێبــەش بــون و دەرکــردن لــە ڕەحمەتی خــوا، ئیبلیســیش داوای لــە پــەروەردگاری کــرد کــە تــا ڕۆژی دوایــی بیهێڵێتەوە و ژیانی پیّ بدات، خوای گەورەش داواکەی قبوڵ کرد.

ئامانجی ئیبلیس لەمەدا بریتی بو لە بــەکارهێنانی وزە و تواناکــانی لەســەر

لێشێواندن و گومڕاکردنی ئادەمیزاد، بەمەش جەنگ دروست بو لە نێوان ئادەم و نەوەکانی و ئیبلیس و نەوەکانی.

خوای گەورە ئادەم و خێزانەکەی لە بەهەشت نشین کرد و خۆشیەکانی بەهەشتی بۆ حەلاڵ کردن، بەمەبەستی تاقی کردنەوەیان قەدەغەی نزیك بونەوە لە دارێك لە دارەکانی کردن، یەکەم ڕوبەڕوبونەوەی نێوان ئادەم و ئیبلیس ئەوەبو، کە ئیبلیس لە بەهەشت دا وەسوەسەی خستە دڵیەوە و وای تێگەیاند، کە ئەو هەڵوێستەی و ئامۆژگاری بەڕاستگۆیی دەکات، جا خۆی بۆ ئادەم و خێزانەکەی وا پیشاندا، کە دڵی بۆیان دەسوتێ بەبێبەش بونیان لەم نیعمەتەیان، کاتێك بینی ئەوان پشتی تێ دەکەن، سوێندی بۆ خواردن کە نیەتی پاکە، هەر کە بەقسەیان کرد و لە فەرمانی پەروەردگاریان دەرچون، خوا نیعمەتی خۆی لێ سەندنەوە، بەڵام ئەوان پەلەیان کرد بۆ پەشیمان بونەوە و تەوبەکردن لە خوای گەورە و سور نەبون لەسەر سەرپێچی کردنی، خوای گەورەش پەشیمان بونەوەیانی لێ وەرگرتن و لە تاوانەکانیان خۆش بو و خستنیە تاقیکردنەوەیەکی تری درێژ تر، کە هەلی زۆری تێدایە بۆ پەشیمانی و تەوبەکردن و لێخۆش بون و چاکسازی. لەتاقی کردنەوەکەیاندا، ئیبلیسیشی تێدا زیاد کرد تاوەکو هەڵێکی درێژی بۆ بڕەخسێ، تا خوای گەورە بیکاتە بەڵگە و بیانو لەسەری[1].

## گرنگترین خاڵە پەروەردەییەکانی ئەم چیرۆکە بریتییە لە:

١-خوای گەورە لەمیانەی چەند دیاردەیەکدا ڕیزی لە ئادەم و نەوەکانی گرتوە وەك: بەدەستی خۆی دروستی کردوە، لەگیانی خۆی گیانی پێدا کردوە، ناوەکانی فێرکردوە، فەرمانی بە فریشتەکان کرد، کە سوجدەی بۆ ببەن و لە بەهەشت نشینی کردوە، لەسەر زەوی کردویەتیە جێنشین، جا لەبەر ئەوە لەسەر ئادەمیزادە سوپاسی ئەم نیعمەتانە بکات، ئەویش بە بەجێ هێنانی مافی خوای گەورە و سوپاس کردنی.

---

[1] قصص القرآن،ص٥-١٠. بەدەستکارییەوە.

٢-خۆبەکەم گرتنــی فریشــتەکان، هۆیــەك بــو بــۆ ســەرکەوتنیان لــە تـاقی کردنەوەی خوای گەورە، لەو کاتەی بە سوجدە بردن بۆ ئـادەم وەلآمــی فــەرمانی خوایان دایەوە، لــە خۆبــایی و خــۆ بەگــەورە زانــی ئیبلیســیش هۆیــەك بــو بــۆ تورەبونی خوای گەورە لێی و دەرکردنی لە سۆز و بەزەیی خوای گەورە.

٣-دژایــەتی نێــوان ئیبلیــس و ئــادەم و نێــوان نــەوەکانی هـــەردو لایـــان: دژایەتیــەکی دێرینــە، کەواتــە هــەرگیز نــاکرێ ئیبلیـــس و نەوەکـــەی ببنـــە ئامۆژگاریکەری ئادەمیزاد.

لەبەر ئەوە لەســەر ئــادەمیزادە هۆشــیار و وریــابێ لــەو فێــڵ و شــێوازانەی ئیبلیس، کە لــە ڕێیانــەوە دەیــەوێ توشــی ســەرپێچی‌یەکانی خــوای گــەورەیان بکات.

٤-خوای گەورە فریشتەکانی دروست کردوە و لە گوناه و تاوان و ســەرپێچی پاراســتون، ئــادەم و نەوەکانیشــی دروســت کــردوە، بــەلآم لــە هەڵــە و گونــاه نەیپاراستون، لەبەر ئەوە ئادەم سەرەڕای -گەورەی پلــە و پایــەی- لــە مرۆڤــان یەکەم کەســی تاوانکــار بــو، بــەلآم خــوای گــەورە دەروازەی تەوبــە و پەشــیمان بونەوەی بۆ کردونەتەوە، لەبەر ئەوە لەسەریانە دوای هــەمو گونــاهێك پەلــە لــە تەوبە بکەن.

٥-خوای گەورە ئــادەم و نــەوەکانی کردۆتــە جــێ نشــینی زەوی و زەوی بــۆ فەراهەم کردون، تاوەکو ئاوەدانی بکەنەوە و سود لە خێر و بــێری وەربگــرن، بــۆ ئەوەی ببینرێ ئەو نیعمەتانەی، کە خــوا پێــی بەخشــیون چــۆن بــۆ پەرســتنی و سوپاسکردنی بەکاردەهێنرێ.

٦-تــاقی کردنــەوەش هــەر بەردەوامــە، مــل ملانــێی نێـــوان ئیبلیـــس و سەربازەکانی و لە نێوان ئادەمیزاد بەردەوامە هەتا ئەو کاتــەی زەوی و هــەرچی وا بەسەریەوەیە بۆ خوا دەمێنێتەوە.

## ئیبراهیم و ئیسماعیل (سەلامی خوایان لێبێ):

لە قورئانی پیرۆزدا زۆر چیرۆك سەبارەت بە ئیبراهیم (عليه السلام) و وێنەی جیاجیای ژیانی و خەبات و جیهادی لەبانگەوازی کردن بۆ خوا هاتوە، ئێمەش باسی یەکێك لەم چیرۆکانە دەکەین، کە پەیوەندی لەگەڵ ئیسماعیلی کوڕی (عليه السلام) هەیە، خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي سَيَهْدِينِ ﴿٩٩﴾ رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ ﴿١٠٠﴾ فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلَامٍ حَلِيمٍ ﴿١٠١﴾ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ السَّعْيَ قَالَ يَا بُنَيَّ إِنِّي أَرَىٰ فِي الْمَنَامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ فَانظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِي إِن شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ ﴿١٠٢﴾ فَلَمَّا أَسْلَمَا وَتَلَّهُ لِلْجَبِينِ ﴿١٠٣﴾ وَنَادَيْنَاهُ أَن يَا إِبْرَاهِيمُ ﴿١٠٤﴾ قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤْيَا ۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ الْبَلَاءُ الْمُبِينُ ﴿١٠٦﴾ وَفَدَيْنَاهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ ﴿١٠٧﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ ﴿١٠٨﴾ سَلَامٌ عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ ﴿١٠٩﴾﴾ الصافات:٩٩-١٠٩.

**ڕاڤە و لێدوان:**

خوای گەورە ئیبراهیمی هەڵبژارد و کردی بە پێغەمبەر، ئیبراهیم پەیامی خوای بەجوانترین شێوە گەیاند و کۆششێکی زۆری کرد، کە قەومەکەی بۆ لای خوای گەورە بانگ بکات، بەڵام ئەوان بەتوندترین جۆرەکانی ئازار ئازاریان دا، جا کە بانگەوازی کردنیان بوە مەحاڵ؛ بۆ بڕواهێنان کەس بەدەم بانگەوازەکەیەوە نەهات، جگە لە (سارە)ی خێزانی، جا خۆی لێ دورە پەرێز کردن و پەنای دا بەلای خوای گەورە، خوای گەورەش مژدەی کوڕێکی نەرم و نیانی پێ بەخشی.

ئیبراهیم (عليه السلام) بەساڵاچو بو هێشتا منداڵی پێ نەبەخشرابو، لەبەر ئەوە

ئیبراهیم لەم کارە سەری سوڕما و بەدڵیدا نەدەهات ئەمە ببێ، بەڵام خوای گەورە بەیادی هێنایەوە، هەر کە ئەو کار بەجێیە و زانایە بەهەمو شت، بەتوانایە لەسەر هەمو شتێکدا، ئەوەی بو ویستی خوا بو، جا ئیبراهیم کوڕێکی ژیر و زانای پێ بەخشرا، ئیبراهیم زۆری خۆش دەویست، ئەو خۆشەویستی‌یە سروشتی‌یەی، کە خوای گەورە لە دڵ و دەرونی گشت باوکێکی ڕواندوە، ئیبراهیم خۆشەویستی‌یەکەی بۆ کوڕەکەی زۆر تر بوو، لەبەر ئەوەی دوای تەمەنێکی درێژ، کە لە منداڵ بێ‌بەش بو پیێ بەخشرا، ئەم کوڕە لە زانست و ژیری دا ڕۆشنایی چاوی باوکی بو.

بەڵام خوای گەورە ویستی ڕاستگۆیی ئیبراهیم و ئیسماعیل و ڕاستگۆیی خۆشەویستیان بۆ فەرمانی خوای گەورە تاقی بکاتەوە، تاقی‌کردنەوەکەش زۆر زەحمەت و دژوارە، کە جگە لە پێغەمبەران و خودا پەرستانی ڕاستی خاوەن عەزم لیێ دەرناچن.

ئیبراهیم لە خەویدا بینی وا ئیسماعیلی کوڕی سەر دەبڕێ، دیارە خەونی پێغەمبەرانیش سروش (وحي)یە، ئیبراهیم دو دڵ نەبو گومانیشی نەبو لەوەی کە بینی، جا یەکسەر هەواڵی ئەمەی بە کوڕەکەیدا، ئەویش بۆ فەرمانی خوا وەڵامی ڕەزامەندی دایەوە و بەباوکی گوت بەفەرمانی خوا بکات، جا باوکە هاتە پێشەوە بۆ سەربڕینی کوڕەکەی! کوڕەش مل کەچ بو بۆ ئەوەی باوکی سەری ببڕی، کاتێك خوای گەورە ڕاستگۆیی هەردوکیان و مل کەچی بونیان بۆ فەرمانەکەی بینی، سەرکەوتنیانی لەم تاقی‌کردنەوەیەدا ئاشکرا کرد، لە جیاتی ئیسماعیل بەرانێکی گەورەی نارد بۆ سەربڕین و خەڵاتی ئیبراهیم (ﷺ)ی کرد بەوەی، کە کردی بە باوکی گشت ئەو پێغەمبەرانەی، کە لەدوای ئەو دێن و لە نەوەکەی کتێب و پێغەمبەرانی دانا، گشت نەتەوەکانیش بونە پەیڕەوانی، هەروا خەڵاتی ئیسماعیلی کرد بەوەی، کە لە نەوەی ئەودا (محمد) ﷺی کردە کۆتا پێغەمبەر و گەورەی هەمو کوڕی ئادەم، ئەمەش پاداشتی ڕاستگۆیی‌یانە.

**گرنگترین خاڵەکانی پەروەردەیی لە چیرۆکەکە بریتییە لە:**

١-لەسەر بانگبەری چاکە خوازە لە هەمو رۆژگارێك دا پێشبینی کۆسپ و لەمپەر و ئازاری دوژمنانی چاکە و رێنمونی بکات.

٢-گەر ئادەمیزاد هەستی بەنائومێدی کرد لە بانگ کردنی خەڵکانی تر و لەئازاریان، ئەوا لەسەری پێویستە کە پەنا بباتە خوای گەورە و داوای یارمەتی لیٚ بکات.

٣-توانای خوای گەورە هیچ سنورێکی نیە و هیچ کۆسپ و بەربەرچێك ناتوانیٚ بەرەو ڕوی بوەستیٚ.

٤-لەسەر ئادەمیزادە کە داوا لەخوا بکات و متمانەی هەبیٚ لە قبولٚ بونی و بەتوانایی خوا.

٥-خەلاٚت و بەخشینی خوای گەورە بۆ بەندەکان؛ بەتاقیکردنەوە و گرفتاریی (إبتلاء) بەستراوەتەوە.

٦-تاقی کردنەوەی خوا بۆ بەندە چەند گەورە بیٚ، ئەوا خەلاٚت و پاداشتی خوا بۆ بەندە ئەوەندە گەورە دەبێت.

٧-پەیوەست بونی ئادەمیزاد بەهەر نیعمەتێك لە نیعمەتەکانی خوای گەورە ماڵ یان منداڵ یان...، پەردە دەخاتە نێوان بەندە و خوای گەورە، ئەم نیعمەتەش دەبێتە نەمان و مایەي لەناو چون.

سەبارەت بە چیرۆکەکانی قورئان نمونە زۆرن و تەنها ئەوەندەی باسمان کرد بەسە، ئاماژەش بە چەند چیرۆکێکی تر دەکەین، کە ئەمانەن:

-چیرۆکی دو کوڕەکەی ئادەم.

-بانگەوازی پێغەمبەرەکان بۆ قەومەکەیان (نوح، هود، صالح، لوط، یعقوب).

-ئیبراهیم و بانگەوازەکەی بۆ قەومەکەی.

-ئیبراهیم و ئیسماعیل و دروست کردنی کەعبە.

-یەعقوب و کوڕەکانی.

-یوسف و ژنی عەزیز.

-موسا و فیرعەون.

-موسا و شوعەیب و کچەکانی.

-مانگاکەی نەوەی ئیسرائیل.

-موسا و خَضِر.

-سولەیمان و بەلقیس.

-عوزێر.

-زەکەریا و یەحیا.

-مەریەم و لەدایکبونی مەسیح.

-پیلانەکانی جولەکە لەسەر عیسا.

-ذوالقرنین.

-یارانی ئەشکەوت (أصحاب الکهف).

-چاڵ لێدەران (أصحاب الاخدود).

-فیل سوارەکان (أصحاب الفیل).

جگە لەمانەش زۆر چیرۆکی تریش هەیە.

سوننەتی پێغەمبەریش ﷺ پڕە لە چیرۆکی ئامانجدار، کە هەندێکی وەك نمونە لێ باس دەکەین:

**کەچەڵ ، بەڵەك ، کوێر:**

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((سێ پیاوی بەنی ئیسرائیل هەبون، یەکێکیان بەڵەك و گول، دوەمیان کەچەڵ و سێیەمیان کوێر بو، خوا ویستی تاقیان بکاتەوە، جا فریشتەیەکی لە شێوەی مرۆڤ نارده لایان.

یەکەمجار چوە لای بەڵەکەکە و پێی گوت: لەم جیهانەدا چ شتێکت بەلاوە لە هەمو شت خۆشترە؟

ئەویش گوتی: حەز دەکەم ڕەنگم جوان بێت و پێستم چاك بێتەوە و ئەو شتانەی کە بەهۆی ئەوەوە خەڵك بێزم لیٚ دەکەنەوە نەمێنن و منیش وەك مرۆڤێکی جوانم لیٚبیٚ.

فریشتەکە دەستێکی هێنا بەسەریدا و چی نەخۆشی هەبو هیچی نەما و بو بە مرۆڤێکی جوان.

ئینجا فریشتەکە گوتی: ئەی لە ماڵی دنیا حەزت لە چیە؟

گوتی: حوشتر، بەفەرمانی خوا وشترێکی سکپڕی پیٚ بەخشی و دوعای بەرەکەتی بۆ کرد.

دوای ئەو چوە لای کەچەڵەکە و گوتی: کام شتت لە هەمو شتێك لەلا خۆشترە؟

ئەویش گوتی: قژێکی پڕ و جوان و برینەکانی سەرم چاك ببنەوە، ئیتر خەڵك بێزم لیٚ نەکەن.

بەفەرمانی خوا سەری چاك بۆوە و قژێکی پڕ و جوانی لیٚ ڕوا.

ئینجا گوتی: ئەی لە ماڵ و سامانی دنیا حەز لە چی دەکەیت؟

گوتی: حەز لە مانگا دەکەم، بەفەرمانی خوا مانگایەکی ئاوسی پیٚ بەخشی و دوعای بەرەکەتی بۆ کرد.

دواجار چوە لای کوێرە و پیٚی گوت: چ شتێکت لە هەمو شت لەلا خۆشترە؟

ئەویش گوتی: حەز دەکەم چاوەکانم چاك ببنەوە و منیش وەك ئەو خەڵکە هەمو شتێك ببینم.

بەفەرمانی خوا چاوەکانی چاك بونەوە.

ئینجا پێی گوت: لەماڵی دنیا چ شتێکت لەلا خۆشەویستە؟

گوتی: مەڕ ئیتر بەفەرمانی خوا دو مەڕی نێر و میٚی پیٚ بەخشی.

خوا بەرەکەتی خستە سامانی هەمویان و بونە خاوەن ئاژەڵێکی زۆر.

پاش ماوەیەکی زۆر هەمان فریشتە خۆی گۆڕی و خۆی وەك ئەوان لێکرد، پێش هەموان چوە لای بەڵەکەکە و گوتی: پیاوێکی هەژارم و هیچ پارەم پێ نەماوە ناتوانم سەفەرەکەم تەواو بکەم، پاش خوا هیوام بە تۆیە و بۆ خاتری ئەو خوایەی، کە تۆی لە نەخۆشی چاککردەوە و ئەم ڕەنگە جوانەی پێ بەخشیت، ئەم هەمو سامانەی پێ بەخشیت، حوشترێکم بدەیە، تا سەفەرەکەمی پێ تەواو بکەم.

ئەویش لە وەڵام دا گوتی: سواڵکەر لەم سەردەمە دا زۆربون، من ناتوانم داواکەت بێنمە دی.

فریشتەکە گوتی: وەك لەوەو پێش تۆم دیبێ وایە تۆ بەڵەك بویت و هەمو کەس قێزیان لێ دەکردیتەوە و هەژار بوی، خوا ئەم سامانەی پێ دای؟

گوتی: نەخێر من ئەم سامانەم لە باوك و باپیرانەوە بۆ بەجێ ماوە.

فریشتەکە گوتی: ئەگەر درۆ بکەیت خوا وەك خۆت لێ بکاتەوە.

دوایی چوە لای کەچەڵ و بەهەمان شێوە لەگەڵیا دوا، ئەویش هەروەك بەڵەکەکە وەڵامی دایەوە و هیچی نەدایە.

بەویشی گوت: ئەگەر درۆ بکەیت خوا وەك خۆت لێ بکاتەوە.

دوا جار چوە لای کوێرەکە و هەمان داوای لێ کرد و پێی گوت: بەڵکو مەڕێکم پێ ببەخشیت تابتوانم سەفەرەکەم تەواو بکەم.

کوێرەکە زۆر جوامێرانە بێ لەخۆ بایی بون گوتی:

من کوێر بوم خوا چاومی چاککردەوە، هەژار بوم خوا ئەم سامانەی پێ بەخشیم ئێستاش من ڕێگای هیچت لێ ناگرم، من خاوەنی هیچ نیم.

ئیتر فریشتەکە هاتە قسە و گوتی: ماڵی خۆت بۆخۆت ئەمە تاقیکردنەوەیەکی خوایی بوو، خوا لەتۆ ڕازییە، ڕق و غەزەبی داباری بەسەر دو

هاوڕێکەتدا))[1].

**ڕاڤە و لێدوان:**

خوای گەورە دنیای بۆ تاقیکردنەوەی ئادەمیزاد دروست کردوە و، هەمو ئادەمیزادێك بەخششی زۆری داوەتێ - کە زۆربەیان لە بیریان کردوە و لێی بێ ئاگان- شایستەی سوپاس و بەندایەتی کردنە، خوای گەورە بەرامبەر ئەم نیعمەتە زۆرانە، گشت ئادەمیزادێکی توشی گرفتاریەك کردوە، کە ئارامی و ڕازی بونی بە قەزا و قەدەری خوای گەورە تاقی دەکاتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ چیرۆکی سێ کەسی بۆ گێڕاینەتەوە، کە خوای گەورە توشی بەڵەکی و کەچەڵی و کوێری کردبون، گومانی تێدا نیە کە ئەم جۆرە بەڵایانە زەحمەتە ئادەمیزاد خۆی لەبەر ڕابگرێ، کاتێك هەست دەکات خەڵك بێزی لێ دەکەن و لێی دور دەکەونەوە و لە دانیشتنەکانیان بەشداریان ناکەن.

جا هەر یەکێك لەوانە لە خوای گەورە دەپاڕایەوە کە لەم گرفتاریە ڕزگاری بکات و چاکی بکاتەوە و نیعمەتی بەسەر دا برێژێ، هەروا پەیمان بەخوا دەدات کە مافی خۆی بەجێ بهێنێ بەرامبەر بەوەی کە نیعمەتی بەسەردا کردوە و سوپاسی بکات. دیارە خوای گەورە حەقیقەتی هەر یەکێك لەوان دەزانێ، بەڵام ویستی خوا وای خواست، کە جارێکی تر تاقی کردنەوەیەکی زەحمەتتریان بکاتەوە، ئەوەبو فریشتەیەك لە فریشتەکانی نارد، ئەوانیشی لە نەخۆشی چاك کردەوە و سامانیان بەپێی حەزی خۆیان پێ بەخشرا، پاشان نۆرەی تاقی کردنەوە هات، جا فریشتەکە وێنەی هەر یەکێك لەوان کەپێشتر توشی ببون هاتە لایان، جا هاتە لای بەڵەکەکە لەسەر شێوەی بەڵەك و هاتە لای کەچەڵ بەشێوەی کەچەڵ و بۆ لای کوێر بە شێوەی کوێر و داوای یارمەتی لێدەکردن، کاتێك هیچیان پێ نەبەخشی خۆیان لێ گۆڕا، فریشتەکەش پێشینەیانی بەبیر هێنایەوە، جا هەر یەکێك لە بەڵەك و کەچەڵ نکوڵی کرد، کە بەو شێوەیە بوبێ،

[1] أخرجه مسلم برقم (٢٩٦٤).

هەر یەکەیان دەیگوت: هەڵەت کرد، من پێشانیش هەر وا بوم و ئەو ماڵ و سامانەم لە باب و باپیرانم بۆم بەجێماوە، فریشتەکەش گوتی:

گەر درۆ بکەی داوا لەخوا دەکەم بتگەڕێنێتەوە حاڵەتی یەکەم، کە بەڵەکی و کەچەڵی و هەژاری بوە.

ئەمە حاڵی فریشتەکە بو لەگەڵ بەڵەك و کەچەڵ.

بەڵام کوێرەکە لە تاقیکردنەوەکە سەرکەوت و لەگەڵ خوای گەورە راستگۆ بو بەو پەیمانەی پێی دا، جا کاتێك فریشتەکە لەسەر شێوەی هەژارێك هاتە لای؛ خێرا یارمەتی دا و دەستی یارمەتی بۆ درێژ کرد و پێی گوت: چۆن یارمەتیت نادەم منیش وەك تۆ بوم و بەڵکە کەمتریش، خوای گەورە چاکەی لەگەڵدا کردوم، ئەوە دەبینی ئەو خێر و بێرەی پێ بەخشیوم؟! کە لەسەرم پێویست دەکات سوپاسی نیعمەتەکانی بکەم.

فریشتەکە پێی گوت: خوای گەورە بەرەکەت بهاوێتە رزق و رۆزیتەوە و چاکە و نیعمەتی خۆی بۆت زیاد بکات.

**گرنگترین خاڵە پەروەردەیی‌یەکانی چیرۆکەکە بریتی‌یە لە:**

١-ژیانی دنیا خانەی بەڵا و تاقی کردنەوەیە، ئادەمیزاد مادام لە دنیادایە، لەسەریەتی کە خۆی ئامادە بکات بۆ دان بەخۆ داگرتنی بەرامبەر بە بەڵا و ناخۆشی بەرەزامەندی و ئیمانەوە.

٢-لەسەر ئادەمیزادە کە بەقەزا و قەدەری خوا ڕازی بێت و داوای لەش ساغی لە خوا بکات، لەسەریەتی ئاواتە خوازی.شتێك نەبێ کە نازانێ چاکە یان خراپە بۆی.

٣-گرنگ نیە رزق و رۆزی کەم و زۆر بێت، بەڵکە گرنگتر لەمە ئەوەیە کە خوای گەورە بەرەکەتی بهاوێتە ناوێ، جا گەر بەرەکەتی تێدا بو؛ ئەوا کەمەکە زۆر دەبێ، گەر بەرەکەتی تێدا نەبێ ئەوا زۆریش بێت هەر کەمە.

٤-گرنگترین شت کە ئادەمیزاد سوپاسی نیعمەتەکانی خوای پێ بکات؛

بریتی‌یە لە بەکارهێنانی ئەم نیعمەتانە بۆ ڕەزامەندی خوا.

٥-لەسەر ئادەمیزادە کە یەکێك داوای شتێکی لیّ دەکات، یان داوای چاکەیەکی لیّ دەکات بە نائومێدی نەیگەڕێنێتەوە، چونکە نازانیّ ڕاستگۆ و درۆزن کامەیانە. ڕەنگە ئەوەی دەیگەڕێنیتەوە ڕاستگۆ بێت و پێویستی پیّی بیّ.

٦-سوپاس کردن لەسەر نیعمەتەکانی خوا و بەکارهێنانی لە ڕەزامەندی خوای گەورە؛ گرنگترین هۆیەکانی بەردەوامی نیعمەتەکان و زیاد بونیەتی.

٧-هەموو نیعمەتێك کە خوای گەورە بەبەندەی دەبەخشیّ، یان توشی بەلاّ و ناخۆشیەکی دەکات، ئەمە تاقی‌کردنەویە هەردەبیّ هەمو ئادەمیزادێك بەرەنجامی ئەم تاقی کردنەوەیە لەدنیا، یان لە ڕۆژی دوایی بدروێتەوە.

فەرمودەکانی پێغەمبەریش ﷺ پڕە لە چیرۆکی جوان و کاریگەر، کە هەندێکیان درێژە و هەندێکی تر کورتە، نمونەش لەسەری زۆرە و بەوەندەی باس کرا واز دەهێنین، داواش لە خوێنەر دەکەین گرنگی بدات بەم ڕێگە پەروەردەیی‌یە و لە ئاراستەکردنی مندالآن سودی لیّ وەربگریّ و کاریان تیّ بکات.

## جێباسی دوەم–نمونەکان:

لێرەدا مەبەست لە نمونەکان بریتی‌یە لە (هێنانەوەی نمونەی شتێك یان وەسف کردنی و پەردە لادان لەسەر ڕاستیەکەی ئەویش لەرێگەی مەجازەوە بێت یان وە حەقیقەتی خۆی بەوێك چون (تشبیه) بێت. باشترینیان بریتی‌یە لە هێنانەوەی نمونەی مانای ماقولّ و موجەرەد -بەوێنەی بەرهەست- مادی)[1].

گومانی تێدا نیە کە زۆر جار ئادەمیزاد ناتوانی دەرك بە چاکە و خراپە و

[1] أصول التربیة الاسلامیة و أسالیبها، لاپەڕە ٢٤٦. لە (تفسیر القرآن الحکیم)ی رشید رضا نەقل کراوە ج١/١٦٧.

ناكامی ئەو كارەی بكات، كە ئەنجامی داوە، یان ئەنجامی دەدات هەتا یەكێك دێ نمونەیەكی باوی بۆ دەهێنێتەوە، ئەم كارەش زیاتر لەلای منداڵان دیارترە، ئەوانەی ناتوانن ئەو شتە ڕوت و تیۆریانە هەست پێ بكەن و بیزانن، مەگەر لەو كاتە نەبێ كە نمونەیەكی كردەیی لەبەردەمی دەهێنرێتەوە، قورئانی پیرۆز و پێغەمبەر ﷺ نمونەیان لە پەروەردەكردن بەكارهێناوە دا بۆ ڕون كردنەوەی ڕاستیەكان، نمونەش لەسەر ئەمە زۆرە. هەندێكیشی باس دەكەین:

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴿١٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ قَالُوٓا۟ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ﴿١١﴾ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْمُفْسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ ﴿١٢﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا۟ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ ۗ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾ وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا۟ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمْ قَالُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ﴿١٤﴾ ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلْهُدَىٰ فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمْ وَمَا كَانُوا۟ مُهْتَدِينَ ﴿١٦﴾ مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا فَلَمَّآ أَضَآءَتْ مَا حَوْلَهُۥ ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمْ وَتَرَكَهُمْ فِى ظُلُمَٰتٍ لَّا يُبْصِرُونَ ﴿١٧﴾ صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿١٨﴾ أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ ظُلُمَٰتٌ

وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ يَجْعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمْ فِىٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ ۚ وَٱللَّهُ مُحِيطٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾ يَكَادُ ٱلْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَٰرَهُمْ ۖ كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوْا۟ فِيهِ وَإِذَآ أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُوا۟ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَٰرِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾﴾البقرة:٨-٢٠.

لەم ئایەتانەی پێشو خوای گەورە باسی دو ڕوەکان دەکات و دەفەرموێ:

نمونەی ئەوانە لە دو ڕویی و دەغەڵیان دا وەك پیاوێك وایە، کە ئاگرێکی کردبێتەوە لە شەوێکی تاریکدا لە ئەشکەوتێکدا و خۆی گەرم دەکاتەوە و چوار دەوری خۆی دەبینێ و ترسی نامینێ بەڵام، هەر ئەو کەسە، گەر ئاگرەکەی لە تاریکایی کوژایەوە؛ بەترساوی دەمێنێتەوە، حاڵی دو ڕوانیش ئاوایە، خۆیان بەباوەڕدار پیشان دەدەن و باوەڕیان هێناوە و خۆیان و ماڵ و منداڵیان پێی پارێزرابون و ژن و ژن خوازیان لەگەڵ مسوڵمانان کردوە، ئا ئەمە ڕوناکیەکەیان، نەمانی روناکیەکان دیارکەوتنی بیروباوەڕیانە بۆ باوەڕداران لە سەر زمانی پێغەمبەری خوا ﷺ و قورئانی پیرۆز دا.

لێکچواندنی ئیمان بە ڕوناکی ئەوەیە، کەوا ڕوناکی ئەو پەڕی هیدایەتە بۆ ڕێگای ڕاست و نەمانی سەرسامی، هەروەها ئیمانیش ڕێگە ڕونەیە، کە دەتگەیەنێتە لای خوای گەورە، بێ باوەڕیشی چواندوە بەتاریکایی، چونکە بابای ڕێ لێ ون بو لە تاریکاییدا؛ مرۆڤ توشی سەرسامی دەکات.

پاشان خوای گەورە بە قەومێك چواندونی، کە بارانێکی زۆریان بەسەردا داباریوە و زەوی تاریك کردوە کە هەورە تریشقە و بروسکەی توندی لەگەڵە. جا ئەو بروسکەیە گوێی کەڕ کردون و لەبەر توندییەکەی چاوی کوێر کردون، کەس ناتوانێ لەم دیاردە گەردونیە ترسناکە هەڵبێ، بەهەمان شێوە ئەمە حاڵی ئیسلام و قورئانە لەگەڵ دو ڕواندا، گەر دەست کەوت و غەنیمەت و سودی تێدابێ؛ ڕوی تێدەکەن، گەر لێیان تاریك بو و بەرژەوەندیە دنیاییکانیانی تێدا

نەبو؛ ئەوا وازی لیْ دەهێنن و پشتی تیْ دەکەن[1].

هەروا لەو نمونانەی خوای گەورە لە قورئان باسی کردوە:

﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَعْمَٰلُهُمْ كَسَرَابِۭ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ ٱلظَّمْـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمْ يَجِدْهُ شَيْـًٔا وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٣٩﴾ أَوْ كَظُلُمَٰتٍ فِى بَحْرٍ لُّجِّىٍّ يَغْشَىٰهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ سَحَابٌ ۚ ظُلُمَٰتٌۢ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَآ أَخْرَجَ يَدَهُۥ لَمْ يَكَدْ يَرَىٰهَا ۗ وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورًا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ﴿٤٠﴾﴾ النور:٣٩-٤٠.

خوای گەورە باسی کردەوەکانی بیْ باوەڕان دەکات و دەفەرمویْ: نمونەی کردەوەکانیان وەك ئەو ئاوڕەنگ (سراب)ە وایە کە یەکێك لەسەفەر دایە و شەیدای بینین و گەیشتنی ئاوە و وا ئەزانیْ ئاوە، کەچی خەیاڵە و ڕاستی نیـیە، لەبەر زۆر گەرمایی وەك بیابان لیێ دەبێتە ئاو. بەهەمان شێوە بیْ باوەڕ کە کردەوەی باش دەکات وا دەزانیْ پاداشتی لەسەر وەردەگریْ.

جا کە لە ڕۆژی قیامەت کردەوەکان و پاداشتەکەی خسترایە ڕو، ئەو پاداشتە نابینیْ، کە گومانی وابو شایستەی ئەوپاداشتەیە، کە کاتی لێپرسینەوەش هات هیچ شتیْ دادی نادات و هیوابڕ دەبیْ وەك ئەو سەفەرکەرەی بەهیوایە، کە لەلای سەرابەکە ئاوی دەست بکەویْ.

پاشان نمونەیەکی تر بۆ کافرانی هێناوەتەوە، کە بریتی‌یە لەوەی کردەوەکانیان گەر باشتر بێت لە ڕۆژی قیامەت دا وەك ئاوڕەنگ (سراب) وایە، گەر کردەوەکانیان ناشیرین بیْ؛ ئەوا وەك تاریکی نوتەك و کۆبۆوە وایە، جا لەدەریای زۆر قولْ دا سیْ تاریکی کۆ دەبێتەوە: تاریکی هەور و تاریکی گوفتار و تاریکی کردەوە[2].

---

[1] مختصر تفسير الخازن ج١/١٧-١٨.

[2] مختصر تفسير الخازن ج١/١٧-١٨.

هەروەها لەو نمونانەی قورئانی پیرۆز باسی کردوە: ﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًا وَإِنَّ أَوْهَنَ ٱلْبُيُوتِ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ﴾ العنكبوت:٤١.

خوای گەورە باسی ئەوانە دەکات کە دابەزیونەتە ژێرەوەی هزر و بیروباوەڕ و بت و دار و بەردیان کردە هاوبەشی خوا، جا دەفەرموێ نمونەی ئەوانە، کە ئاینیان لە نێوان ئاینەکانە وەك جاڵجاڵۆکە وان کە ماڵەکەی لە نێوان ماڵانە، هەروەك خانوی جاڵجاڵۆکە سسترین خانوە، بەهەمان شێوە پەرستنی بت و دار و بەرد، بێ هێزترین و سسترین ئایینە.

نمونەی پەروەردەکردن بە نمونە هێنانەوە لە فەرمودەی پێغەمبەردا ﷺ ئەوەیە کە دەفەرموێ: ((أَرَأَيْتُمْ لَوْ أَنَّ نَهَرًا بِبَابِ أَحَدِكُمْ يَغْتَسِلُ مِنْهُ كُلَّ يَوْمٍ خَمْسَ مَرَّاتٍ، هَلْ يَبْقَى مِنْ دَرَنِهِ شَيْءٌ؟ قَالُوا: لَا يَبْقَى مِنْ دَرَنِهِ شَيْءٌ. قَالَ: فَذَلِكَ مَثَلُ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ يَمْحُو اللَّهُ بِهِنَّ الْخَطَايَا گەر ڕوبارێك بە بەردەمی دەرگای یەکێکتان دا بڕوات و هەمو ڕۆژ پێنج جار خۆی لێ بشوات ئایا هیچ پیسی پێوە دەمێنێ؟ گوتیان: هیچ پیسی‌یەکی پێوە نامێنێ. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: کەواتە ئەمەش وەك پێنج نوێژەکە وایە، خوای گەورە گوناهەکانی پێ دەسڕێتەوە.))[1].

پێغەمبەری خوا ﷺ نمونەی بۆ نوێژ بە ڕوبارێکی ڕۆیشتو هێناوەتەوە، کەوا چۆن بۆ لای خوای گەورە نزیکت دەکاتەوە و دەبێتە یاریدە دەر بۆ پاڵاوتەکردنی دەرون لە گوناه و تاوان و لە پیسی گوناهان، کەوا هەر کاتێك مرۆڤ کاری کرد و ڕەنجی کێشا و ئارەقی کرد و جەستەی پیس بو، پێنج جار خۆیپی دەشوات. جا هەر وەك پیسایی جەستە ئاو دەیشوات و پاکی دەکاتەوە؛ بەهەمان شێوە پێنج نوێژەکان پیسی‌یەکانی دەرون دەشواتەوە و ئەو گوناهانەی مرۆڤ دەیکات

[1] أخرجه مسلم برقم (٦٦٧).

پاکی دەکاتەوە.

نمونەی پەروەردەیی و فێرکردن لە قورئان و سوننەتدا، زۆرترە لەوەی بژمێردرێ، بەلاّم لەسەر پەروەردیارە کە هەولّ بدات لیّی بکۆلّێتەوە و توێژینەوەی لەسەر بکات، بۆ ئەوەی لە ئاراستەکردنی مندالاّن و پەروەردە کردنیان سودی لیّ وەربگرێ، هەر چەند پەروەردیار نمونەی زۆر لەپەروەردە و فێرکردن بەکاربهێنێ، ئەوەندە چەمکەکان لە مێشکی مندالّ ڕونتر دەبێت و، کرداری پەروەردەیی سەرکەوتو تر دەبێت.

# وتويژ و گفتوگۆ

گشت باوکان و پەروەردیاران دەتوانن فەرمانەکان و قەدەغەکردنەکان ڕاستەوخۆ ئاڕاستەی منداڵەکانیان بکەن، بەڵام کەمێکیان دەتوانن لەگەڵ منداڵان گفت و گۆی تێدا بکەن، ئەوان دەیانەوێ فەرمانیان پێ بکەن و قەناعەتیان پێ بهێنن جێبەجێ بکەن.

گومانی تێدانیە گفت و گۆ و ڕاوێژ ڕێبیرێك (مبدأ)ێکی ئیسلامی ڕەسەنە، خوای گەورە داینـاوە بۆ هەڵس و کەوت کردنی فەرماندار (حاکم) لەگەڵ بەرفەرمان (محکوم)، بەڕێوەبەر لەگەڵ فەرمانبەرانی و مامۆستا و پەروەردیار لەگەڵ ئەو کەسەی، کە هەڵدەستێ بەچاودێری کردنیان:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ: مسولمانان کاروباریان لەنێوان خۆیاندا بەڕاوێژە.﴾ الشوری:٣٨.

هەروەها فەرمویەتی: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ: ئەی پێغەمبەر لە کاروباردا ڕاوێژ بە مسولمانان بکە.﴾ آل عمران:١٥٩.

پێغەمبەر ﷺ لە زۆر شوێن دا ڕاوێژی بە هاوەڵە بەڕێزەکانی کردوە وەك ڕاوێژ دەربارەی دیلەکانی جەنگی بەدر و دەرچونی پێغەمبەر ﷺ بۆ دەرەوەی شاری مەدینە لە جەنگی ئوحود بۆ ڕوبەڕوبونەوەی موشریکان.

لە نمونەی پەروەردەیی، لەسەر شێوازی گفتوگۆی پێغەمبەر ﷺ لە ئاڕاستەکردن و پەروەردەکردن دا، باسی ئەم نمونەیە دەکەین:

لە ئەبی ئومامە ؓ کەوا گەنجێکی قوڕەیشی هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و گوتی: **یا رسول الله إئذن لي في الزنا، فأقبل عليه القوم و زجروه، فقالوا: مه، مه!،** واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێگەم پێ بدە زینا بکەم، جا خەڵکەکە ویستیان لێی بدەن و سەرگۆنەیان کرد و گوتیان ئەی، ئەی!!!

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نزیك بەوە، ئەویش لیێ نزیك بۆوە و فەرمووی: زیناکردن بۆ دایکت پێ خۆشە؟

گوتی: نا بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا، خوا بمکاتە قوربانیت.

پێغەمبەر فەرمووی: "خەلکیش بۆ دایکیان پێیان ناخۆشە، ئایا بۆ کچەکەت پێت خۆشە؟ گوتی: نا بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا، خوا بمکاتە قوربانیت!".

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خەلکیش بۆ کچەکانیان پێ خۆش نیە، ئایا بۆ خۆشکت پێت خۆشە؟

گوتی: خوا بمکاتە قوربانیت نا بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خەلکیش بۆ خوشکەکانیان پێیان خۆش نیە، پێت خۆشە بۆ خوشکی باوك؟

گوتی: نا بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا خوا بمکاتە قوربانیت.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "خەلکیش بۆ خوشکی باوکیان پێیان خۆش نیە، پێت خۆشە بۆ خوشکی دایکت؟

گوتی: نا بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا، خوا بمکاتە قوربانیت!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خەلکیش بۆ خوشکی دایکیان پێ خۆش نیە.

ئەبی ئومامە گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی خستە سەر سینگی لاوەکە و فەرمووی: ((اللهم اغفر ذنبه، وطهر قلبه، وحصن فرجه: خوایە لە گوناهی خۆش بە، دلی پاك راگرە و داوێنی بپارێزە)) گوتی: گەنجەکە دوای ئەم دوعایەی پێغەمبەر، لای بەم شتە نەکردەوە و ئاوڕی لێ نەداوە.[1]

سەرنج بدە بۆ نەرم و نیانی و سینگ فراوانی پێغەمبەر ﷺ لە بیستنی قسەی ئەم گەنجەی کە ئارەزوی زیناکردنی بەسەردا زاڵ ببو، چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ گفت و گۆی لەگەڵ دەکات هەتا ئەو کاتەی گەنجەکە لای دەڕوات، کە هەرچی ئارەزو و مەیل کردنی زیناکردنە لەدڵی نامێنێ.

---

[1] أخرجه الهيثمي في (مجمع الزوائد) ج١/١٢٩.

گەر پێغەمبەری خوا تەریقی بکردبایەوە قەدەغەی بکردبایە دەری بکردبا (وەك كە زۆر باوك ئاوا دەكەن لە كاتێكدا، كە منداڵەكانیان بەڕاشكاوی باسی نەخۆشیە دەرونی و ئارەزوەكانیان دەكەن) ئەوا ئەو كاتە ئەو گەنجە لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ دەردەچو، وەك كە چۆن هاتە لای و دڵی پڕبو لەو حەز و ئارەزوانەی، كە خوای گەورە پێی ڕازی نیە.

هەروا لەو نمونانە: پێغەمبەری خوا ﷺ بەهاوەڵەكانی فەرمو: "ئایە دەزانن غەیبەت چی‌یە؟ گوتیان: خوا و پێغەمبەرەكەی زاناترە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((ذكرك أخاك بما يكره: باس كردنی براكەتە بەوەی، كە پێی ناخۆش بێ))، گوتیان باشە ئەگەر براكەم ئەو سیفەتەی تێدا بێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: گەر ئەو سیفەتەی تێدابێ ئەوە غەیبەتت كردوە، بەڵام گەر ئەو سیفەتەی تێدا نەبێ ئەوە بوهتانت بۆ هەڵبەستوە".[1]

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((أنصر أخاك ظالما أو مظلوما: براكەت سەربخە گەر ستەمكار بو یان ستەم لی‌كراو بو))، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا: ئەوەی كە ستەمی لیٚكراوە ئەوە سەری دەخەین، ئەدی ئەگەر ستەمكار بێ چۆن سەری بخەین؟

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (دەستی دەگری ستەمەكە نەكات، ئەوە سەرخستنیەتی).[2]

قورئانی پیرۆز شێوازی گفت و گۆی لە زۆر شوێن بەكارهێناوە، دەربارەی گرنگترین و ترسناكترین كار، كە بیروباوەڕە وەك خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿أَمَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنۢبِتُوا۟ شَجَرَهَآ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ

[1] أخرجه مسلم برقم (٢٥٨٩).
[2] أخرجه البخاري برقم (٢٤٠٣).

بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ ﴿٦٠﴾ أَمَّن جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ
أَنْهَٰرًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَٰسِيَ وَجَعَلَ بَيْنَ ٱلْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ
بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ
ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ
﴿٦٢﴾ أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا
بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِۦٓ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ تَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٣﴾ أَمَّن
يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ
قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٦٤﴾ قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٦٥﴾ بَلِ
ٱدَّٰرَكَ عِلْمُهُمْ فِي ٱلْءَاخِرَةِ ۚ بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ مِّنْهَا ۖ بَلْ هُم مِّنْهَا عَمُونَ ﴿٦٦﴾
وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا وَءَابَآؤُنَآ أَئِنَّا لَمُخْرَجُونَ ﴿٦٧﴾
لَقَدْ وُعِدْنَا هَٰذَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ
﴿٦٨﴾ قُلْ سِيرُوا۟ فِي ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٦٩﴾ وَلَا
تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُن فِي ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ﴿٧٠﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ
هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٧١﴾ قُلْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ رَدِفَ لَكُم بَعْضُ
ٱلَّذِي تَسْتَعْجِلُونَ ﴿٧٢﴾﴾ النمل: ٦٠-٧٢.

واته: یا ئەو کەسەی چاترە ئاسمانەکان و زەمینی وەدیهێناوە لە حەواوە ئاوی بۆ ئێوە ناردوە؟ گەلێك باخچەی بە دیمەمان بە ئاوەکەی شین کـردوە کـە خۆتـان نەتاندەتوانی دارەکانی بەرهەم بێنن؛ ئاخۆ هیچ پەرستوێکی لەگەڵ خـوا هەیـە؟ نەخێر دیارە گەلێکی لە هەق لادەرن. یا لەو کەسـەی چـاترە کـە هـەر وەختـێ

هومیێد بڕوایێك لەبەری بپارێتەوە، دەهانـای دێ و لـە چۆرتم[1] ڕزگـاری دەکـا و دەتانکاتە جێنشین لەسەر زەمین؟

ئاخۆ هیچ پەرستێویێکی لەگەڵ خوا هەیە؟ ئەمانەکەم پەند وەردەگرن.

یا ئەو کەسەی چاترە کە لە تاریکی بەژ[2] و دەریا، لەڕێ شارەزاتاندەکا و هـەر ئەویشە ئەو بایانە بەڕێ دەکا، کە مزگێنی خێر و بێری ئەویان پێیە؟ ئاخۆ هیـچ پەرستوێکی لەگەڵ خوا هەیە؟ خوا زۆر لەوەی بـەرزترە کـە دەیکەنـە شـەریکی ئەو.

یا ئەو کەسەی کە بونەوەر وەدی دێنێت و لە دواییدا دەیباتەوە؟ ئەدی کێیـە لە ئاسمان و زەمینەوە بژێوتان بۆ بەدی دەکا؟ ئاخۆ هیچ پەرسـتوێکی لەگـەڵ وا هەیە؟ سا ئەگەر پێو وایە ڕاستن، بەڵگەی خۆتان نیشان بدەن.

بێژە: ئەوانە وا لە ئاسمانەکان و زەمیندا هەن لە خوا بەدەر- لەبەر پێوار بـێ خەبەرن. هەستیش ناکەن کەنگی زیندو دەکرێنەوە.

زانستەکەیان بڕناکا سەڵا ڕابێ، دو دڵن دەبێ یان نابێ؟ ئـەم چـاوی دینـەیان نیە. خودا نەناسەکان وتیان: ئاخۆ وەختێ ئێمە و باب و باپیرانمان بوینە خۆڵێـك (بەزیندیی لە گۆڕ) دەمانهێننە دەرێ؟

ئەو بەڵێنەی بەمەی دەدەن، لەوە پێشـیش بـە بـاب و کـالن دراوە؛ ئەمانـە گشتی چیرۆکی پێشینەکانن.

بێژە: گەشتێ بەم سەر زەمینە دا بکـەن، تـا ببینـن سـەرەنجامی تاوانبـاران بەکوێ گەیوە. خەمیان مەخوە و لەبەر گزیکاری ئەوان دڵتەنگ مەبە!

گفتوگۆ کردنی دایك و باوك لەگەڵ منداڵەکانیان لەزۆر شتدا؛ چەند سودێکی دەرونی پەروەردەیی گەورەی هەیە، کە گرنگترینیان باس دەکەین:

١-زیادبونی متمانە بـەخۆبونی منـداڵ لەمیانـەی هەسـت کردنـی بەبایـەخ

---

[1] چۆرتم: تەنگ و چەڵەمە.
[2] بەژ: وشکانی.

پێدانی و، بایەخ دان بەڕایەکەی دەربارەی ئەو بابەتەی تاوتویێ و گفتوگۆی تێدا دەکرێ.

٢-ئاشنابون بەو بیر و چەمکانەی، کە منداڵ هەیەتی بەرامبەر جۆرەها بابەت و بەهێزکردنی ئەو چەمکانە، یان پتەوکردن و چەسپاندنی.

٣-دەرنەکردنی بڕیار و فەرمان لەلایەن باوکەوە، کە ئاڕاستەی منداڵەکەی دەکات، مەگەر دوای بەرایی و سەرەتاییەك بۆ قەناعەت پێکردنی منداڵەکە و وەرگرتنی بڕیار و فەرمانەکە.

٤-منداڵ بەو فەرمانەی داوای لێ کراوە دوای ڕاوێژکردن و تاوتوێ کردن لەگەڵیدا، پابەند بونی زۆرتر دەبێ، ئەمەش لەبەر ئەوەی هەست بەوە دەکات کە بڕیار بەدەستە و لەسەری پێویستە یەکەم کەس بێ بۆ پابەند بون.

٥-گەر گیانی ڕاوێژکردن و گفت و گۆ باڵی کێشا لەنێو دایك و باوك و ئەندامانی خێزان، ئەوا ئەمە دەبێتە گەشەکردنی گیانی هاوکاری و تەبایی لەنێوان ئەندامانی خێزاندا.

٦-هەروەها بەکارهێنانی ئەم ڕێبیرە (مبدأ)ە شوێنەوارێکی گەورەی دەبێت لە گەشە پێدانی توانستی دادوەری کردن (محاكمة)ی ژیری لە لای منداڵاندا کە ئامادەسازیان دەکات بۆ ڕوبەڕوبونەوەی گرفتە گەورەکان.

لەبەر ئەوە لەسەر دایك و باوکانە لە پەروەردەکردندا بەپێی توانا پەنا ببنە بەر ئەم ئامڕازە (وسیلة) لە کاری بچوك و گەورەدا، با باوك سوربێ لەسەر ئەوەی زۆربەی ئەو بڕیارانەی لە ماڵەوەدا وەردەگیرێ؛ بڕیاری بەکۆمەڵ بێت، کە لە ئەنجامی ڕاوێژ و قەناعەتەوە دەردەچێت دەربارەی کاروباری پەروەردەیی وەك: کاتی شەو بەسەربردنی منداڵ لە دەرەوەی ماڵ و، وانەکردنی لەگەڵ هاوڕێکانی و زۆر چونە دەر لەگەڵیاندا و، پارە زۆر خەرج کردنی و، هەڵبژاردنی خوێندنی زانکۆ و هەڵبژاردنی خواردنی نیوەڕۆ و ئێوارە و، هەڵبژاردنی ئەو شوێنەی کە خێزان لەکاتی پشوی هاوین دا بەسەر دەبەن و، دابەش کردنی ژور لەنێوان

ئەندامانی خێزان و شتی هاوشێوەی تر.

پێویستە لەسەر خێزان لەکاتی وەرگرتنی ئەم ئامرازە دا، سووربێ لەسەر ئەوەی کە گفت و گۆیەکە هێمن و هاوسەنگ بێ، تاوەکو هەر تاکە و مافی رادەربڕینی بەراشکاوی هەبێت، با پێچەوانەی رای تریش بێت، بۆ ئەوەی گفتوگۆیەکە بەرەنجامی پێویستی هەبێ.

دەبێ ئاگاداربین کە ئەم ئامرازەی ئامرازەکانی پەروەردە، ناشێ بۆ هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ منداڵی بچوك، کە هێشتا خۆی ناناسێ و چاکە و خراپە لێك جیا ناکاتەوە، بەڵام قەیناکە گەر راوێژ بە منداڵە بچوکەکانیان بکەن، تەنانەت بەوانەی نەگەیشتونەتە تەمەنی خۆناسین، ئەمەش بۆ راهێنانیان لەسەر گفت و گۆ و بەشداری کردن لە بڕیار وەرگرتن.

هەروا لەسەریانە کە خۆ دور بگرن لە فەرمانی بێ هۆ و بێ سود، تەنانەت لەگەڵ منداڵی بچوکیش دا و بەپێی توانایان.

هەروەها لەو کارانەی کە پێویستە دایك و باوك لەکاتی بەکارهێنانی راوێژ و گفت و گۆدا لێی ئاگادار بن، رێزگرتنی ئەو بڕیارەیە کە بە گفتوگۆ لە نێوان خۆیان و نێوان منداڵەکانیان وەرگیراوە و پاشگەز نەبونەوە لێی و، گۆڕینی بەبڕیارێکی تاکڕەو یان لە لایەن هەر یەکێك لە دایك و باوك دا، بۆ سەپاندنی بەسەر خێزاندا. چونکە ئەم جۆرە رەفتارە و بەم رێگەیە متمانە و بایەخ پێدانی لە لایەن منداڵانەوە ناهێڵێ.

گەر خێزان توانی هەڵسێ بە گفتوگۆ کردنی کاروبارەکانی و کاروباری تاکەکانی لەبواری پەروەردەیی و رۆژانەییدا؛ ئەوا پاش ماوەیەك لە پشت بەستن بەم شێوازە؛ بەرەنجامی گەورە و سەرکەوتوی لێ دەکەوێتەوە.

# نزاكردن بۆ منداڵ

نزا (دوعا) کردن بۆ منداڵ ئامرازێکی پەروەردەیی پوختی ئیسلامیە، کاتێك دایك و باوك شێواز و رێگا پەروەردەیی‌یەکانی پێشو بەکار دەهێنن لە راست کردنەوە و رێك و پێك کردنی ڕەفتاری منداڵەکانیان، پەنا دەبەنە بەر خوای گەورە بەنزاکردنی راستگۆیی‌یانە کە داوای چاك کردن و هیدایەت دانی منداڵەکانیانی لێ دەکەن.

گومانی تێدا نی‌یە نزاکردن شوێنەوارێکی گەورەی لە ژیانی ئادەمیزاد دا هەیە، بە تایبەتی نزاکردنی دایك و باوك بۆ منداڵ.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە زۆر شوێن دا باسی سوربونی باوکان دەکات لەسەر نزاکردنی داوای خەیر و چاکسازی و پارێزکاری و سەرکەوتویی منداڵەکانیان لە کاروباری دنیا و رۆژی دوایی‌یاندا.

نمونەی ئەمەش وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبۡ لَنَا مِنۡ أَزۡوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعۡيُنٖ وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ إِمَامًا: ئەوانەی دەڵێن پەروەردگارمان لە خێزانەکانمان و وەچەکانمان ڕۆشنایی چاو (منداڵ)مان پێ ببەخشە و بمان کە بە پێشەوای پارێزکاران.﴾الفرقان:٧٤.

لەسەر زمانی یەعقوبی پێغەمبەر (ﷺ) کە نزا بۆ منداڵەکانی دەکات دەفەرموێ: ﴿قَالَ سَوۡفَ أَسۡتَغۡفِرُ لَكُمۡ رَبِّيٓۚ: فەرموی داوای لێ خۆش بونتان لە خوای گەورە بۆ دەکەم.﴾ یوسف:٩٨.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((ثَلَاثُ دَعَوَاتٍ مُسْتَجَابَاتٌ لَا شَكَّ فِيهِنَّ دَعْوَةُ الْمَظْلُومِ وَدَعْوَةُ الْمُسَافِرِ وَدَعْوَةُ الْوَالِدِ لِوَلَدِهِ: سێ نزا هەیە گومانی تێدا نیە گیرا دەبن: نزای ستەم لێکراو، نزای سەفەرکەر، نزای باوك بۆ منداڵەکەی.))[1].

[1] أخرجه إبن ماجة برقم (٣٨٦٢).

بەهەمان شێوە لەسەر دایك و باوکە، کــە ئاگــاداربن نــزا لــە منداڵــەکانیان نەکەن، چونکە ئەمە شوێنەوارێکی گەورەتری هەیە لە سەرنەکەوتنیان.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ((لا تَدْعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ وَلَا تَدْعُوا عَلَى أَوْلَادِكُمْ وَلَا تَدْعُوا عَلَى خَدَمِكُمْ وَلَا تَدْعُوا عَلَى أَمْوَالِكُمْ، لا تُوَافِقُوا مِنَ اللَّهِ سَاعَةَ نَيْلٍ فِيهَا عَطَاءٌ فَيَسْتَجابَ لَكُمْ: نـزا لـە خۆتـان مەکـەن، نـزا لـە منداڵەکانتان مەکـەن، نـزا لـە خزمـەتکارەکانتان مەکـەن، نـزا لـە سـامانتان مەکەن، نەبادا لەگەڵ کاتێك ڕێك بکەوێ، کــە خــوای گـەورە نـزای تێـدا گـیرا دەکات.))[1]

هەروەها فەرمویەتی: ((ثَلَاثُ دَعَوَاتٍ مُسْتَجَابَاتٌ لَا شَكَّ فِيهِنَّ دَعْوَةُ الْمَظْلُومِ وَدَعْوَةُ الْمُسَافِرِ وَدَعْوَةُ الْوَالِدِينَ علَى وَلَدِهِ: سێ نـزا هـەن بێگومـان گیرا دەبن: نزای سـتەم لێ کـراوان، نـزای سـەفەرکەر، نـزای دایـك و بـاوك لـە منداڵ.))[2].

ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕاویەتیـەوە کـە جورەیجـی خـوا پەرسـت لەبـەر نوێـژی سوننەت، داوای دایکی جێبەجێ نەکردوە، دایکیشی نزای لێ کردوە گوتویـەتی: (خوایە نەیمرێنی هەتا لە ڕوی ئافرەتی بێ ئابڕو لەش فرۆش دەبینرێ)[3].

ئـەوە بـو دوای ئەمـە بـەنی ئیسـرائیل تاوانباریـان کـرد بـە زینـاکردن و پەرستگایەکەیان لێ ڕوخاند. لە ڕاسـتیدا فیتنەیەکیگـەورە بـوو، هـەتا خـوای گەورە پاکیەتی لە زیناکردنی بەدیار خست و نزای دایکی جێبەجێ کرد.

ئەوەی زۆر جێی مەخابنە ئەوەیە، کـە زۆر لـە دایـك و باوکـان بەکـەمترین ڕەفتار و خراپی منداڵان؛ نزای زۆر لە منداڵەکانیان دەکەن، نـازانن ئـەم نزایانـە شوێنەواری گەورەی هەیە لە خراپ کردنی منداڵ.

---

[1] أخرجه مسلم برقم (٣٠٠٩).
[2] أخرجه الترمذي برقم (١٩٠٦).
[3] ذكره مسلم برقم (٢٥٥٠).

پیاوێك هاته لای عبدالله ی كوڕی موبارەك ﷺ و سكاڵای منداڵەكەی لەلا دەكرد، ئەویش پێی گوت: نزات لیّ كردوە؟ گوتی: بەڵێ، گوتی كەواتە تۆ ڕەفتاریت تێكداوە!

لەسەر دایك و باوكە لەكاتی خراپەكاری منداڵەكانیان لەجیاتی نزا لیّكردنیان، نزایان بۆ بكەن بە هیدایەت و چاك بون.

گوێم لە باوكێك بوو، خوای گەورە گرفتاری منداڵێكی كردبوو، كە ڕەفتار و رەوشتی لەگەڵ خراپ بو و ئازاری دەدا، جا باوكەكە هەردو دەستەكانی بۆ لای خوای گەورە بەرزكردەوە و دەیگوت: خوایە لیّی ڕازی بە، خوایە چاكی بكەی، خوایە هیدایەتی بدەی، خەڵك پیّیان دەگوت: بۆچی نزای لیّ ناكەی؟ ئەویش دەیگوت: ئایا بەنزاكردن لیّی لە خراپەوە خراپتر نابیّ و لە ئازار دەرەوە ئازاردەر تر نابیّ؟ داوام وایە خوای گەورە نزاكەم گیرا بكات و هیدایەتی بدات، جا پیاوەكە لەسەر ئەم گرفتاریە ئارامی گرت، هەتا خوای گەورە نزاكەی گیراكرد و كوڕەكەی چاك كرد و هیدایەتی دا، هەمموو ئەمەش بەهۆی بەرەكەتی نزاوە بو.

لەبەر ئەوە لەسەر دایك و باوكە كە لە بیّ هودەی ئامرازە پەروەردەییەكان بۆ چاكسازی كردنی منداڵ نا ئومێد نەبن، بەڵكە زۆر لە خوا بپاڕێنەوە و نزای چاك بون و هیدایەت دانیان بۆ بكەن.

# دەروازەی پێنجەم

## ڕۆڵی قوتابخانە و مزگەوت لە پەروەردەکردندا

# ڕۆڵی قوتابخانە

وەك لە پێشەوە باسمان کرد خێزان ڕۆڵی هەرە گەورەی هەیە لە پەروەردە و تەمێ کرندا، ئەویش لەبەر زۆر هۆ کە لە پێشەوە باسمان کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا ناکرێ ڕۆڵی بنکە پەروەردەیی یەکانی تر فەرامۆش بکەین، کە گرنگترینیان قوتابخانە و مزگەوتە.

سەبارەت بە قوتابخانە، بێگومان بریتی یە لە مەڵبەندێکی پەروەردەیی گرنگ، کە منداڵ بەشی زۆری کاتی تێدا بەسەر دەبات و بە ژمارەیەکی زۆر هاوڕێ ئاشنا دەبێ.

مەخابن قوتابخانە بەر لە چەند ساڵێك زۆر بایەخی بە پرۆسەی پەروەردەیی دەدا لە زۆر لایەندا، بەڵام لە لەگەڵ ڕۆژگاردا بایەخە پەروەردەیی یەکەی کەم بۆوە و کورتی هێنا.

کاریگەری قوتابخانە لە پرۆسەی پەروەردەیی دا لە زۆر ڕووەوەیە، کە گرنگترینیان:

### ١-پێشەنگی یەك کە لە مامۆستا بێتە دی:

ئەوەی تێبینی دەکرێ ئەوەیە کە منداڵان لە قوناغی خوێندندا و بەتایبەتی لە سەرەتایی دا، مامۆستا دەکەن بە پێشەنگی خۆیان و هەوڵی لاسایی کردنەوەی دەدەن لە گوفتار و ڕەفتار و بیر و هزریاندا، جا لێرەدا دەردەکەوێ، کە مامۆستا ئەمانەتێکی زۆر گەورەی بەسەر شانەوەیە و بەرپرسیێتی یەکی گەورەی هەیە لە ڕێك و پێك کردنی ڕەفتاری وئاگاداری گوفتارەکانی و هەڵس و کەوتەکانی لەبەردەم قوتابیاندا.

لەبەر ئەوە گێڕراوەتەوە، کە عوتبەی کوڕی ئەبی سوفیان بە مامۆستای کوڕەکەی گوتوە:

(ئەی عبدالصمد با یەکەم شت کە دەستی پێ دەکەی چاك کردنی خۆت بێ، چونکە قوتابیان چاویان بەچاوی تۆوە بەستراوە، چاکە لای ئەوان ئەوەیە، کە تۆ بەچاکەی دادەنێی، کردەوەی ناشیرینیش لەلای ئەوان ئەوەیە، کە تۆ بەناشیرینی دادەنێی. فێری قورئانیان بکە و لەسەر فێربونی قورئان زۆریان لێ مەکە، با بەهۆییەوە بێزار نەبن و وازیشیان لێ‌ی مەهێنە، کە ئەوان بەیەکجاری وازی لێ بهێنن، شیعری پاکیان بۆ باس بکە و باشترین قسەیان بۆ بکە، زانستێکیان فێر مەکە هەتا بەتەواوی زانستێکی تر فێر دەبن، چونکە قسە تێئاخنین لە گوێچکەدا، ناهێڵێ کەسی بیسراو تێبگات و رێ بزر کەری تێ گەیشتنە[1].

جا گەر دایك و باوك و بەرپرسیارانی پەروەردە و فێرکردن ئەمەیان زانی، ئەوا لەسەریان پێویست دەبێ کە مامۆستا لەسەر بنچینەی رەوشت و ئایین هەڵبژێرن بەر لە زانست و زانیاری و ناسین، ئەمەش لەبەر گرنگی مامۆستایە لە پرۆسەی پەروەردەییدا.

## ٢-ئاراستەی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ:

مامۆستا لەمیانەی ئەو چەند کاتژمێرەی کە بۆی تەرخان کراوە بۆ وانە وتنەوە، زۆر جار کاتی گونجاوی بۆ دەرەخسێ، کە هەندێ تێبینی و ئاراستەی پەروەردەیی خۆی ئاراستەی قوتابیان بکات، جا چ راستەوخۆ بێت یان ناڕاستەوخۆ، زۆر جاریش ئەم ئاراستانە قوتابیان گیرا و گونجا و دەگرێ بەتایبەتی گەر لە مامۆستایەکی خۆشەویست و رێزدار لەلای منداڵانەوە دەرچوبێ.

## ٣-ئاشنایەتی لەگەڵ هاورێیان:

منداڵ لە قوتابخانەدا ژمارەیەکی زۆر لە هاوتەمەنی دەبینێ و هەمان بایەخیان هەیە، بەمەش بوارێکی فراوانی دەبێ بۆ هەڵبژاردنی هاورێیان،

[1] منهج التربیة النبویة للطفل ص٢٢٥. لە (نصیحة الملوك)ی ماوردی ل١٧٢ وەرگیراوە.

ئەوانەی کە گونجانێکی دەرونی لە نێوان خۆی و ئەواندا دەبینێ. هەروەها بەقولّ بونەوەی پەیوەندی نێوانی و نێوان هاوڕێیەکانی، زۆر لە خو و ڕەوشتی زۆریان لێ بەدەست دەهێنێ.

**٤-لە گرنگترین ئەو سودانەی ئادەمیزاد لە فێربون وەر دەگرێ، پاکخویی رەفتارە:**

چونکە زانست زەمینە ساز دەکات بۆ ئاشنا بون بە رەفتاری باشتر و جوانتر و فراوان بونی زانین و ژیری ئادەمیزاد، کە ئامادەی دەکات بۆ بەدەست هێنانی ڕەوشتی جوان و پەسەند لە رەفتار و هەڵس و کەوتەکانیدا.

کەواتە ئەرکی دایك و باوکە کە بایەخی زۆر بدەن بە هەڵبژاردنی ئەو قوتابخانەیەی، کە منداڵەکانیان تێدا دەخوێنن، ئەویش لەمیانەی ناسینی مامۆستاکان لە قوتابخانە و متمانەبون بە ئاکار و رەوشت و ئاینیان، بەمەش کەشێکی لەبار و یاریدەدەر بۆ پەروەردەکردنی راست و دروستی منداڵەکانیان دەستەبەر دەکەن.

لەسەر مامۆستایان و بەڕێوەبەرانە، لە قوتابخانەکاندا زۆر مکوڕ بن لەسەر ڕێك و پێك کردنی رەفتاری قوتابیان لە قوتابخانەکەیاندا، هەروا چاودێری کردنی رەفتاری خۆیان تاوەکو لەبەردەم قوتابیاندا پێشەنگی باش بنوێنن.

حەز دەکەم ئەوە دوپات بکەمەوە، کە لەسەر مامۆستایە تەنها بە بەخشینی زانیاری بۆ قوتابیان وازنەهێنێ، وا گومان ببات کە بەمە ڕۆڵی پێویستی لەسەر جوانترین شێوە بەجێ هێناوە، بەڵکە پێویستە بزانێ، بەشێك لە پرۆسەی پەروەردەیی منداڵان بەسەر شانی ئەودا دراوە.

گوێ بیستی شێخ رەمەزان دیب (خوا بیپارێزێ) بوم کەوا شێخ محمد بدرالدین الحسینی جارێکیان چوە لای یەکێ لە مامۆستای بیرکاری و وانەی بەقوتابیەکانی دەگوتەوە، شێخ لێی پرسی:

لە وانەکەتدا یادی خوات بۆ کردن؟

مامۆستا گوتی: نەخێر!

شێخ گوتی: خوا بتبورێ، کەواتە دڵیاتت مراند.

ئالێرەدا دەگەڕێمەوە تا وریایی بدەم، کەوا ئەرکی سەرپەرشتیاران (دایك و باوك)ە، کە قوتابخانە لەدڵی منداڵانیان خۆشەویست بکەن و فێری ڕێزگرتنی زانست و مامۆستا و نرخی هەر یەکێکیان و شوێنەواری لە بنیاتنانی ئادەمیزاد و کۆمەڵگەدا بکەن، پێویستە ماوە ماوە لەگەڵ منداڵەکانیان دانیشن و گوێ بگیرێ لە بیروبۆچونیان سەبارەت بە مامۆستاکەیان و ئاشنابون بەو بیرە پەروەردەیی‌یانەی، کە لە قوتابخانە ئاڕاستەیان دەکرێ، کە ڕەنگە لەگەڵ بەها و چەمکە ئیسلامیەکان و ئاکاریەکان نەگونجێ، هەروا ڕاست کردنەوەی ئەم فیکرانە لە مێشکی منداڵاندا، جا گەر ئەم ڕەفتارە لە مامۆستایەکی دیاریکراو دوبارە بویەوە، لەسەر باوك پێویستە سەردانی قوتابخانە بکات و سکاڵا دژی ئەم مامۆستایە پێشکەش بە بەڕێوەبردن بکات، کە دەیەوێ -مەبەستی بێ یان بێ مەبەست- ئادەمیزاد و کۆمەڵگە تێك بدات و بروخێنێ.

بێگومان بەرپرسانی پەروەردە و فێرکردن بەم جۆرە ڕەفتارە ڕازی نابن هەروا لەسەر دایك و باوکانە، کە هەماهەنگی (تنسیق)یان هەبێ لە ئاڕاستەکردن و پەروەردەکردن لە نێوان خۆیان و قوتابخانەدا، ئەویش لە ڕێی زۆر سەردانی کردنی قوتابخانە و وتووێژکردن لەگەڵ بەڕێوەبەر و مامۆستایان، هەروا ئامادەبونی لە کۆبونەوەی سەرپەرشتیاران کە لە قوتابخانە گرێ دەدرێ.

# ڕۆڵی مزگەوت لە پەروەردەکردندا

مزگـەوت لـە ژیـانی مسـولمانانداا لـە زۆر لایــەنی ڕۆحــی و زانسـتی و پەروەردەیی و کۆمەلایەتیدا بە ڕۆڵی گرنگ هەلدەستیّ.

ئیسلام سورە لەسەر چونی منداڵان بـۆ مزگـەوت، تـاوەکو لەسـەری رابێـن، هەروا لەبەر ئەوەی چونی منداڵان بۆ مزگەوت سودی زۆری هەیە.

جا چەند وێنەیەکی بایــەخ دانـی پێغەمبــەر ﷺ و هاوەڵـە بـەڕێزەکانی بە ئامادەبونی منداڵان بۆ مزگەوت باس دەکەین:

پێغەمبەری خوا ﷺ شوێنێکی تایبەتی لە ڕیزی نوێژ بۆ منداڵان دانا بـو لـە نێوان ڕیزی پیاوان و ڕیزی ئافرەتان.

لە عبداللەی کوڕی غەنەمەوە ئـەویش لـە ئـەبی مـالکی ئەشـعەریەوە ﷺ ئەویش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ، کەوا لە نێوان چـوار رکعاتـەکاندا خوێندنـی فاتیحە و هەستانەوەی ڕێك دەخستن. رکعاتی یەکەمی لەهەموان درێژتر دەکـرد، تاوەکو خەڵك بەنوێژ بگەن، پیاوی لە پێش کوڕیژگان دادەنا و کوڕیژگان[1] لەدوای ئەوانەوە، ئافرەتانیش لەدوای کوڕیژگانەوە.[2]

هەروا پێغەمبەر ﷺ نوێژی بەسوکی دەکرد و فەرمانی بەپێش نوێـژ (إمـام) دەدا، نوێژەکە سوك بکات ئەمەش لەبەر منداڵان بو.

وەك کە پێغەمبەر ﷺ بەعوسمانی کوڕی ئەبی عاسی ﷺ فەرموە: عوسمـان! نوێژ بەسوکی بکە و ئەندازە گیری خەڵك بکە بەبێ هێزترینیان، چونکە گـەورە و منداڵ و نەخۆشیان تێدایە، هەروا کەسانێك کە لە دورە هاتوە و ئەوەیش ئیش و کاری هەیە.[3]

---

[1] کوریژگە: غلام.
[2] أخرجه الهيثمي في (مجمع الزوائد) ج٢/١٣٠.
[3] أخرجه أبوداود برقم (٥٣١) و إبن ماجة برقم (٩٨٧).

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: من کە نوێژ دەکەم، دەمەوێ درێژی بکەمەوە، بەڵام کە گوێم لە گریانی منداڵ دەبێ بەسوکی دەیکەم نەبادا لەسەر دایکی زەحمەت و ناخۆش بێ.[1]

لەمیانەی ئەوانەی پێشودا سوربونی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانیمان بۆ دەردەکەوێ لەسەر ئامادەبونی منداڵان بۆ مزگەوت، ئەمەش لەبەر ئەو سودە پەروەردەیی‌یە زۆرەیە، کە پێشکەشیانی دەکات، ئێمەش هەندێکیانی لێ باس دەکەین:

**١-زیاتر نزیك بونەوە لە خوا و هەست کردن بە چاودێری خوا:**

ئەو کەشە ئیمانی‌یەی، کە منداڵ لە مزگەوت لیێ دەژیێ؛ شوێنەوارێکی گەورەی هەیە لە بەرزبونەوە و پاك کردنەوەی دەرونی، هەروا زیاتر نزیك بونەوەی لە خوای گەورە و زیاتر خۆشویستنی و هەست کردن بە چاودێری کردنی، کە دەبێتە مایەی چەسپاندنی بیروباوەڕ لە دڵیدا و ڕێك و پێك کردنی ڕەفتارەکانی.

**٢-پارێزگاری کردن لە پەرستنەکان و بەجێ هێنانی بەشێوەیەکی ڕاست و دروست:**

بێگومان منداڵ کە لە مزگەوت ئامادەی نوێژەکان دەبێ و تەماشای گەوران دەکات، چۆن بەشێوەیەکی ڕاست و دروست نوێژەکان ئەنجام دەدرێن و بەشێوەیەکی ڕاست، گوێی لە خوێندنەوەی ئیمام دەبێ و تەماشای دەستنوێژگرتنی گەوران دەکات؛ ئەوە شوێنەوارێکی دەرونی گەورەی هەیە بۆ ئەوەی منداڵ لە کاتی خۆیدا نوێژەکان ئەنجام بدات.

هەروەها منداڵ کە لە مزگەوت ئامادە دەبێ، فێری چۆنیەتی هەندێ نوێژ دەبێ، کە بۆی نارەخسێ لەماڵەوە بیبینێ و فێری ببێ وەك: نوێژی هەینی و

[1] أخرجه البخاري برقم (٧٠٧) و أبوداود برقم (٧٧٩).

جەژن و نوێژی مردو.

**٣-سود وەرگرتن لە کاتەکانی بەتاڵی:**

هەروەها مزگەوت ڕۆڵێکی گەورەی هەیە لە دابین کردنی کەشێکی لەبار و بەسود، کەوا منداڵ کاتەکانی بەتاڵی بەچەند شتێك بەسەر ببات، کە سودی گەورەی پێ ببەخشێ وەك: ئامادەبون لە کۆڕی زانستی و کۆڕی زیکرکردن و قورئان خوێندن.

**٤-ئاشنابون بە هاوڕێی چاك:**

هەروەها مزگەوت بوار بە منداڵ دەدات ئاشنایەتی پەیدا بکات لەگەڵ هاوڕێ چاك و سود وەرگرتن لێیان و هاوکاری کردن لەسەر زیادە نزیك بونەوە بۆ لای خوا.

## بنیاتنانی کەسایەتی کۆمەڵایەتی و ئیمانیی منداڵ:

منداڵان کە دێنە مزگەوت، بواری ئەوەیان بۆ دەڕەخسێ تێکەڵ بە کۆمەڵگەیەکی بڕوادار بن، کە بەشێوەیەکی ڕاست و دروست پەیوەندی و پێویستییە کۆمەڵایەتیەکانیان تێدا مومارەسە بکەن.

ئەو پەیوەندیە ڕاست و دروستەش لە ڕێی ئاشنابون بە گەورە و بچوکەوە لە لایەن پێشنوێژانی مزگەوتەکانەوە دێتە دی، هەروەها گفتوگۆ کردنیان و سەردانی کردنیان و چونە لای نەخۆشەکانیان و سەرەخۆشی کردنیان.

هەروەها منداڵ کە لە مزگەوت ئامادە دەبێ سودمەند دەبێ بەئاشنابونی زانا ناودار و بانگەوازکارە مسوڵمانەکان، لەمیانەی تەماشاکردنیان و گوێ بیستی قسەکانیان و، دوعا بۆکردنیان فەڕ و بەرەکەتیان بەربکەوێ.

لەبەر ئەوە پێویستە باوك سوربێ لەسەر ئەوەی، کە منداڵەکانی لەگەڵ خۆی بباتە مزگەوت و هانیان بدات، کە تەنیا بچنە مزگەوت لەکاتێك، خۆی سەرقاڵە

و ناتوانێ لەگەڵیان بچێت.

پێویستە باوك ئاگاداربێ و وریابێ، نەکا ئەو منداڵانە لەگەڵ خۆی بباتە مزگەوت کە لە تەمەنێك دان ناتوانن میز و پیسایی رابگرن، چونکە ئەم جۆرە رەفتارە مزگەوت و مسوڵمانان ئازار دەدات، هەروەها کە منداڵەکانی دەباتە مزگەوت، پێویستە ئاگاداریان بکات دەبێ پابەند بن بە ئادابەکانی مزگەوت و، پیرۆزیی مزگەوت بپارێزن و لەکاتی ئەنجام دانی پەرستنەکان؛ ئیمامی مزگەوت هەراسان نەکەن و لیّی تێك نەدەن.

جا گەر هەمو ئەمانەمان زانی، ئەوا مەودای کەمتەرخەمی باوکانمان بۆ دەردەکەوێ، لە بایەخ دان بە رۆڵی مزگەوت و بردنی منداڵەکانی بۆ مزگەوت، هەروا مەودای سەرپەرشتیارانی خزمەتکردنی مزگەوتمان بۆ دەردەکەوێ، کاتێ بە تورەیی‌یەوە تەماشای ئەو کەسە دەکەن، کە کورەکەی یان کچەکەی لەگەڵ خۆی هێناوەتە مزگەوت، بەڵکە -زۆرجار- ناهێڵن منداڵ بێتە مزگەوت وا دەزانن کارێکی باشیان ئەنجام داوە!

# پلەپلەیی و ئاسانکاری لە خستنە ڕوی ڕۆشنبیری جنسی بۆ منداڵان

تا ئێستاش لە کۆمەڵگە ئیسلامیەکانمان قسەکردن سەبارەت بە (جنس) گرفتێکی گەورەیە، کەچی جنس لە ڕۆژئاوادا بەشێوەیەکی ناشیرین و بێ ئابڕوویی و وروژێنەر لەبەردەم گەورە و بچوك لە شەقام و قوتابخانە و تەلەفزیۆن دا دەخرێتە ڕو.

لە کۆمەڵگە ئیسلامیەکاندا قسەکردن دەربارەی جنس تاوانێکی ڕەوشتی و کۆمەلایەتیە، بێگومان ئەوەی حەقە ئەوەیە، کە میانڕەوی بکرێت و هەڵوێستی میانەیی (وسط) لە نێوان زیادە ڕۆیی و بەزایە دان وەربگیرێ.

گرفتی هەرە گەورەی ئەمەش ئەوەیە، ئێمە هەردەم گشت هەڵوێستێکی سلبی وەردەگرین لە دژی قسەکردن سەبارەت بە جنس و پەروەردەی جنسی تاك و کۆمەڵگە، بەچەند پاساوێکەوە کە دەیدەینە پاڵ ئیسلام و، هەڵوێستی خراپ و سلبی لە دژی جنس بۆی دەنوێنین، کە ئیسلام پێی ئاشنا نەبوە و نەیناسیوە، مەگەر لە ڕۆژانی دواکەوتویمان ناسراوە و پاڵمان داوە بە ئیسلام.

ئەو ڕاستیەی لای زۆربەی باوکان و پەروەردیاران شاراوەیە ئەوەیە، کە پەروەردەی جنسی پەیوەندیەکی گەورەی بە ئیسلامەوە هەیە، هەر وەك خواردن و خواردنەوە؛ یاسای تایبەتی ئیسلامی هەیە.

هاوەڵە بەڕێزەکان ڕەزای خوایان لێبێ- پرسیاری زۆریان دەربارەی گرفتە جنسیەکان لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد و قسەیان لەگەڵدا دەکرد. پێغەمبەریش ﷺ وەڵامی دەدانەوە بەبێ ئەوەی سەرزەنشتیان بکات، یان بەرپەرچیان بداتەوە، یان پێیان ڕابگەیەنێ دروست نیە قسە دەربارەی ئەم بابەتانە بکرێ، نمونەی ئەمەش:

میقداد ﷺ گوتویەتی: عەلی ﷺ پێی گوت کە پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکات دەربارەی ئەو پیاوەی، کە لە ژنەکەی نزیك دەبێتەوە و مەزی لێ دەردەچێ، ئایە چی لەسەرە بیکات، بۆیە من پرسیارەکە ناکەم چونکە کچی پێغەمبەری خوام لەلایە و شەرم دەکەم ئەم پرسیارەی لێ بکەم، مقداد گوتی: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا کرد، ئەویش فەرموی: ((إِذَا وَجَدَ أَحَدُكُمْ ذَلِكَ فَلْيَنْضَحْ فَرْجَهُ وَيَتَوَضَّأْ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ: گەر یەکێك لەئێوە ئەو مەزیەی بینی، با داوێنی بەئاو بشوات و وەك بۆ نوێژ دەستنوێژ بگرێ.))[1].

خاتو عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) گوتویەتی: سەبارەت بەئیحتلامی پیاو پرسیار لەپێغەمبەری خوا کرا، (أم سلیم) گوتی: هەروەها ژنیش گەر ئیحتلامی بو، ئایە خۆشوشتنی لەسەرە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((نَعَمْ، النِّسَاءُ شَقَائِقُ الرِّجَالِ: بەڵێ، ئافرەتان هاوشێوە و هاوشان و نیوەی پیاوانن.))[2]

خاتو عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) گوتویەتی: ئەسمای کچی شکل، سەبارەت بە خۆشوشتنی ئافرەتی حەیزدار پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، پێغەمبەریش فەرموی:

((تَأْخُذُ إِحْدَاكُنَّ مَاءَهَا وَسِدْرَهَا فَتَطْهُرُ فَتُحْسِنُ الطُّهُورَ فَتَصُبُّ عَلَى رَأْسِهَا فَتَدْلُكُهُ دَلْكًا شَدِيدًا حَتَّى تَبْلُغَ شُؤُونَ رَأْسِهَا، ثُمَّ تَصُبُّ عَلَيْهَا الْمَاءَ، ثُمَّ تَأْخُذُ فِرْصَةً مُمَسَّكَةً فَتَطْهُرُ بِهَا: هەر یەکێ لەئێوە بەباشی بەئاو خۆی پاك بکاتەوە کەوا ئاو بەسەریدا بکات و بەتوندی دەستی پێدابێنێ هەتا دەستی دەگاتە سەر پێستی سەری، پاشان ئاوی بەسەردا بکات، پاشان بە پارچە لۆکەیەکی بۆنخۆش کراو خۆی پێ پاك بکاتەوە))

ئەسما گوتی: چۆن خۆمی پێ پاك بکەمەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "سبحان الله، خۆتی پێ پاك بکەرەوە" خاتو عائیشە گوتی: بیهێنە بە شوێن

---

[1] أخرجه أبوداود برقم (٢٠٧) و مالك في (الموطا) ١٠٦.
[2] أخرجه أبوداود (٢٣٦) و الترمذي (١١٣).

خوێنه‌كه‌دا.

ئینجا خاتو عائیشه (ڕه‌زای خوای لێبێ) گوتی: ((نِعْمَ النِّسَاءُ نِسَاءُ الْأَنْصَارِ لَمْ يَمْنَعْهُنَّ الْحَيَاءُ أَنْ يَتَفَقَّهْنَ فِي الدِّينِ: باشترین ئافره‌ت، ئافره‌ته ئه‌نساری‌یه‌كانن، شه‌رم كردنیان نه‌بۆته هۆی ئه‌وه‌ی له ئایین شاره‌زا نه‌بن.))[1].

ئا به‌م شێوه‌یه له‌م وێنه‌یه‌ی كه سوننه‌تی پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌یخاته ڕو، ئه‌و ئازادی و سه‌ربه‌ستیه به‌دی ده‌كه‌ین، كه پێغه‌مبه‌ر به‌یارانی ده‌به‌خشی بۆ ئه‌وه‌ی باس له گرفت و پرسیاره جنسیه‌كانیان بكرێت، به‌بێ ئه‌وه‌ی سه‌ر زه‌نشت بكرێن.

ئه‌م سه‌ربه‌ست پێدانه‌ی پێغه‌مبه‌ر ﷺ له‌به‌ر ئه‌وه‌بووه، تا زانیاریه‌كان به ڕاستی و دروستی پێیان بگات، بێگومان شاردنه‌وه و بوارنه‌دان به‌م جۆره پرسیارانه، ده‌بێته مایه‌ی دروست بونی تێگه‌یشتن و بیر و بۆچونی هه‌ڵه و ڕیزپه‌ر (شاذ) ده‌رباره‌ی ئه‌م بابه‌تانه.

گه‌وره‌ترین نمونه‌ش ئه‌و واقیعه‌یه، كه زۆربه‌ی لاوه‌كانی كۆمه‌ڵگاكانمان و ئه‌وانه‌ی په‌روه‌رده و ڕۆشنبیری جنسیان له هاوڕێیانیان، یان له په‌رتوك و گوڤار و وێستگه‌كانی ته‌له‌فزیۆنه‌وه وه‌رده‌گرن، كه ژه‌هر و بێ ڕه‌وشتی پێشكه‌ش ده‌كات، ئه‌مه‌ش مه‌ترسیه‌كی گه‌وره‌یه پێویسته له‌سه‌ر به‌رپرسانی پرۆسه‌ی په‌روه‌رده‌یی له ماڵ و، له مزگه‌وت و، له قوتابخانه و هۆیه‌كانی ڕاگه‌یاندن له‌ڕێی هۆشیار كردنه‌وه و په‌روه‌رده‌ی ڕاست و دروست دژایه‌تی و موحاره‌به بكرێ.

له‌و نمونانه‌ی سه‌باره‌ت به‌م په‌روه‌رده داخراوه‌ی كه من له‌گه‌ڵیدا ژیام ئه‌وه‌بو، كه له خوێندنی ئاماده‌یی‌دا هاوڕێی‌یه‌كم هه‌بو، له خێزانێكی دینداری زۆر ساده و ساكار ده‌ژیا، دیدی بۆ قسه‌كردن سه‌باره‌ت به جنس دیدێكی قێزه‌ون و ناشیرین بو، ته‌نانه‌ت ئه‌م دیده ببوه مایه‌ی ئه‌وه‌ی ئه‌م هاوڕێیه، كه گه‌یشتبوه ته‌مه‌نی پێگه‌یشتن هیچ شتێكی ده‌رباره‌ی خۆشوشتنی شه‌یتان پێكه‌نین (احتلام) نه‌زانێ،

[1] اخرجه مسلم (٣٣٢).

هەر لە بنەڕەتەوە ناتوانیّ ئەم حەقیقەتە بە کـەس و کـاری رابگەیـەنیّ، گرفتـی هەرە گەورەش ئەوەیە، کە خێزانەکـەی لـە هەفتەیـەکدا یـەك ڕۆژیـان تـەرخان کردبو، کە ئەندامانی خـێزان خۆیـانی تێـدا بشـۆن، جـا ڕیّ بـەهیچ یـەکیّ لـە ئەندامانی خێزان نادریّ لە ڕۆژانی تردا خۆی بشوات!

لەبەر ئەوە دوپاتی دەکەمەوە، دایك و باوك گرنگی بدەن بە پەروەردە کردن و رۆشنبیری جنسی بۆ منداڵان، ئەم رۆشنبیریەش بەشـێوەیەکی سـادە و سـاکار و راست و دروست پێشکەش بکریّ، کە ئامانجە ئیسلامیەکان لە پـەروەردەکردن و پێگەیاندنی منداڵ بەجیّ بهێنریّ، ئەمەش لـەڕیّی ئـەم حەقیقەتـە ڕاسـتەقینە یەکەمانەوە بەجیّ دەهێنریّ:[1]

١-پێویستە باوکان و پەروەردیاران دیدیان بۆ پەروەردەی جنسـی بریتـی بـیّ لەوەی، کە بەشێکە لە پرۆسەی پەروەردەیی، کە پرۆسـەیەکە تـاکی تێـدا فـێری ژیان دەبێت و بەساغ و دروستی کەسایەتی‌یەکەی تێدا گەشە دەکات.

٢-منداڵ هەر بـە منداڵێتـی نامێنێتـەوە، بەڵکـە گـەورە دەبـیّ و جنسـی پێدەگـات، کەواتـە سـەبارەت بـە قۆنـاغی پێگەیشـتن و پێگەیشـتنی جنسـی؛ پێویستی بەزانیاری راست و دروست هەیە.

٣-سـەرەڕای ئـەوەی گۆڕانکاریـە فسـیۆلۆجیەکانی پێگەیشـتنی جنسـی دەکەوێتە ماوەی هەرزەکاری، بەڵام هێزی جنسی پێویسـت هـەر لـە منداڵیـەوە کاری خۆی دەکات.

٤-هەرزەکار زۆر حەز دەکات ئاشنایی هەبێت بە راسـتیەکانی جنسـی، جـا گەر لە لایەن دایك و باوکەوە بەشێوەیەکی ڕاست و دروست ئەم راسـتیانەی پـیّ نەگوتریّ، ئەوا هەوڵ دەدات بەڕێیەکی نادروستەوە زانیـاری جنسـی بـە دەسـت بێنیّ.

---

[1] لەم لێکۆڵینەوەدا سودم لە کتێبی (تربیة الاولاد و آلاباء في الاسلام) و کتێبی (علم نفس النمو) وەرگرتوە.

٥-غەریزەی جنسی هێز و کاریگەری خۆی هەیە و نـاکرێ خـۆی لیّ بیّئاگـا بکرێ، هەروا ناکرێ شوێنەواری لەسەر دەرون و ڕەفتاری منداڵ بیّ ئاگا بکرێ.

٦-بەدەرکەوتنی پاڵنەر و ئارەزوی جنسی لـەلای منـداڵ، بەتایبـەتی لـەلای هەرزەکاراندا، کردەیەکی یەکسان و سروشتییە، کە ئاکامێکی حەتمی هەیـە بـۆ گەشەکردنی.

٧-پـەروەردەکردنی سـاغ و دروسـتی جنسـی منـداڵان؛ گرنگـترین هـۆی سەرکەوتنیانە لە ڕەفتاری جنسیدا، لەکاتی هاوسەرگرتندا.

٨-بیّ ئاگابون لە ڕۆڵ و کاریگەری غەریزەی جنسی منـداڵ؛ دەبێتـە مایـەی ئەوەی کە ئاکامێکی زۆر خراپی هەبێت، کەوا منداڵەکە لە ڕەفتـار و هـەڵس و کەوتیدا ڕیزپەڕ (شاذ) دەرچێت.

لەوەی رابردو گرنگی و ڕۆڵی پەروەردەی جنسی منداڵمان بۆ دەردەکـەوێ لـە هەبونی کاریگەری بەسەر ڕەفتار و ڕەوشتیاندا، زۆریـش گرنگـە دایـك و بـاوك ئاشنابن بەو تەمەنەی کە پەروەردە و ڕۆشنبیری پێشکەش بە منداڵ دەکەن.

لەڕاسـتیدا پێویسـتە پـەروەردەی جنسـی بەشـێوەیەکی پلەپلـەیی (تـدرج) ئاراستەی منداڵ بکرێت، کە لە شتە سەرەتاییەکان دەسـتپێدەکرێت و بـەپیّی قۆناغەکانی تەمەن و پێداویستی هـەر قۆنـاغێك، ڕاسـتیەکانی بـەم شـێوەیەی خوارەوە ئاراستە دەکرێ:

-لە ٦تا٩ ساڵی: منداڵ فێری ئادابی مۆڵەت وەرگرتـن دەکرێـت بـۆ هاتنـە ژورەوە و چاو دانەواندن لە شتی حەرام.

-لە ١٠تا ١٤ ساڵی: منداڵ لەو شتانە دور دەخرێتـەوە کـە دەبێتـە مایـەی وروژاندنی جنسی و تێکەڵاوی، هـەروا زانیـاری پێویسـت دەربـارەی پێگەیشـتن (بلوغ) و خۆشوشتنی ئاراستە دەکرێ.

-لە ١٥تا١٦ سـاڵی: منـداڵ فـێری حەقیقـەتی جوتبـون و ئـاوی (وەدی) و (مەزی) و (مەنی)، (خوێنی بیّ نوێژی، خوێنـە چرکـە زەردایـی، کـدرە)، لـەم

ئەمەنەدا وریایی دەدرێتە منداڵ لە مەترسیەکانی (شذوذ جنسي) و لارێبون (انحراف)، ئەویش بەسزادانی خوا لە ڕۆژی دوایی، یان بە نەخۆشی و مەترسیە کۆمەڵایەتیەکان لە دنیادا و چاندنی ترسی خوا لەدڵدا و چاودێری کردنی خۆی و، باس کردنی هەندێ نمونەی چاك لە گەنج و لاوە داوێن پاك و تەقوا دارەکان بۆ منداڵ.

لە نمونەی ئەو گەنجە داوێن پاکانە؛ چیرۆك و بەسەرهاتی یوسفە (عليه السلام)، کەوا چۆن ژنی عەزیزی میسر تەمای تێکرد و خۆی بۆ ئامادەکرد و هەڕەشەی لێکرد گەر ئەم کارەی لەگەڵ ئەنجام نەدا، بەڵام یوسف لەبەر دینداری و ترسان لە خوای گەورە ئەم کارەی نەکرد، خوای گەورەش سەرفراز و سەرکەوتوی کرد. وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَرَاوَدَتْهُ ٱلَّتِى هُوَ فِى بَيْتِهَا عَن نَّفْسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلْأَبْوَٰبَ وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ ۚ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ ۖ إِنَّهُۥ رَبِّىٓ أَحْسَنَ مَثْوَاىَ ۖ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾ وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ ۖ وَهَمَّ بِهَا لَوْلَآ أَن رَّءَا بُرْهَٰنَ رَبِّهِۦ ۚ كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلْفَحْشَآءَ ۚ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُخْلَصِينَ: ئەو ژنە وا یوسف لەماڵی ئەوا بو، تەمای تێکرد و دەرگاکانی لێ داخست و گوتی: بەلەز ئامادەیە: گوتی: ئەی پەنا بەخوا، ئەو ئاغامە، قەدری گرتوم، (بێ ئەمەگانی داوێن پیس) کە ناهەقن، ڕزگار نابن، وێ پەلاماری ئەوی دا و ئەمیش گەر بەڵگەی پەروەردگاری نەدیبا، ئاوقای دەبو، بۆ ئەمە بو کە خراپ و شورەیی لێ بسرێتەوە، ئەم یەکێ بو لە عەبدە دڵپاکەکانمان.﴾ یوسف:٢٣-٢٤.

لە پەرتوکی تەفسیرەکاندا هاتوە، ژنی عەزیزی میسر، کە داواکاری خراپەی لە یوسف کرد پێی گوت: یوسف! ڕوخسارت چەند جوانە!

یوسف (عليه السلام) گوتی: پەروەردگارم لە منداڵدان وێنەی کێشام.

ژنەکە گوتی: یوسف! قژت چەند جوانە!

یوسف گوتی: یەکەم شتمە کە لە گۆڕدا دەفەوتێ و نامێنێ.

ژنەکە گوتی: یوسف! چاوەکانت چەند جوانە!

یوسف گوتی: بەهەردو چاوانم تەماشای پەروەردگارم دەکەم.

ژنە گوتی: یوسف! ئەوە من لێت نزیك دەبمەوە، کەچی تۆ لێم دور دەکەویەوە.

یوسف گوتی: بەم دورکەوتنەوەیە دەمەوێ لە پەروەردگارم نزیك بمەوە.

ژنەکە گوتی: یوسف! ئەوە نوێنم بۆ ڕاخستوی، وەرە ژورەوە.

یوسف گوتی: نوێن و پێخەف لە پەروەردگارم ناشارێتەوە.

ژنەکە گوتی: یوسف! ئەوە ئاوریشمم بۆ ڕاخستوی، هەستە کاری خۆتم لەگەڵدا بکە.

یوسف گوتی: کەواتە لە بەهەشت بێبەش دەبم[1].

هەروەها لەو جۆرە نمونانە، نمونەی بابای بۆن میسکە، کە بازرگانی قوماش بوە و بەناو کۆڵانەکاندا گەڕاوە، ئافرەتێکی دەوڵەمەندیش بانگی دەکات بۆ ژورەوە گوایە دەیەوێ تەماشای قوماشەکانی بکات، پاشان ژنەکە هەڕەشەی لێدەکات، کەوا بەخەڵك دەڵێ ئەم پیاوە دەیەوێ دەست درێژی لێ بکات و کاری خراپی لەگەڵدا بکات، پیاوە بازرگانەکەش فێڵی لێ کرد و پێی گوت: یەکەمجار دەمەوێ بچمە ئاودەست، جا کە چوە ئاودەست پیسایی بەخۆی هەڵسوی و هاتە دەرەوە و چوە ژوری ژنەکە، کاتێ ژنەکە بەم شێوەیەی بینی و بۆنی ناخۆشی لێدەهات، یەکسەر ڕایکرد و هەڵات، پیاوەکەش لەم کارە خراپەیە بەساغی دەربازی بو، ئەم پیاوە پێی باشتربو خەڵك بەم حاڵەتەوە بیبینن، نەك سەرپێچی خوا بکات، پاشان چوە ماڵی خۆی و خۆی شوشت، دوای ئەمە لە هەر شوێنێك بایە بۆنی میسکی لێدەهات.

هەر لەو نمونانە، بەسەرهاتی ئەو ژنە جوانەیە، کە لە مەککە بوە و مێرددار

---

[1] تفسیر القرطبي ج۹/۱٦٥.

بوە، جا لەبەر ئاوێنە تەماشای روخساری خۆی کردوە و بەمێردەکەی گوتوە: وادەبینی یەکێك ئەم ڕوخسارە ببینێ و پەی شێت و شەیدا نەبێ؟

مێردەکەی گوتی: بەڵێ.

ژنەکە گوتی: کێ.

مێردەکەی گوتی: عبید بن عمیر.

ژنەکە گوتی: ڕێگەم پێ بدە دەچمە لای و توشی فیتنەی دەکەم.

مێردەکەی گوتی: ئەوا ڕێگەم پێدای.

جا ژنەکە وەك پرسیارکەرێك چوە لای و لە لایەکی مزگەوتەکە لەگەڵی دانیشت و پەردەی لەسەر دەم و چاوی هەڵدایەوە، دەتگوت مانگی چواردەیە.

عبید بن عمیر پەی گوت: دەم و چاوت داپۆشە.

ژنەکە گوتی: من مەفتونی تۆم.

عبید گوتی: گەر هەر پرسیارێکت لێ بکەم، بەڕاستی وەڵامم بدەیتەوە، ئەوا چاوێك بەکارەکەت دادەخشێنمەوە.

ژنەکە گوتی: هەر پرسیارێکم لێ بکەی بەڕاستی وەڵامت دەدەمەوە.

عبید گوتی: پێم بڵێ! گەر مەرگەوان (ملك الموت) هاتە لات گیانت بکێشێ، پێت خۆشە کارەکەت بۆ بەجێ بێنم (زینات لەگەڵدا بکەم)؟

ژنەکە گوتی: نا بەخوا.

عبید گوتی: ڕاستت گوت، گەر خەڵك نامەی کردەوەکانیان پێدراوە تۆش نازانی نامەکەت بەدەستی ڕاستە دەدرێتێ، یان بە دەستی چەپ، ئایا لەو کاتەدا پێت خۆشە کارەکەتم بۆ بەجێ بهێنابای؟

ژنەکە گوتی: نا بەخوا.

عبید گوتی: گەر بۆ لێپرسینەوە لەبەردەستی خوای گەورە ڕابوەستی، ئایە پێت خۆشە کارەکەتم بۆ بەجێ بهێنابای؟

ژنەکە گوتی: نا بەخوا.

عبید گوتی: ڕاستت گوت، کەواتە لە خوا بترسە، ئەوە خوا نیعمەت و چاکەی لەگەڵدا کردوی.

ژنەکەش گەڕایەوە لای مێردەکەی و گوتی: چیت کرد؟

گوتی: تۆ ناڕاستی و ئێمە ناڕاستین، ئینجا ژنەکە دەستی کرد بە نوێژ و ڕۆژو گرتن و عیبادەت کردن.

هەروەها هەر لەم نمونانە، ئەو بەسەرهاتەیە کە لە (عبدالرحمن بن أبي عمار) دەگێڕنەوە کە ناسرابو بە (قس)، یەکێك بوە لە هەرە خوا پەرستەکانی مەککە و بە (عطاء بن أبي رباح) دەچوێندرا.

ڕۆژێك گوێی لە گۆرانی (سلامة) بـو بـەبێ ئـەوەی بەمەبەسـت گـوێی لێ ڕابگرێ، جا گۆرانیەکەی زۆر بەلاوە خۆش بـو، خزمـەتکاری (سـلامة) (قـس)ی بینی و پێی گوت: دەتەوێ (سلامە)ت بۆ بێنـم، یـان تـۆ بچیـە لای تـا گـوێ بیستی گۆرانیەکەی بی؟ ئەویش نەهێشتی ئەو بێتە لای و نەخۆیشـی چـوە لای، خزمەتکاری (سلامە) گوتی: من (سلامە) دێنم لە شوێنێك دایدەنێم گوێـت لـە گۆرانیەکەی بێ و نەیبینی، ئەویش نەیهێشت، جا بـەم شـێوەیە مایـەوە، هـەتا هاتە ژورەوە و گۆرانیەکەی خۆی دا بەگوێی (قس)، ئەویش پێی سەرسـام بـو، پێی گوت: دەمەوی (سلامە)ت بۆ بێنم، ئەویش نەیهێشت بۆی بێنێ، بەڵام ئەو بۆی هێنـا و لەبـەردەمی داینـا، جـا (سـلامە) هونـەرکاریی خـۆی ڕانوانـد[1]، (قس)یش دڵی پێوە نوسا و (سلامە)ش دڵی بەو نوسا و شەیدای بو.

خەڵکی مەککەش بەم مەسەلەیان زانی.

ڕۆژێك (سلامە) گوتی: بەخوا تۆم خۆش دەوێ.

(قس)یش گوتی: بەخوا منیش تۆم خۆش دەوێ.

(سلامە) گوتی: حەز دەکەم ئامێزت پێدا بگرم.

(قس) گوتی: بەخوا منیش حەز دەکەم.

---

[1] ڕانواندن: خستنە ڕوو.

(سلامە) گوتی: ئەدی بۆچی لە ئامێزم ناگری، بەخوا ئێرە شوێنێکی چۆڵە.

(قس) گوتی: گوێم لە فەرمودەی خوا بوە کە دەفەرموێ: ﴿ٱلۡأَخِلَّآءُ يَوۡمَئِذِۭ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلۡمُتَّقِينَ: ئەوێ ڕۆژێ یاران هەمو دەبنە نەیاری یەکتری؛ جا مەگین خۆ پارێزەکان.﴾الزخرف:٦٧.

پاشان (قس) هەستا و چو بەلای خواپەرستیەکەیەوە[1].

دەربارەی داوێن پاکی و لە خواترسانی پیاوچاکان و دانانی خوا بە چاودێر لەکاتی روبەڕوبونەوەیان بۆ فیتنە و کاری خراپە نمونە زۆرە، بەنمونە هێنانەوەی ئەم چیرۆك و بەسەرهاتانە، ڕۆڵی کاریگەریان دەبێت لەسەر چەسپاندنی ڕەوشت و ئایینی مندالآن و پاراستنیان لە هەڵخلیسکانەکانی ئارەزوبازی و سەرپێچی و تاوانکاری.

هەروەها لەو کاتەی کوڕ و کچ نزیك تەمەنی هاوسەرگرتن (زواج) دەبن، پێویستە لەسەر دایك و باوکان زانیاری راشکاو و ڕاست و دروست دەربارەی جوتبونی ڕاست و دروستی ژن و مێرد لە لایەنی (وظیفي) و دەرونی‌یان بدەنێ، کە ئەمەش دەبێتە یاریدەدەریان بۆ سەرەتای پەیوەندیەکانی هاوسەرگرتنیان بەشێوەیەکی ڕاست و دروست.

گەورەترین هەڵە کە دایك و باوك تیێ دەکەوێ ئەوەیە، کە کچ یان کوڕ بەبێ ئەوەی هیچ ئامۆژگاری، یان زانیاریان دەربارەی پەیوەندی جنسی و چۆنیەتی مامەڵە و کارلێکردنی ژن و مێرد لەلایەن دایك و باوکیانەوە وەرگرتبێ؛ دەچنە خانوی ژن و مێردایەتیەوە.

---

[1] صفحات مشرقة، نقلا عن کتاب (الاغاني) ج٨/٦-٧، سەرنج بدە ئەو جیاوازیە زۆرەی نێوان حەقیقەتی پەیوەندی نێوان (سلامە) و (القس) و ئەو وێنەیەی کە لەسەر شاشەی سینەما دەربارەیان نەقل کراوە.

# ئامانجەکانی پەروەردەی جنسیی

بۆ ئەوەی قسەکانمان دەربارەی پەروەردەی جنسی تیۆر (نظر)ی پەرت و بڵاو نەبێ، پێویستە پرسیارێکی زۆر گرنگ بکرێت، ئەویش ئەوەیە:

ئەو ئامانجانە چین، کە ئیسلام دەیەوێ لەمیانەی پەروەردەکردنی جنسی منداڵدا بەجێیان بهێنێ[1]؟

لە ڕاستیدا وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە لەڕوانگەی ئیسلامیەوە پێویستی بە توێژینەوەیەکی فراوان و گشتگیر (شامل) هەیە دەربارەی ئەم بابەتە، هیچیشی تیا نیە، ئامانجە هەرە گرنگەکان باس بکرێن، کە ئەمانەن:

١-زانیاری ڕاست و دروست دان سەبارەت بە کرۆك و ماهیەتی چالاکی جنسیی، لەمیانەی ناسینی بەشەکانی کۆئەندامی زاوزێی پیاو و ژن و چۆنیەتی کارکردنی هەر یەکێکیان، هەروا ئاشنابون بە حەقیقەتی و ئامانجی جوتبون، هەمو ئەمانەش بە پلەپلەیی ئەنجام دەدرێ و بەشێوەیەك کە لەگەڵ تەمەنی منداڵ بگونجێ و لەژێر ڕێنمایی‌یەکانی قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ و پەرتوکە زانستی‌یەکان بێت.

٢-پاکخویی‌کردن (تهذیب)ی ڕەفتاری منداڵان و پەروەردەکردنی ڕەوشتیان، لەمیانەی ئاراستە ئیسلامیەکان و ڕەوشتە تایبەتەکانی ئادابی ڕەفتاری جنسی و دورکەوتنەوە لە وروژێنەرە جنسیەکان.

٣-هاندانی لەسەر گەشەپێدانی بەندوبەست (ضوابط)و ویست (إرادي)یەکان بۆ پاڵنەر و ئارەزوە جنسیەکانی و هەستکردنی بە بەرپرسیارێتی تاکی و کۆمەڵایەتی و ئاشنابون بە مەترسی ئازاری جنسی لەسەر تاك و کۆمەڵگەدا.

٤-ڕاستکردنەوەی ئەو زانیاری و بیروڕا هەڵانەی، کە دەربارەی ڕۆڵ و

[1] ئەم لێکۆڵینەوەم لە کتێبی (تربية الاولاد و الاباء في الاسلام) لاپەڕە ٢٣٧ وەرگرتوە کە لە کتێبی (علم نفس النمو) گواستراوەتەوە.

حەقیقەتی جنس رانواندنراوە، هەروا هاندانی لەسەر ئەوەی کە بیروڕاکانی خۆی دەربارەی جنس بخاتە ڕو، تاوەکو جنس نەبێتە کەل و پەلێك بەدەستی بازرگانەکانیەوە بمێنێتەوە و مانەوەکەی لەتاریکی فیکردا بقۆزنەوە و دوریێ لە خستنە ڕوی ڕاست و تاوتویێ کردنی ساغ و دروست.

٥-پێشکەشکردنی کۆمەڵێك ئاڕاستەی سۆزداری بەرز و داب و نەریتی ڕاست و بەرز بەمنداڵان[١].

٦-هۆشداریدانی منداڵان لەو تیۆر و بیروبۆچونە درۆیانە دەربارەی جنس دەگوترێ، هەروا بەمنداڵ ڕابگەیەنرێ کە جنس گرنگترین چەکی دوژمنانی مسوڵمانانە، کە بۆ ڕوخان و تێکدانی ئیسلام بەکاری دێنن.

٧-گشتگیری و تێر و تەواوی واقیعی ئیسلام دەربخرێ، هەروا دەربخرێ کە ئیسلام چارەسەری گشت گرفتەکانی مرۆڤایەتی دەکات[٢].

---

[١] خفايا المراهقة، ص١١٦.

[٢] التربية الجنسية في الاسلام، ص١٣.

## ئەو هۆ و وەسیلانەی ئیسلام بۆ پاراستنی تاك لە هەڵخلیسکێنەکانی جنسی گرتۆتە بەر

ئیسلام دانی ناوە بە هەبونی غەریزەی جنسی و شوێنەواری گەورەی لە ژیانی ئادەمیزاددا، جا بۆ پاراستنی ئادەمیزاد لە ئاسەوارە خراپەکان و ئەم وزەیە و ئاڕاستەکەی بە ئاڕاستەیەکی هەڵە نەتەقێتەوە، ئیسلام چەند هۆ و وەسیلەیەکی داناوە، کە پێویستە دایك و باوك بۆ پاکخویی کردنی غەریزەی جنسی منداڵ بیگرنە بەر، کە بریتین لە:

### یەکەم: ڕێگریکردن لە وروژێنەرە جنسیەکان:

گرنگترین ئەو هۆیانەی منداڵ لە خلیسکە جنسیەکان دەپارێزێ، ئەوەیە کە هەوڵ بدرێ نەهێلرێ وروژێنەرە جنسیەکانی بەرچاو بکەوێ، هەر چەندە لەراستیدا ئەمە کارێکی زۆر زەحمەتە، بەتایبەتی لەو بارودۆخەی تێیدا دەژین، کەوا هۆیەکانی راگەیاندن بە تەلەفزیۆن و گۆڤار و پەرتوك و وێنەکان و.. هتدەوە دیمەنی بەرەڵلایی و وروژێنەر رادەنوێنرێ.

بەڵام وێڕای ئەمەش مەحاڵ نیە مرۆڤ خۆی لە وروژێنەرە جنسیەکان دورخاتەوە، گەر پابەندی ئاڕاستە و ڕێنماییەکانی پێغەمبەر ﷺ تایبەت بەم بابەتەوە بێت، وروژێنەرە جنسیەکانیش ئەمانەن:

**١-چاو دانەواندن:**

گرنگترین هۆیەکانی دورکەوتنەوە لە هەڵخلیسکان و وروژێنەرە جنسیەکان، چاو دانەواندنە لە حەرام.

چونکە چاو پۆستە و ڕێگەی کاری خراپەکاری و داوێن پیسیە و یەکەم هۆی گومڕایی و بەهیلاك چونە.

بەر رەحمەتی خوا کەویٚ ئەو کەسەی ئەم چەند دێڕەی گوتوە:

كل الحوادث مبدأها من النظر … و مُعظمُ النارِ منْ مستصغر الشرر
كم نظرةٍ فتكتْ في قلْب صاحبها … فتك السهام بَلا قوس ولا وَتَر
والمرءُ مادام ذا عينٍ يُقلِبها … في أعين الغيد موقوفٌ على الخطر
يَسُر مُقلتهُ ماضرَ مُهْجَتَهُ … لا مرحباً بسرورٍ عادَ بالضَرَر

گەر منداڵ هەر لە منداڵیەوە لەسەر چاو دانەواندن راهێنرا و پەروەردە بو، ئەوا بەرگری کردنی بۆ وروژێنەرە جنسیەکان زۆر زۆر دەبێ.

بۆیە ئیسلام لەسەر ئەم ڕەوشتە زۆر هانیداوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَصَـٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُواْ عَن كَثِيرٍ: هەر کاتێ توشی بەڵایەك بون، بەهۆی کردەوەی خۆتانە، لەزۆر گوناهەکانیشتان چاو دەپۆشێ﴾ الشورى: ٣٠.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی: ((مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَنْظُرُ إِلَى مَحَاسِنِ امْرَأَة ثُـمَّ يَغُضُّ بَصَرَهُ، إِلاَّ أَحْدَثَ اللَّهُ لَهُ عِبَادَةً يَجِدُ حَلاوَتَهَا: هەر مسوڵمانێك تەماشای ژنێکی جوان بکات و پاشان چاوی دانەوێنێ، ئەوا خوا ئەو چاو دانەواندنەی بۆ دەکاتە عیبادەت و لەدڵیدا هەست بە شیرینیەکەی دەکات.))[1]

هەروەها دەفەرموێ: ((النظرةُ سهمٌ مسمومٌ من سهام إبليس، من تركها من مخافتي أبدلته إيماناً، يجد حلاوته في قلبه: روانینی حەرام تیرێکی ژەهراوی شەیتانە، هەرکەسێ لەترسی من ڕوانینی حەرام وازبێنێ، ئەوا لەبری ئەوە بڕوای بۆ زیاد دەکەم، کە لەدڵیدا هەست بە شیرینیەکەی دەکات.))[2].

هەروەها دەفەرموێ: ((يَا عَلِيُّ لا تُتْبِعْ النَّظْرَةَ النَّظْرَةَ فَإِنَّ لَكَ الأُولَى وَلَيْسَتْ لَكَ الآخِرَةُ: عەلی! نەزەر لەدوای نەزەر نەکەی، یەکەمت بۆ دروستە،

[1] أخرجه الهيثمي في (مجمع الزوائد) ج٨/٦٣.
[2] أخرجه الحاكم في المستدرك، ج٤/٣١٤.

بەلاَم دوەم جار تەماشای بکەیەوە بۆت دروست نیە.))[1]

**٢-جیاکردنەوەی شوێنی خەوتن:**

لە ڕێنماییەکانی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ڕێگرتن لەو شتانەی دەبێتە هۆی وروژاندنی جنسی منداڵ: جیاکردنەوەی شوێنی خەوتنیانە، نەبادا لەکاتی نوستن شذوذی جنسی لەنێوانیان روبدات.

دەربارەی جیاکردنەوەی نوستن پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ((**مُرُوا أَوْلَادَكُمْ بِالصَّلَاةِ وَهُمْ أَبْنَاءُ سَبْعٍ، وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا وَهُمْ أَبْنَاءُ عَشْرٍ، وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَاجِعِ**: لە تەمەنی حەوت ساڵی فەرمان بە منداڵەکانتان بکەن نوێژ بکەن، لە تەمەنی دەساڵی لەسەر نوێژکردن لێیان دەن و جێگەی خەوتنیان لێك جیابکەنەوە.))[2].

ئەمەش لایەنێکە پێویستە وریابین، تاوەکو منداڵان نەبنە قوربانی فەرامۆش (إهمال)ی سەرپەرشتیاران.

**٣-نەهێشتنی تێکەڵاوی و بەتەنها بون لەگەڵ ئافرەتی بێگانە:**

ئیسلام سورە لەسەر قەدەغەکردنی تێکەڵاوی و کۆبونەوە بەتەنها لەگەڵ ئافرەتی بێگانە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە تا وروژێنەرە جنسیەکان کەم ببێتەوە.

دەربارەی ئەمە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((**مَا خَلا رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إِلاَّ كَانَ الشَّيْطَانُ ثَالِثُهُمَا**: هەر پیاوێك بەتەنها لەگەڵ ژنێك دابنیشێ: ئەوا سێیەمیان شەیتانە.))[3].

هەروەها فەرمویەتی: ((**إِيَّاكُمْ وَالدُّخُولَ عَلَى النِّسَاءِ.. فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ: أَفَرَأَيْتَ الْحَمْوَ؟ قَالَ: الْحَمْوُ الْمَوْتُ**: نەکەن بەتەنها بچنە لای

---

[1] أخرجه الترمذي برقم (٢٧٧٨) و أبوداود برقم (٢١٤٩).
[2] أخرجه أبوداود (٤٩٥) و أحمد في مسنده ج٢/١٨٠.
[3] أخرجه الهيثمي في مجمع الزوائد ج٥/٢٢٥.

ئافرەتان، پیاوێکی ئەنساری گوتی: ئەدی ئەگەر ئەۆ کەسە خزمی مێردەکەی بو؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: خزمی مێرد، ئەوە هەر مردنە.))[1] .

بێگومان ئەو تێکەڵاویەی ئیسلام قەدەغەی کردوە، ئەو تێکەڵاویەیە کە ئافرەتان تێیدا پابەند نین بە بنچینەکانی ئیسلامی، کە فەرمان دەکات بەحیجاب پۆشین و قەدەغەی کۆبونەوە بەتەنها لەگەڵ ئافرەتی بێگانە دەکات.

بەڵام گەر ئافرەت پابەندبو بە رێساکانی ئیسلام و حیجابی پۆشی، ئەوا تێکەڵاوی گرفت نیە، بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە، کە لە ژیانی گشتی کۆمەڵایەتی هاوەڵان دا، زۆر هاتوە کەوا ئافرەتانی هاوەڵان لەگەڵ هاوەڵان تێکەڵ بون، پێغەمبەریش ﷺ ئیقراری لەسەر کردوە.

**٤-پابەندبون بە حیجاب پۆشین و بەدەرنەخستنی جوانی و رازاوەیی:**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ: وەك دەورانی زەمانی نەزانی پێشو، خشڵ و رازاوەیی خۆتان نیشان مەدەن ﴾.

بێگومان کچان کە دەچنە دەرەوە و بەسفوری و بەخۆ جوان کردن و ئارایش کردنەوە بەدیار دەکەون، لەگرنگترین هۆیەکانی وروژاندنی جنسی گەنج و لاوانە، دوای ئەمەش گرنگترین هۆیەکانی کەوتنە نێو رەفتارە هەڵەکانەوەیە.

هەر لەبەر ئەوەشە ئیسلام سورە لەسەر ئەوەی ئافرەت پێش ئەوەی بلوغی ببێت، دەبێ حیجابی ئیسلامی بپۆشێ، حیجابەکەش بەشێوەیەك دەپۆشێ، کەهەمو لەشی بگرێتەوە جگە لە دەم و چاو و هەردو دەستی، بەبێ ئەوەی خۆی ئارایش بکات.

دەربارەی حیجاب پۆشینیش پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((يَـا أَسْـمَاءُ، إِنَّ الْمَرْأَةَ إِذَا بَلَغَت الْمَحِيضَ لَمْ تَصْلُحْ أَنْ يُرَى مِنهَا إِلَّا هَذَا وَهَذَا، وَأَشَارَ إِلَـى وَجْهِهِ وَكَفَّيْهِ: ئەسما! ئافرەت کە خوێنی بێ نوێژی بینی، بۆی دروست نیە هیچ

[1] اخرجه البخاري (٤٩٣٤).

شوێنێکی لەشی ببینرێ، مەگەر ئەمە و ئەوە نەبێت، پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ دەم و چاوی و هەردو دەستی کرد.))[1].

لەبەر ئەوە پێویستە دایك و باوك سوربن لەسەر راهێنانی کچەکەیان کە حیجابی ئیسلامی بپۆشێ، ئەوەش بەپلەپلەیی و هێدی هێدی دەبێت، بەر لەوەی لەسەری پێویست (واجب) ببێ، هەروا لەسەر حیجاب پۆشین رابهێنرێ و هانی بدرێت.

هاندانەکەش بەوە دێتە دی، کەوا دایك و باوك هەردەم لەلای کچەکەیان باسی ئەوە بکەن هەر کاتێ گەیشتە تەمەنێکی دیاریکراو، پێویستە لەسەری حیجاب بپۆشێ، وەك چۆن دایکی و پورەکانی دەیپۆشن، هانی بدرێ بەوەی هەر کاتێ ئەم حیجابە دەپۆشێ زۆر پیێ جوان دەبێ.

هەروەها هەر لە منداڵییەوە کچ رابهێنرێ، کە جلی کورت لەبەر نەکات، کە قاچ و شانی بەدەر دەخات.

هەروەها لە هۆیەکانی هاندانی حیجاب پۆشین ئەوەیە، کە بەبۆنەی حیجاب پۆشینەوە، ئاهەنگی بۆ ساز بکرێ و هاورێکانی و خزمەکانی بانگ بکرێن بۆ ئەوەی بەشداری ئەم بۆنەیە بکەن و چاوی لیێ بکەن.

پێویستە قەناعەت بەکچ بهێنرێ، کە حیجاب پۆشین فەرمانی خوایە، ئەم حیجابەش گەورەیی‌یە بۆی و ریزی زیاتر دەکات و هەرگیز رێ ناگرێ لە جوڵە و تێکەڵ بون بە کۆمەڵگە.

## دوەم: ترساندنی بە سزادانی لارێیە جنسیەکان (الانحرافات الجنسیة):

لەو هۆیانەی کە ئیسلام بۆ پەروەردەی جنسی فەروان کردوە، ترساندنە بە سزا و خەشم و تورەیی خوا گەر قەدەغەکراوەکانی خوا پێشێل کرا و سنور بەزێن

[1] اخرجه أبوداود (٤١٠٥).

كرا.

شتێكی بەسودە دایك و باوك لەبەردەمی منداڵاندا سورەتی نور بخوێننەوە و مانایان بۆ بكەن و ئەو سنور (حدود)انەیان پێ بناسێنێ، كە خوا داینـاوە بۆ سزادانی ریزپەڕان (الشاذین)، ئەوانەی پێچەوانەی شەرعی خوا دەكەن.

## سێیەم: تەركیزكردنە سەر رۆڵی عیبادەت كردن:

ئەو پەرستشانەی مرۆڤ ئەنجامی دەدات، كاریگەریـەكی گـەورەی هەیـە لـە چـاندنی دڵنیـایی و دڵنـەوایی لـە دەرونـی و لـە ڕاسـتكردنەوەی رەفتـار و رەوشـتەكانیدا. خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۗ: نوێژكردن مرۆڤ لـەكاری ناشـیرین و ناڕەوا دەپارێزێ، یادی خوا هێژا ترە.﴾ العنكبوت:٤٥.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی: ((يَا مَعْشَرَ الشَّبَاب مَن اسْتَطَاعَ مِنكُمُ الْبَاءَة فَلْيَتَزَوَّجْ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءً: ئـەی كۆمـەڵی گـەنجان، هەر كەسێك لە ئێوە توانای بەڕێوەبردن و هەستان بە ئەركەكان و بەرپرسـیارێتی هاوسەرگرتنی هەیە، با هاوسەر بۆ خۆی پەیدا بكات، هەر كەسێكیش نـەیتوانی با بەڕۆژو ببێ، چونكە ڕۆژو دەبێتە قەڵغان، كە لە خراپەی دور دەخاتەوە.))[1]

سەرەڕای ئەوەی ئەو شوێنەوارەی كە عیبادەت لەسەر دەرون بـەجێی دێڵـێ، ڕۆژو لە عیبادەتەكانی تر زیاتر شوێنەواری گەورەی هەیە لە پاڵاوتەكردنی دەرون و بێ هێزكردنی غەریزەی جنسی گەنجان.

## چوارەم: پڕكردنەوی كاتی بەتاڵی هەرزەكار:

هەرزەكار كە هەست بەكاتی بەتاڵی دەكات، شوێنەواری گەورەی دەبێـت لـە

[1] أخرجه البخاري (١٨٠٦) و مسلم (١٤٠٠).

لاڕێ بونی و کەوتنە ناو هەڵەوە، لەبەر ئەوە پێویستە دایـک و بـاوک کاتـەکانی هەرزەکار بەکارکردن و وەرزش پڕ بکەنەوە، شـاراوەش نیـە وەرزش شـوێنەواری خۆی هەیە بەتایبەتی لە بەتاڵ کردنی وزەی هەرزەکار.

بەر لەوەی بابەتی پەروەردەکردنی جنسی منـداڵ کۆتـایی پـێ بێنـین، دەبـێ وریابین کاتێ هەست دەکەین منداڵ نەریتێکی جنسی ریزپەڕ (شـاذ) مومارەسـە دەکات، یان دوچاری گرفتەکانی جنسی بوە، دەرگای گفتوگۆ کردن لەگەڵ منداڵ بکەینەوە و توند و تیژی لەگەڵیان بەکارنـەهێنین، باشـتر وایـە باوکـان نـەهێڵن منداڵەکانیان هەست بەوە بکەن، کـە ئـەوان ئاگـاداری ڕەفتارەکانیـانن، بەڵکـە دەبێ لە بۆنەیەکدا ئاماژە بەو کردەوەیان بکرێ، کە ئەمە گونجاو و لایەق بـەوان نیە ئەم کارە ناشیرینە بکەن و بڕواش ناکرێ ئەم کردەوەیە لەوانەوە دەربچێت.

پێشتریش باسمان کرد چۆن پێغەمبەر ﷺ بە گفتوگـۆ قەناعـەتی بـەو گەنجـە هێنا زینا نەکات، کە هاتبو مۆڵەت وەربگرێ زینا بکات[1].

---

[1] بگەڕێوە بابەتی (گفتوگۆ و موناقەشە) لەم پەرتوکەدا.

# پێناسە و مەترسی هەرزەکاریی

ئادەمیزاد لەمیانەی رێڕەوی ژیانیدا هەر لە دایك بونیەوە تا مردن، بە چەند قوناخێکدا تێدەپەرێ.

سەرەتا مندالە، پاشان کورپێژگەیە، پاشان هەرزەکارە، پاشان دەبێتە گەنج پاشان کامل دەبێ، پاشان پیر دەبێ.[1]

ماوەی هەرزەکاریی لە گرنگترین و مەترسی ترین ئەو ماوانەیە، کە مرۆڤ پێیدا تێپەڕ دەبێت، ئەو ماوەیە کە لە یازدە سالیەوە درێژە دەکێشێ و هەندێ جار هەتا بیست و چوار سالێ، هەر چەندە پەروەردیاران دەربارەی ئەم ماوەیە جیاڕان، دەبێ تێبینی ئەوە بکرێ، کە ماوەی هەرزەکاریی بەپێی جیاوازی ئەو کۆمەلگە و رۆشنبیریانەی هەرزەکاران تێیدا دەژین درێژە دەکێشێ و کورت دەبێتەوە.

بەلام لەزمانەوانیدا: زمانەوانان دیدیان وایە هەرزەکاریی بەر لە بالغ بون دەست پێدەکات و لە تەمەنی بالغ بون کۆتایی دێ.[2]

پەروەردیاران بە چەند پێناسەیەکی جیاجیا پێناسەی هەرزەکاریی دەکەن، بەلام لە زۆر خالدا هاوبەشن، لەو پێناسانە دوان باس دەکەین:

-هەرزەکاریی بریتی‌یە لە پلەپلەیی وردە وردە پێگەیشتنی جەستەیی و جنسی و عەقلی و هەلچون (انفعال).[3]

-هەرزەکاریی کۆمەلە گۆڕانکاریەکە بەسەر کچ و کوڕدا دێت، چ لە لایەنی جەستەیی، یان جنسی، یان عەقلی، یان سۆزداری، یان کۆمەلایەتی، کەوا

---

[1] قۆناغەکانی گەشەکردنی ژن و پیاو، قۆناغی زۆری هەن، بەلام من بەم شێوەیە کورتم کردۆتەوە، بۆ زێدە زانیاری بگەرێوە پەرتوکی (فقه اللغة و سر العربية) لاپەرە ٨٢-٨٥.

[2] القاموس المحيط ج٣/٣٤٩ و المصباح المنير ج١/٢٤٢.

[3] ماذا تعرف عن المراهقة ، لاپەرە (١١).

لەباری دایە سایکۆلۆجی منداڵ و هەرزەکاریی لەماوەی منداڵیـەوە بگوازێتـەوە بۆ قۆناغی گەنجێتی و پیاوەتی[1].

هەروەها هەرزەکاریی قۆناغێك نیە سەربەخۆ و جیا بێ لە ڕابردو و داهـاتو، بەڵکە بە پێچەوانەوە، پەیوەندی بەپێش و دوای قوناغەکانەوە هەیە.

ئەو کەسەی هەڵسن و کەوت لەگەڵ هەرزەکار دەکات، زۆر گرنگە بـاش ئـەوە بزانێ، کە ئەم قۆناغە چەند مەترسی دارە و بۆ هەرزەکار چـەند گرنگـی هەیـە، بەرامبەر بەم قۆناغە هەرزەکار چەند هەستیارە.

پێویستە بـاش بزانـێ کـە گەشـەکردن و پێگەیشتنی جەسـتەیی و عـەقڵی هەرزەکار، بەهەمان خێرایی و هەمان ئاست پێکەوە ناڕۆن، بەڵکـە پێگەیشـتنی جەستەیی پێش گەشە و پێگەیشتنی عەقڵی دەکەوێتە.

جا لەبەر ئەوە نیشانە و دیاردەی پیاوەتی بەسەر هەرزەکارەوە دەبینرێ، وەك پێگەیشتنی جنسی و بەدەرکەوتنی سمێڵ و درێژی زیاتر دەبێـت، دەنگـی گـڕ و گەورە دەبێت، وا لە دەوروبەری' دەکات هەست بکەن، کە بەڕاستی بۆتـە پیـاو و وەك پیـاو مامەڵـە و ڕەفتـاری لەگـەڵدا بکـرێ، لـــە ڕاسـتیش دا عـــەقڵ و هەڵچونەکانی لە نێوان منداڵێتی و پیاوەتی دایە.

بۆ ئـــەوەی فراوانـتر و قوڵـتر لـە ڕۆڵـی سروشـتی هـەرزەکاریی و چۆنیـەتی مامەڵـەکردنی پـەروەردیار لەگـەڵ هـەرزەکاردا تێبگـەین، بـا گـوێ بیسـتی کورتەیەکی بەسودی قسەی بەڕێز (محمد فضل الله) بین، کە دەڵێ:

(قۆناغی هـــەرزەکاریی هـەروەك هاوسـەنگی دەریـا وایـە، وەك بڵـێی ئـەو مرۆڤەی دێتە ناو قۆناغی دوەمی بزاڤی ئادەمیزادەوە، چاوەڕێی بونێکـی نـوێ دەکـات و لـە ئـەزمونی مرۆڤێکـی تـرە و (إنطلاق) دەکـات، یـان چـاوەڕێی دۆزینەوەی بنکەیەك دەکات بۆ قۆناغێکی تر، بەڵام ڕۆڵـی پـەروەردە پاراسـتنی مرۆڤە لە گوم بون و تیاچون، چونکە شێتایەتی غـەریزە مانـای بێدارکردنـەوەی

[1] خفايا المراهقة، لاپەڕە (١٥).

بزاڤی یاخی بونی ئادەمیزادە و پێزانینە بەرەو ئاسۆی نادیار، رەنگە مرۆڤ وا لیّ بکات هاوسەنگی خۆی لەدەست بدات، چونکە مرۆڤ پێشتر ئەزمونێکی نەبوە، تا بۆ هاوسەنگ بون پشتی پیّ ببەستیّ.

جا کاتیّ دیراسەی هەمو ئەمانە دەکەین، مەسەلەی هەرزەکاریی لە مرۆڤدا بە حاڵەتێکی سروشتی دادەنێین، چونکە ئەو حاڵەتەیە کە ئەم بەدیهێنراوە تێیدا ئینتیلاق دەکات، کە کرداری گەشەی جەستەیی تێدا جوڵەی کردوە، بەرێگەیەك کە هەر لەسەرەتاوە چەند فروسمان (ایحاء)ێکی تەماوی بۆ ساز کردوە، پاشان خستویەتیە ناو کەشێکی وروژاوی یاخی و هەڵگەراوە، کە لە حاڵەتی مل کەچی و گەردن کەچی بۆ یەکێکی تر دەگوازرێتەوە بۆ حاڵەتی هەست کردن بە بونی و سەربەخۆیی خۆی، بەڵام بەبیّ ئەوەی هێڵی راست و رون و هێمن هەبیّ، ئەمەی بۆ دوپات بکاتەوە)[1].

لە راستیدا پێشان هەرزەکاریی بەم شێوەیەی وەك ئەمڕۆ گیروگرفت نەبو، چونکە ئەو ماوە زەمەنیەی کە هەرزەکار بەسەری دەبرد تا ئەم قۆناغە تیّ بپەڕێنیّ و بچێتە قۆناغی پیاوەتی، ماوەیەکی کورت بو، کە بەر لە بالغ بون دەست پێدەکات و بەباڵغ بون کۆتایی دێت.

دەکریّ ئەم دیاردەیە لە ژیانی رۆژانەماندا لە گوندەکان سەرنج بدریّ، کەوا بەزۆریی ماوەی هەرزەکاری بەساغ و سەلامەتی تێپەڕ دەبیّ، هۆی ئەمەش بۆ دوشتی سەرەکی دەگەڕێتەوە:

١-لەم کۆمەڵگایانەدا گەنج و لاو بەرپرسیارێتی هەڵدەگرن و بەکردەوە دێنە ناو ژیانەوە و هەڵس و کەوت لەگەڵ پیاوان دەکەن، هەر لە زوەوە تێکەڵ بە کۆمەڵگەکەیان دەبن.

٢-هەروەها زو ژن هێنان و زو شوکردن و تێربونی پاڵنەری جنسی لەم کۆمەڵگانەدا، شوێنەواری گەورەی هەیە لە جێگیریی هەڵچونە ویژدانیەکان و

[1] دنیا الشباب ص٨٠ بەدەستکاریەوە.

پێگەیشتنی هەرزەکار[1].

لەبەر گرنگی و مەترسی ئەم ماوەیەی ژیانی منداڵان و، بونــی حەساسـیەتی لە مامەڵەکردنی دایك و باوك و سەرپەرشتیاران لەگــەڵ هــەرزەکاردا، بــەباشمان زانی کەمێك بە درێژی باسی گرنگترین تایبەتیەکانی و گرفتەکانی ئــەم قۆناخــە بکەین، تا دایك و باوك و منداڵان لیێ بەهرەمەند بن.

---

[1] سیکولوجیة الطفولة و المراهقة، ص١٥٩.

# گرفتەکانی هەرزەکاریی

لەماوەی هەزرەکاریدا، هەرزەکار و خێزان توشی چەندەها گرفتی جەستەیی و دەرونی دەبن، گرنگترینیان ئەمانەن:

## یەکەم: هەرزەکار هەست بەماندو بون دەکات:

هەرزەکار سکالای زۆر هەست کردنی بەماندبون و پێویست بونی بە پشو و حەسانەوە دەکات، زۆر دایك و باوکیش ئەم سکالایە فەرامۆش دەکەن، یان بڕوای پێ ناکەنە وای دادەنێن ئەم سکالا کردنە ڕاست نیە و هەرزەکار خۆی وادەنوێنێ، تاوەکو سۆزیان بۆی بجولێ و بایەخی پێ بدەن.

بەلام راستی‌یەکەی پێچەوانەی ئەوەیە، چونکە هەرزەکار هەر کەمێك جەستەی بخاتە کار، با کارەکە ئاسانیش بێت؛ بەخێرایی هەست بەماندوبون دەکات، ئەم ماندوبونەشی بەهۆی ئەو گۆڕانکاریە خێرایانەیە، کە بەسەر ئەرکە فسیۆلۆجیەکانی دادێت، کە ڕەنگە خەوشێك لە (غدد الصمم)[1] دروست بوبێ.

هەروەها خێرا گەشەکردنی هەرزەکار شوێنەواری خۆی هەیە لە زیادکردنی ماندوبون و شلەژانی ئەرکی کۆئەندامەکانی.

بەنمونە لەکاتی لەدایك بوندا دلی مندالی ساوا لە چرکەیەکدا بیست گرام خوێن فڕێ دەدات، لە تەمەنی چواردە سالیشدا دەگاتە سەد و چل و یەك گرام، بەواتای زیاتر لە ٢٠٪ لەو بڕەی کە لە مندالیدا دەینارد، بۆ زانین دل قەبارەکەی ٣٠٪ گەورە دەبێت؛ ئەمەش لە ئاکامی زیادبونی قەبارەی جەستە و گوشاری دل، بەهۆی زیادبونی هێزی پال پێوە نان و چەندێتی خوێن دەبێت[2].

هەروەها زۆر کچ لەکاتی خوێنی بێ نوێژیدا دوچاری ئازار و سەر ئێشە و

---

[1] سیکولوجیة الطفولة و المراهقة ص١٦٦-٢٤٦.

[2] خفایا المراهقة ص٢٨.

گرژی ئەعساب و ئازاری مەمك دەبن، جا بەهۆی ئەوەوە لەشیان خاو دەبێتەوە و زیاتر توشی ماندوبون و بێزاریی دەبن[1].

لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر دایك و باوك و پەروەردیاران وریا و ئاگاداری ئەم لایەنە بن، هەرزەکاران لەسەروی وزەی خۆیان ئەرکبار نەکەن، چونکە ئەرکبارکردنیان، چەند گرفتێکی جەستەیی و دەرونی لێ دەکەوێتەوە.

## دوەم:هەستیاریی و خەمۆکی:

بەگشتی هەرزەکاران زۆر هەستیار دەبن و سۆز (عاطفة) بەسەر بیرکردنەوەیاندا زاڵ دەبێت، کە توشی زۆر گرفتی دەرونیان دەکات و بەزۆری دەبێتە مایەی خەمۆکی (اکتئاب).

عاتیفەی هەرزەکار جێگیر و هاوسەنگ نیە، دەکرێ بەبازدانێکی هەڵچون و زۆر گۆڕانکاری وەسف بکرێت[2].

هۆی هەستیار (حساسیة)ی هەرزەکار دەگەڕێتەوە بۆ هەست کردنی بە دورەپەرێزی (عزلة) و قبوڵ نەکردن و ڕا وەرنەگرتنیەتی لە لایەن خێزان و کۆمەڵگەوە وەك پیاوێکی پێگەیشتو و کامڵ، بەڵکە مامەڵەیەکی وای لەگەڵدا دەکەن، کە هێشتا هەر منداڵە.

هەروەها هۆیە زۆر هەستیارەکانی خودی هەرزەکار کە پێوەی دەناڵێنێ، بەهۆی زۆر بیرکردنەوەیەتی لە خودی خۆی، هەروا خەڵکانی تر چۆن تەماشای دەکەن، هەروەها زۆر گرنگی دان بەخۆی، لەبەر ئەوە هەر ڕەفتارێکی خراپی کە لەگەڵ بکرێ، یان توانای بەکەم دابنرێ، ئەوا سوکایەتی کردن بە کەرامەتی و تانە و تەشەری دادەنێ.

هەروەها لە هۆیەکانی هەستاریی و خەمۆکی و خۆ وێك هێنانەوەی، بریتییە

[1] خفايا المراهقة ص٢٦.
[2] خفايا المراهقة ص٥٠.

لەوەی کە هەست بە ناشیرینی ڕوخساری دەکات، بەتایبەتی گەر زیبکە (حب الشباب)ی لە دەم و چاو هاتبێ، هەروەها لە هۆیەکان ئەوەیە کە وا هەست دەکات ئەندامەکانی جەستەی ڕێك و پێك نیە، دیارە ئەوەش شتێکی سروشتیە، چونکە هێشتا هەر لە قۆناغی گەشەکردن دایە. هەمو ئەو شتانە و شتی تریش کە باس کران، وا لە هەرزەکار دەکات لەناخەوە هەست بکات لە کۆمەڵگەدا جێی نابێتەوە، بۆیە خۆی وێك دێنێتەوە و هەوڵ دەدات لە کۆمەڵگە دورە پەرێز بێت، کەواتە ئەرکی دایك و باوك و پەروەردیاران گرنگە، کە ئاگادار و هۆشیار بن لەم مەسەلەیە و هەوڵ بدەن هەر شتێ دەبێتە مایەی وروژاندنی هەستیاری هەرزەکار، هەروا دەبێتە مایەی ئاکامێکی خراپی دەرونی، دوری بخەنەوە.

### سێیەم: خۆویستی و خۆ بەدەرخستن:

هەرزەکار زۆر بەخۆی دەنازێ و تەماشای خێزان و کۆمەڵگە و تەنانەت جیهان و دەوروبەری دەکات وەك بلێی تەنها لە تەوەرەی ئەو دەخولێنەوە، هەمو هەرزەکارێکیش وادەزانێ توانست و وزەی فیکری و دەرونی وا زۆری هەیە، کە ئەوانەی لە دەوروبەریدان نەیاندۆزیتەوە و نایانەوێ ئەندازەی بکەن، لەبەر ئەوە لەهەمو بۆنەیەکدا دەیەوێ خۆی بسەلمێنێ و وزەی خۆی بەدەربخات.

ئەو دیاردانەی کە لە ڕەفتاریدا بەدەر دەکەوێ:

۱-یاخی بون و رەخنەگرتن:

هەرزەکار بۆ ئەوەی جەخت لە کەسایەتی خۆی بکات و خۆی بەشێوەیەکی سەربەخۆ دەربخات، حەز دەکات رەخنەی زۆر بگرێ لە هەڵس و کەوت و ڕەفتاری ئەو کەسانەی لەو گەورەترن و لە دەوروبەریدان، جا ڕەخنە دەگرێ لە بیروبۆچون و هەڵس و کەوت و قسەکانیان و جل و بەرگیان و شێوازی ژیانیان و

بەرنامەی ڕۆژانـەیان، هـەروەها ڕەخنـە-دەگـرێ لـە مامۆسـتایان و میوانـان و بێژەران، جا ئەم ڕەخنانە بەقەناعەتەوە بێ، یان نـا ئـەو ڕەخنـە دەگـرێ، هـەوڵ دەدات هـەردەم بچێتـە نـاو گفتوگـۆ و موناقەشـەی توندەوە تـا بـەرگری لـە بیروبۆچونەکانی بکات، هـەردەم بەڕواڵـەتی یـاخی و نـاڕازی بـەم ڕەوشـە[1] خۆی پیشان دەدات، کە بەڕای ئەو ئەم ڕەوشە هەڵەیە.

بێگومان توندیی ئەم دیاردەیە لەگەڵ کات و ڕۆژگاردا کەم دەبێتەوە، کـە تـا پاش ماوەیەك دەگاتە حاڵەتی مام ناوەندی، کەواتـە پێویسـتە لەسـەر دایـك و باوکان لەگەڵ هەرزەکاران تێك نـەگیرێن، بەڵکـە پێویسـتە دەروازەی گفتوگـۆی لەگەڵدا بکەنەوە، بەگیانێکی لێبوردەیی موناقەشەکانی وەربگـیرێن، پێویسـتە ئاگاداری ئەوەش بن، کە بەرگری کردنی گیانی یاخی بـون و سـەرپێچی کردنـی هەرزەکار زیاتر دەبێت لەو کاتەی، کە زۆر هەست بە زاڵ بون دەکات[2].

## ٢-گومان:

دیاردەی گومان لـەلای هـەرزەکار دیاردەیـەکی سروشـتیە، ئـەم گومانـەش لەئاکامی کرانەوەی عەقڵ و گەشەکردنی هەستەکانیەتی، هەروا بۆ زێدە دوپـات کردنەوەی خودی خۆی و سەربەخۆیـی خۆیەتی، لەبەر ئەوە هەرزەکار گومان بە هەمو کەسێك دەبات کە لەگەڵیدا دەژیێ و دەیەوێ لێێ دڵنیا بێت، تەنانـەت گومانی لە خۆشویستنی دایـك و باوکیشـی هەیـە، گومـانی لـە خۆشویسـتنی هاوڕێکانی هەیە، گومانی لە ڕاستی و دروسـتی زۆر لـە بیروبـاوەڕە ئاینیـەکان هەیە وەك: هەبون و توانایی خوا، بەهەشت و دۆزەخ، فریشتە و شتی تر.

زۆر جار هەرزەکار کە باسی ئەم جۆرە شتانە لەبەردەم دایك و باوکی دەکات، ڕوبەڕوی وەڵام دانەوەیەکی زۆر توند دەبێتەوە، ڕەنگە لێشی بدرێ. لـە ڕاسـتیدا پێویستە دایك و باوك بزانن، کـە ئـەم گومانـە مـەرج نیـە بەقەناعـەتی دڵـی

---

[1] ڕەوش: بارودۆخ.

[2] خفايا المراهقة ص٥٧–٦٧. ماذا تعرف عن المراهقة، ص١٦–٨٥.

هەرزەکار بێت، بەڵکە زۆر جار بۆ سەرنج ڕاکێشان و خۆ سەلماندن بێت[1].

**٣-جگەرە کێشان:**

دیاردەی جگەرە کێشان لە لای هەرزەکاران دیاردەیەکی زۆر بەربڵاوە، ڕەنگە کەم هەرزەکار هەبێ جگەرەی نەکێشابێ و بۆ ماوەیەکی کەم لەسەری ڕانەهاتبێ، پەروەردیاران ئەم دیاردەیە لەلای هەرزەکاران بەجۆرێك لەخۆ سەلماندن و هەست کردن بەپیاوەتی دادەنێن، کەوا هەرزەکار وادەزانێ مافی سروشتی خۆیەتی، ئەو شتانە مومارەسە بکات، کە پیاوانی تر ئەنجامی دەدەن، هەر لەبەر ئەوەشە هەرزەکار جگەرە دەکێشی، هەر چەندە قوتیشی نەداتەوە و چێژی لێ وەرنەگرێ.

ئەوەی زۆر گرنگە ئەوەیە دایك و باوك خۆیان لەم دیاردەیە بێ ئاگا بکەن و نەهێڵن کوڕەکە هەست بەوە بکات، کە ئەوان بە جگەرەکێشانی ئەو ئاگادارن، نابێ هەرگیز پێی بگوترێ، چونکە ئەم جۆرە ڕەفتارە دەبێتە مایەی بەردەوام بونی ڕەفتارە خراپەکەی و گوێ نەدان بە زانینەکەی ئەوان.

بەڵکە پێویستە دایك و باوك ناڕاستەوخۆ، ئاڕاستەی بکەن و زیانەکانی جگەرەی بۆ بەدیار بخەن و پێی بڵێن جگەرەکێشان لایەقی ئەو کەسانە نیە کە خاوەن ڕەوشتن.

**٤-زۆر گرنگیدان بەڕواڵەتی خۆی:**

هەرزەکار زۆر سورە لەسەر ئەوەی کە لەش و لاری خۆی بەجوانترین شێوە بەدیار بخات، بۆ ئەوەی بونی خۆی بسەلمێنێ و سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕاکێشێ، بەتایبەتی جنسی مێینە.

بایەخ دانی هەرزەکار بەلەش و لاری خۆی، لەسێ خاڵی بنەڕەتی چڕ دەبێتەوە:

---

[1] ماذا تعرف عن المراهقة، ص٦٠.

• -گرنگیدانی به جل و بەرگ: ئەمەش لە لایەنی هەڵبژاردنی ڕەنگ و ئەو ڕەنگانەی سەرنج ڕاکێشن، جا بۆ ئەمە زۆرینەی پارەی بۆ خەرج دەکات[1].

• -گرنگیدانی بەقژ: هەرزەکار زۆر گرنگی دەدات بەڕێکخستن و بڕینی قژی بەپێی مۆدیلی نوێ و گۆڕینی بە چەندەها جۆری بڕین، قژیش بە ناونیشانی جوانی دەدانێ، هەمو ئەم گرنگیدانەش بۆ سەرنج ڕاکێشانی خەلکە بۆ لای خۆی[2].

• -خۆ بۆن خۆش کردن: بێگومان بۆن خۆشی شوێنەوارێکی گەورەی هەیە لە سەرنج ڕاکێشانی خەلکانی تر، هەر لەبەر ئەوەشە هەرزەکار زۆر سور دەبێ؛ کە هەردەم بۆنی خۆشی لێبێ.

**٥-نوسینەوەی یاداشتەکان:**

نوسینەوەی بیرەوەری و یاداشتەکان لە نێوەندی هەرزەکاراندا دیاردەیەکی بەربلاوە، دیاردەکە چەند مانایەکی زۆر لەخۆی دەگرێ، لەوانە هەرزەکار هەست بە گرنگیی خۆی و گرنگیی ئەو ڕوداوانەی لەگەڵیدا دەبن دەکات و، هەوڵ دەدات خۆی وەك کەسێکی گرنگ پیشان بدات.

زۆر جار بیرەوەریەکان لەبریتی هاوڕێن، کەوا بابای هەرزەکار خەمباری خۆی و دان پیانانی خۆی بۆ دەردەخات بۆ کەم کردنەوەی هەست کردن بەگوناهەکانی، هەروا هیوا و ئاوات و پرۆژەکانی بۆ باس دەکات، کەواتە بیرەوەریەکان هۆیەکە بۆ پشودان و خۆ سەلماندن.

لەبەر ئەوە هەرزەکار بیرەوەریەکانی خۆی زۆر لەلا ئازیز و خۆشەویستە و لەشوێنی وا دەیشارێتەوە، کە دەستی کەسی نەگاتێ و لەبەر چاو نەبێت، لەهەمان کاتیشدا لەهەندێ ناوەڕۆکی ئەم بیرەوەریەدا زۆر شەرم دەکات کە بیخاتە ڕو.

---

[1] تربیة الاولاد و الاباء، ص٢١٢.

[2] تربیة الاولاد و الاباء، ص٢١٢.

هەست کردن بەگوناهیش لەوەوە ڕەگ دادەکوتێ، لەبەر ئەوە هەندێ جار هێما بۆ ئەو شتانە دادەنێ کە لەوەوە دەترسێ ئاشکرا بێت، ئەم نهێنی‌یەش دیاردەیەکە لە بیرەوەریەکانی هەرزەکاران بەر بڵاوە.

بابای هەرزەکار ڕێگە بەهیچ کەس، یان هیچ هاوڕێیەکی ئازیز نادات کە متمانەی تەواوی پێ دەکات، بیرەوەریەکانی ببینێ مەگەر دوای تێپەڕبونی قۆناغی هەرزەکاری.

یەکێك لە هەرزەکاران لەسەر بیرەوەریەکانی نوسیبو (دوای مردنم دەسوتێنرێ و خۆڵە مێشەکەی بەسەر گۆڕەکەم دا بڵاو بکرێتەوە). ئەم کارەشی بۆ دوپات کردنەوەی بەنرخی و نهێنی ئەوە[1].

پێویستە دایك و باوك بەڕێزەوە مامەڵە لەگەڵ بیرەوەریەکانی منداڵە هەرزەکارەکانیان بکەن، لەبەردەم منداڵەکانیان گاڵتە و قەشمەری بەم دیاردەیە نەکەن.

زۆر گرنگە دایك و باوك مۆڵەت لە منداڵەکانیان وەربگرن بۆ خوێندنەوەی ئەم بیرەوەریانە، چونکە سودی زۆری تێدایە بۆ ئاشنابون بەسروشتی بیرکردنەوە و گرنگی پێدانی منداڵەکانیان، گەر منداڵان ڕێگەیان بەدایك و باوك نەدا بیرەوەریەکانیان ببینن، پێویستە دایك و باوك ئامادە نەبونی منداڵان لە ماڵەوە بقۆزنەوە، بۆ نمونە کە دەچنە قوتابخانە، بێ ئەوەی منداڵان ئاگاداربن بیرەوەریەکانیان بخوێننەوە، لەو کاتەدا زۆر پێویستە نەهێڵێ منداڵەکانیان بزانن، کە بیرەوەریەکانیان خوێندۆتەوە.

### ٦-زۆر وێنەگرتن و پیشاندانی وێنەی خۆی:

لەو ڕەفتارە سەرنج ڕاکێشانەی هەرزەکار خۆی پێ بەدیار دەخات و خۆی پێ‌ی دەسەلمێنێ، وێنەگرتنیەتی لەگشت بۆنەیەکدا، هەروەها گەورەکردنی وێنەی

[1] خفايا المراهقة ص٥٥-٥٦. ماذا تعرف عن المراهقة، ص٧٨.

خـۆی و هەڵواسـینی بەشـوێنی دیـاریماڵەکـەی، وەك ژوری صـــالۆن و ژوری تایبەت.

زۆر گرنگە دایك و باوك وریابن ئەم جۆرە ڕەفتارەی هەرزەکار بە سوك و کـەم نەزانن و ڕوبەڕویان نەبنەوە، بەڵکە لەسەریان پێویستە گوێ بەم ڕەفتارانە نـەدەن و بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ڕێنمایی و ئاڕاستەی هەرزەکار بکرێـت بـەوەی، کـە ڕێگای ڕاست بۆ خۆ بەدەرخستن و خۆ سـەلماندن بریتی‌یـە لـەوەی مـرۆڤ خـۆی بەڕەوشتی جوان بڕازێنێتەوە و لەبواری زانست و فێربوندا بەدەربکەوێ، یـان لـە هەر بوارێکی بەسود بۆ کۆمەڵگە، نەك بەم جۆرە ڕەفتارە شکلیاتانە.

## چوارەم: دودڵی و گۆڕان و شڵەژاوی:

گرنگترین گرفتی فیکری و دەرونی کە هەرزەکار پێوەی دەناڵێنێ؛ زۆر دودڵی و گۆڕانە.

یەکێك لە هەرزەکاران دەڵێ: (هەندێ جار هەرزەکار لـە ژیـان وەرس و بـێزار دەبێ و ڕقی لێ دەبێتەوە و ئاواتە خوازی مردن دەبێ، یان زۆر بـەتوندی ڕەخنـە لە خۆی دەگرێ، کاتی واش هەیە دەبینی حەز بە ژیان دەکات و بـەختیارە و زۆر بەخۆی سەرسام دەبێ)[1].

هەرزەکار هەر جـارەی بـەجۆرێك دەڕوانێتـە کۆمەڵگـە و ئـایینده، دەبینـی جارێك بەرەورووی دەچێ و گەش بینە، جارێکی تر نائومێد و داڕوخاوە، هۆی ئەم ڕوانینەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، هـەرزەکار وادەبینـی خـۆی مرۆڤێکـی جیاکـار (متمیز)ە و خـاوەنی وزە و توانسـتی بـێ وێنەیـە، دەوروبەرەکـەی دەبینـن لـە کۆمەڵگەیەکدایە، کە هیچ بوارێکی بۆ ئەو تێدا نیە و ئاییندەی لەبەردەم دا بـە داخراوی دەبینێ و هیچ بوارێك لە ئاسۆی ژیانیدا نابینێ، لەبەر ئەوە هـەرزەکار بیر دەکاتەوە، دەبـێ دوای تـەواوکردنی قۆنـاغی دوا نـاوەندی چـی بکـات؟ لـە

---
[1] خفايا المراهقة ص٥٢.

زانکۆدا چ کۆلیژێك هەڵدەبژێرێ؟ ئەدی دوای دەرچونی لە زانکۆ چی دەکات؟

ئایا باشتر وایە واز لە خوێندن بێنێ و هەر لەئێستاوە دەست بەکارکردن بکات؟ یان ئەدی چی بکات؟

ئا بەم شێوەیە ئەم هەمو هەڵبژاردنانەی بەردەمی و بەزەحمەت پەسەندکردنی یەکێکیان، هەرزەکار دودڵ دەکات لەنێوان ئەم هەڵبژاردنانەدا، هەر جارەش ئارەزوی یەکێکیان دەکات، زۆر جاریش هەمو ڕێگاکانی لەبەردەم دادەخرێت.

لەبەر ئەوە پێویستە دایك و باوك هەوڵی یارمەتیدانی منداڵ بدەن بۆ هەڵبژاردنی شت و خۆڕاگری و هەوڵ بدەن فێری شێوازی بیرکردنەوەی ڕاست و دروستی بکەن و، متمانە بون بەخوا و بەخودی خۆی و، گەڕاندنەوەی کاروبارەکان بۆ لای خوای گەورە لەدڵیدا بڕوێنن.

گرنگترین هۆیەکانی شلەژان و شپرزەیی، کە هەرزەکار تێیدا دەژی ئەمانەی خوارەوەن:

١-گۆڕانکاری خێرا لە هەندێ ئەرکە فسیۆلۆجیەکانی هەرزەکار، کە ئەوەش خەوشێك[1] لە (غدد الصم) دروست دەکات.

٢-جەستە بەشێوەیەك زیاد و گەشە دەکات و بەخێراییەك، کە پێش گەشەی ژیری دەکەوتەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی هاودژی (تناقض) لە ڕەفتاری هەرزەکار و هەڵس و کەوتی کەسانی تر لەگەڵیدا.

٣-ئەو وەهم و خەیاڵەی کە هەرزەکار تێیدا دەژیێ، ئەویش لە ئاکامی زیادە میسالیەت و، دوچار بون بەچەند جارەی صەدەماتە، کە ئەویش لە ئاکامی نەگونجانی میسالیەتە لەگەڵ واقیع دا.

٤-نەشارەزایی لە ڕوبەڕوبونەوەی ژیاندا.

٥-ئەو توندی خەفە (کبت)ەی هەرزەکار لە هەندێ خێزاندا پێوەی دەناڵێنێ.

---

[1] خەوش: عەیب، خلل.

## پێنجەم: زیندە خەوی

لە قۆناغی هەرزەکاریدا خەیاڵی هەرزەکار زۆر گەشــە دەکـات، شـوێنەواری زۆری و بەپیتیەکـەش لـە نیگـار کێشـان و پەخشـان و هۆنراوەکـانی ڕەنـگ دەداتەوە، هەروەها هەرزەکار ڕو لە جوان کردن و رازاندنەوەی خەیاڵ دەکات.[1]

لـە گرنگـترین دیاردەکـانی گەشـەکردن و پێگەیشـتنی خـەیاڵی هـەرزەکار بریتی‌یە لـە: دیـاردەی زینـدە خـەوی، کـەوا هـەرزەکار خـەیاڵی دەڕوا و دور دەکەوێتەوە لە جیهانی ڕاستەقینە و ئەو واقیعەی دەورەی دەدات، پـەنا دەباتـە بەر خەیاڵ بۆ بەجێ هێنانی ئـەو هیـوا و ئاواتانـەی، کـە وانـابینێ لـە ژیـانی ئاساییدا جێبەجێ ببێت[2].

زیندە خەویش هۆیەکەی یان هەوڵدانە بۆ هەڵاتن لەو واقیعەی، کە هەرزەکار توشی هاتوە و کۆشش دەکات لیێ دەربـاز بێـت، یـان بـەهۆی هەسـت کردنـی هەرزەکارە بەگریێ هەست بە (نقــص) کـردن لـە بـارەی شـتێکی دیـاریکراو و لەتوانستەکانی، جا دەیەوێ لەڕیێ زیندە خەویدا خەیاڵ بکات، کـە هەسـت بـە (نقص) کردنەکە قەرەبو بکاتەوە.

نمونەی هەست بە (نقص)کردن ئەوەیە هـەرزەکاری هـەژار و نـەدار وا خـەیاڵ بکات، کە دەوڵەمـەندە و هەمو هۆیەکانی خۆشی و ڕەفاهیەتی هەیە، بەهۆیـەوە خەڵك ڕیــزی دەگـرن و بـەهۆی سـامانەکەیەوە مامەڵـەی ڕێزدارانـەی لەگـەڵدا دەکەن.

یان ئەو هەرزەکارەی لە خوێندن سەرکەوتو نەبوە خەیاڵ بکات، کە زیرەکـە و سـەرکەوتوە و مامۆسـتا و کـەس و کـاری، زۆر ستایشـی دەکـەن و پیـایدا هەڵدەدەن.

دەکرێ هەندێ جار بابای هەرزەکار هاوڕێکانی بەشداری زیندە خەون بکـات،

---

[1] ماذا تعرف عن المراهقة ص٦٢-٦٣.
[2] ماذا تعرف عن المراهقة ص٦٣.

گەر زیندە خەونەکە لەیەك بیرۆچکەی هاو وێنەوە دەربچێت لە زیهنی هەرزەکاراندا، بەنمونە کۆمەڵە هەرزەکارێك هەردەم خەون بەوەوە دەبینن کە لەو واقعەوە هەڵبێن کە پێی ڕازی نین، جا ئەوانە هەوڵ دەدەن بەشێوەیەکی هاوبەش لەم خەونەدا بژیێن.

پێویستە وریایی بدرێ کە زۆر خەفەکردن و سەربەستی نەدان بە هەرزەکار لە لایەن خێزانەوە، گرنگترین هۆکارەکانی زیندە خەوە[1].

هەروەها زۆر خەفەکردن لە لایەن خێزانەوە؛ دەبێتە مایەی نانەوەی ئاکامی ترسناکی تر، کە گرنگترینیان:

١-خەمۆکی (الکآبة): خەمۆکی کە توشی هەرزەکار دەبێت بەهۆی ڕازی نەبونی بەو واقیعەی، کەوا هەست دەکات گەورەکان دایان ناوە بۆ ئەوەی ئارەزو و بەرژەوەندیەکانیان جێبەجێ ببن، بەبێ ڕەچاوکردنی ئارەزو و بەرژەوەندی کەسانی تر.

٢-یاخی بون و هەڵوێستی توند وەرگرتن دژی دەسەڵاتی باوکایەتی و دەسەڵاتی قوتابخانە و یاسا.[2]

لێرەدا گرنگ ئەوەیە زیندە خەوی هەرزەکار بەوە تەماشا نەکەین، کە دیاردەیەکی نەخۆشی و نائاسایی‌یە، ئەم دیاردەیەش بەزۆریی یان بەکۆتایی هاتنی ماوەی هەرزەکاری نامێنێ، یان بەنەمانی هۆی پەیدابونیەوە نامێنێ، بەڵام گەر دوای ماوەی هەرزەکار ئەم دیاردەیە بەردەوام بو، ئەوا دیاردەیەکی نەخۆشیە.

---

[1] سیکولوجیة الطفولة و المراهقة ص١٦٦.

[2] سیکولوجیة الطفولة و المراهقة ص١٦٦.

## شەشەم: هەرزەکار و ئایین:

· هەڵوێستی هەرزەکار بەرامبەر بە ئایین بەجیاوازی ئەو ژینگەیە جیاوازی دەبێت، کە تێیدا پێگەیشتوە و بەجیاوازی پەیوەندیان لەگەڵ ئایین و لەو ماوەیەی کە پێش هەرزەکاری کەوتوە.

گەر هەرزەکار لە کەش و ڕەوشێکی هۆشیار و پابەند بە ئایینەوە پێگەیشتبێ؛ ئەوا هەڵس و کەوتی لەگەڵ ئایین لەماوەی هەرزەکاریدا زۆر جیاوازی نابێت، لە بوارەکانی ژیانیشیدا بەئایین و پرەنسیب (مبادیء)ەکانیەوە پابەند دەبێت. ڕەنگە لە ماوەی هەرزەکاریشدا گەرم و گوڕی و دینداری زیاتر بێت. هەڵبەت دینداری هەرزەکار شوێنەوارێکی گەورەی هەیە لە سوك کردنی گرفتەکانی هەرزەکاریی و کورت کردنەوەی ماوەی هەرزەکاری.

بەڵام ئەو هەرزەکارەی بەر لە ماوەی هەرزەکاریدا، کەش و ڕەوشێکی هۆشیاری ئایینی بۆ نەڕەخساوە، دەبینین ئەو هەرزەکارە گومانی دەرهەق بە ئایین بۆ دروست دەبێ و سوکایەتی بە ڕێبیر و بەهاکانی ئایین دەکات، هەروەها ئەم پرسیارانەی خوارەوەی زۆر لە لا دروست دەبێ:

-گەر خوا هەمو شتێك دەزانێ و هەمو شتێکی بەئەندازەگیری داناوە، کەواتە بۆچی کار و کۆشش بکەین؟

-گەر لەو کاتەی خوا مرۆڤی بەدیهێنا راوێژی پێ نەکرد، ئەدی بۆچی لێیان دەپرسێتەوە و تاقی‌یان دەکاتەوە؟

-ئەمە و جگە لە پرسیاری تر، کە گومان لای هەرزەکار دەرهەق بە ئایین دروست دەکات.

هەندێ جاریش هەرزەکار رۆڵی بێ بڕوایەك، یان سروشت پەرستێك دەبینێ، کە هیچ بڕوای بە ڕێبیرەکانی ئایینەوە نیە، بەڵکە کرد و کۆشش دەکا بۆ بەربەرەکانێکردنی ئایین، زۆر جاریش ئەم ڕەفتارەی هەرزەکار لە قەناعەتی

خۆیەوە سەرچاوەی نەگرتوە، بەڵکو تەنها حەز دەکات ئەزمون و بەربەرەکانێ و یاخیبونی خۆی بۆ شتێکی هۆگر (مألوف) دەربڕێ، هەروەها بۆ خۆ سەپاندن و جیاکاریی لە خەڵکانی تره.

ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە، کە زۆر جار هەرزەکار بایەخ بە مەسەلە ئایینیەکان دەدات، هەوڵیش دەدات بەشداری هەمو ئەو گفتوگۆیانە بکات، کە پەیوەندی بەکاروبارەکانی ئاینەوە هەیە.

بەهەر حاڵ لە لای هەرزەکار زۆر جار گومان بەرامبەر بە ئایین بەکۆتا هاتنی ماوەی هەرزەکاری بەرەو گەرم و گوڕییەکی زۆر وەردەچەرخێ.

## حەوتەم: هاوڕێیەتی کردن و هاوڕێیان:

هاوڕێیەتی کردن و هاوڕێیان بەگرنگترین گرفتی هەرزەکار دادەنرێت، کە لە ژیانیدا روبەڕوی دەبێتەوە، هەرزەکار لە ژیانیدا هاوڕێ بەشتێکی زۆر گرنگ دادەنێت و ڕۆڵی گەورەی هەیە لە کات بەسەربردن و چارەسەرکردنی گرفتەکانیدا.

هەرزەکار دەیەوێ بۆ خۆی هاوڕێ هەڵبژێرێ، هەر هاوڕێیەکیش دایك و باوکی بۆی هەڵبژێرن ئەو ڕەتی دەکاتەوە و پێی ڕازی نابێ، بەپێچەوانەی منداڵان، کە هەرگیز ڕێ لە دایك و باوك ناگرن هەندێ هاوڕێیان بۆ هەڵبژێرن، یان ئاماژەی بۆ بکەن کە پەیوەندی خۆی لەگەڵیان بپچڕێنێ[1].

ئا بەم شێوەیە بابەتی دەست خستنە ناوەوەی دایك و باوك بۆ کاروباری هاوڕێیان و پەیوەندی هەرزەکاران لەگەڵیاندا، لەلای هەرزەکار بابەتێکی زۆر هەستیارە.

بەشێوەیەکی گشتی هەرزەکاران بەچاوێکی پیرۆزەوە دەڕواننە هاوڕێیەتی، هاوڕێکانیشیان لە پێش خوشك و برا و کەس و کاریان زیاتر دادەنێن، بەهەمو

[1] ماذا تعرف عن المراهقة ص٩٧.

وەسیلەیەك هەوڵ دەدەن پەیوەندی هاوڕێیەتی بەتین و بەهێز بکەن، بابای هەرزەکار ٩٠٪ی کاتی خۆی لەگەڵ هاوڕێکانی بەسەر دەبات و زۆربەی بیرۆچکەکانی ئەوان وەردەگرێ، لەبەر ئەوە هاوڕێ کاریگەری گەورە و مەترسی داری لەسەر هەرزەکار هەیە.

هەر لە زووەوە پێویستە دایك و باوك بەر لە هاتنی ماوەی هەرزەکاریی، دەست پێشخەری بکەن لە هاوکاری کردنی منداڵ بۆ هەڵبژاردنی هاوڕێی باش، هەتا دەگاتە قۆناغی هەرزەکاریی بەبەردەوامی هاوڕێی بن، چونکە ئەم کارە دەبێتە پاراستنی هەرزەکار لە هەڵە و ناتەواوی لە ماوەی هەرزەکاریدا.

-هاوڕێی جیاکار (الممیز): دیاردەی هاوڕێی جیاکار لەلای زۆرینەی هەرزەکاران دیاردەیەکی بەرچاوە، کەوا زۆربەی هەرزەکاران حەز بە ئاشنایی زۆری هاوڕێی و تێکەڵ بونی کەسانی تر دەکەن، هەمو ئەمانەش بەمەبەستی ئاشنابون بە هاوڕێی جیاکارە، تا لەگەڵی بگونجێ و یەك بیروبۆچون، یان یەك ئامانج و ئارەزویان هەبێ.

-هاوڕێیەتی کردن لەگەڵ کچان: زۆربەی هەرزەکاران بە چەند پاڵنەرێکی جیاجیا حەز بە هاوڕێیەتی کچان دەکەن، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

١-ئاشنابون بەجیهانێکی نوێ و نادیار.

٢-بەربەرەکانێکردنی شتە یاساغەکان و هەست کردن بە یاخی بون.

٣-هەوڵدان بۆ ئەوەی بزانێ تا چەندێ، کچ ئەویان دەوێ و تا چەندێ ئەو سەرنج راکێشەرە.

٤-تەنها بۆ لاسایی کردنەوە و، لاسایی ڕەفتاری هەندێ هاوڕێی بکاتەوە.

لە ڕاستیدا هاوڕێیەتی کردنی کچ و کوڕ بۆ یەکتری لە ڕوانگەی ئیسلام و ڕەوشتەوە یاساغە و ڕەتکراوەیە، چونکە پەیوەندیەکی ناسروشتی و ئاکام باش نیە، بڕواش ناکرێ پەیوەندی دڵپاکانە لە نێوان کچ و کوڕدا هەبێت، بەتایبەتی لەم قۆناغەی تەمەنەدا، کە سۆز و غەریزەکان لەلای کچ و کوڕدا بەشێوەیەك

کڵپە دەدات و هەڵدەچێ، کە زەحمەتە هیچ کامێکیان بەسەریدا زاڵ بن و کۆنترۆڵی بکەن.

بەهەر حاڵ هەر کاتێ دایك و باوك هەستیان کرد بە هەبونی پەیوەندی لە نێوان کورەکەیان و کچێك؛ پێویستە لەسەریان یەکسەر روبەروی نەبنەوە، بەڵکە پێویستە گفتوگۆی لەگەڵدا بکەن و ئاگاداری بکەنەوە لە خراپەکاری ئەم پەیوەندیەدا و، ئاگاداری بکەنەوە کە پەیوەندی بەستن لەگەڵ کچ بە شەرعی خوا و عورفەوە، یاساغە و دەست درێژی کردنە بۆ سەر ئابروی خەڵك.

ئاگاداری بکەنەوە کەوا چۆن ئەو رازی نابێ خوشکی پەیوەندی ببەستێ لەگەڵ کورێکدا، کەواتە ئەویش نابێ رازی بێ پەیوەندی لەگەڵ کچێك ببەستێ، کە خوشکی یەکێکە.

بەشێوەیەکی گشتی لەسەر خێزان پێویستە هەرزەکار ئاگادار بکەنەوە لە زەرورەتی هەبونی هاوسەنگی و مام ناوەندی لە بەستنی پەیوەندی لەگەڵ هاورێکانی، هەروا مانای هاورێیەتی و شوێنەواری ترسناکی لە ژیانی مرۆڤ رون بکەنەوە، ئاگاداری بکەنەوە کەپێویستە لەسەری زۆر ئاگاداربێ لە هاورێی خراپ، هاورێی خراپ و چاکیش لەیەکتری جیا بکاتەوە!

گەر دایك و باوك توانیان قەناعەت بە هەرزەکار بێنن ببنە هاورێی و، بەوپەری رێز و تەقدیرەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەن و بیروڕای خۆیانی بەسەر دا فەرز نەکەن و کۆنترۆڵی نەکەن، ئەوا ئەم رەفتارە هەرزەکار لە زۆر مەترسی دەپارێزێ و زێدەرۆیی کردن لە پەیوەندی هەرزەکار بەهاورێکانی کەم دەکاتەوە.

### هەشتەم: خۆشەویستی

شڵەژان و نەبونی ئەو جێگیری سۆزداری و دەرونی‌یەی، کە هەرزەکار تێیدا دەژیێ، وا لە هەرزەکار دەکات کە هێزی سۆزداری لەلای زۆر توند بێت، هەروەها دەیەوێ لەمیانەی خۆشەویستیەوە جێگیری سۆزداری بەدەست بێنێ.

هەر بەخێرایی دەڵێین: خۆشەویستی ڕاستەقینە جوڵەیەکی لەویست بەدەر (لا إرادي)یە و لە مرۆڤ دا ئارەزوویەکی فیطریە، ئیسلام خۆشەویستی یاساغ نەکردوە، بەڵام ئەو خۆشەویستیە یاساغ دەکات، کە تەنهایی و بەیەك گەیشتنی ناشەرعی تێدا بێت.

گرفتی هەرزەکار ئەوەیە، کەوا دەزانێ هەر ئیعجابێك، یان تەماشاکردنێکی کچ بۆ کوڕ بریتی‌یە لە پەیوەندی خۆشەویستی. بەهۆی بەهێزی خەیاڵ کردن و زۆر پی سۆز و عاتیفە لای هەرزەکار، خەون و ئاواتی زۆر بنیات دەنێ، کە ڕەنگە ئەم خەیاڵ و هیوا و ئاواتەی هەرزەکار لەکاتی شکستی ئەم پەیوەندەیەدا، یان لەو کاتەی لایەنی بەرامبەر ئەم ئیعجاب و ئارەزووەی لەگەڵدا ناگۆڕێتەوە؛ ببێتە صەدمەیەکی دەرونی گەورە.

بەهەر حاڵ لێرەدا ڕۆڵی دایك و باوك و خێزان لەوە بەدەر دەکەوێ، کە هەوڵ بدەن هەر لە بنەڕەتدا نەهێڵن ئەم پەیوەندیە دروست ببێت، ئەوەش لەڕێی ئەوەوە دێتە دی، کە هانی کوڕ بدرێت نەڕوانێتە شتی حەرام و لەگەڵ کچ بەتەنها لە ژورێك کۆ نەبنەوە و تێکەڵ نەبن، هەروا حەقیقەتی خۆشەویستی بۆ ڕون بکرێتەوە، کەوا خۆشەویستی ڕاستەقینە بریتی‌یە لەوەی، کە بەهاوسەرگرتن کۆتایی بێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەمە دەفەرموێ: ((لَمْ نَرَ لِلْمُتَحَابَّيْنِ مِثْلَ النِّكَاحِ: وانابینین بۆ خۆشەویستان هیچ شتێك وەك هاوسەرگرتن، فباشتر و چارەساز بێت.))[1] .

بەڵام جگە لەمە، ئەوا ئەو خۆشەویستی‌یە تەنها خەیاڵە و شەکەتی و ماندوکردنی جەستە و سۆز (عاطفة) و ئازاردانی دەرون و بەفیڕۆدانی کاتە.

[1] أخرجه ابن ماجة برقم (١٨٤٧).

## نۆیەم: جنس

گرنگترین شت کە ماوەی هەرزەکاریی پێ جیاکار دەبێ ئەوەیە، کە ئەم ماوەیە قۆناخی تەقینەوەی وزەی جنسیە لەلای هەرزەکاردا، مامەڵەکردنی هەرزەکاریش لەگەڵ ئەم وزە (طاقة) نوێیەدا بە گرنگترین گرفتەکانی هەرزەکار دادەنرێ.

یەکەم ڕەفتاری جنسی کە لە هەرزەکار تێبینی دەکرێ ئەوەیە، کە پێویستی بە زۆر ئاشنابون بە مەسەلە جنسیەکان هەیە و پێداگیری زۆری لەسەر دەکات، ئەمەش لەمیانەی چەند شتێکەوە بە دەردەکەوێ کە گرنگترینیان:

-تەماشاکردنی گۆڤار و کتێبە جنسیەکان.

-تەماشاکردنی وێنەی ڕوت.

-دەستپەڕ (العادة السرية).

-گوێگرتنی هەرزەکار لە قسە و باس و چیرۆکی جنسی.

بەبوێرانەوە دەڵێین: ئەم جۆرە ڕەفتار و کردەوانە زۆر شتێکی سروشتین، چونکە ئەم کار و هەستانە لەلای هەرزەکار شتێکی نوێیە و دەیەوێ بەشێوەیەکی گەورەتر و کردەیی پێی ئاشنا بێت، تاوەکو ئارەزو و پاڵنەرەکانی ڕازی بکات، جا وردە وردە ئەم کارانە لای هەرزەکار دەبێتە کارێکی ناسەرەکی (ثانوي).

پێویستە لەسێ خاڵی بنەڕەتیەوە هەرزەکار ئاڕاستە و ڕێنمایی جنسی بکرێ:

١-هەرزەکار پێویستە بزانێ کە مەسەلە و پەیوەستیەکانی جنسی، کارێکی سروشتیە و هەمو خەڵك هەیەتی، کەواتە پێویست بە شەرم کردنی ناکات.

٢-بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ناراستەوخۆ هەرزەکار ڕێنمایی بکرێ، کە مەبەستی هەرەبەرزی پاڵنەری جنسی بریتی‌یە لە منداڵ بون و بەردەوامی جۆرەکانی خەڵك و ئاوەدانکردنەوەی بونەوەر، هەروەها ڕێنمایی بکرێ کە منداڵ

کەوتنەوە شتێکی سروشتیە و بەشێوەی جیاجیا لەجیهانی ئاژەڵ و ڕوەکدا هەیە[1].

٣-گرنگترین شت کە مرۆڤی پێ لە ئاژەڵ جیا دەکاتەوە ئەوەیە، کە پاڵنەری جنسی لای مرۆڤ، پێویستە مل کەچی ئیرادە و عەقڵ و شەرع بێت و، پەیوەندی جنسیش پەیوەندیەکی مەترسی دار و پیرۆزە[2].

### دەیەم: کەللە ڕەقی (العناد)

گشت هەرزەکارێك بەدیاردەی کەللە ڕەقی و بەڕای خۆکردن جیا دەبێتەوە، ئەوەش دیاردەیەکی سروشتیە و بۆ چەند هۆیەك دەگەڕێتەوە، گرنگترینیان:

١-ئەو خۆ پەسندیەی کە هەرزەکار تێیدا دەژی، هەروەها زۆر گرنگیدانی بەهەمو ئەوانەی لێیەوە دەردەچێ و بڕوابونی بەوەی، کە هەمو ڕا و بۆچون و ڕەفتاری ڕاست و دروستە و، پێویستی بەڕیزگرتنی دەکات.

بەهەر حاڵ پێویستە دایك و باوك لەگەڵ هەرزەکار تێك نەگیرێن و ڕاو بۆچونی بەکەم نەگیرێت، پێویستە فێری شێوازی گفتوگۆکردن و موناقەشەی هێمنانە بکەن، ئەمەش لەڕێی ریزگرتنی ڕاوبۆچونی و موناقەشەی بابەتیانە بەبێ بریندارکردن و بەسوك سەیرنەکردنیەوە دێتە دی.

---

[1] ماذا تعرف عن المراهقة ص١١٤.

[2] ماذا تعرف عن المراهقة ص١١٦، بۆ زیندە زانیاری بگەڕێوە باسی پەروەردەی جنسی ئەم کتێبە.

## هەرزەكار و دەزگا پەروەردەییەكان

لەماوەی هەرزەكاریدا هەرزەكار لەگەڵ چەندەها دەزگای پەروەردەیی هەڵس و كەوت دەكات، هەر یەكێك لەو دەزگایانەش لەڕێنمایی و ئاڕاستەی هەرزەكاردا ڕۆڵی خۆی هەیە، هەر دەزگایەكیش لەكاتی مامەڵەكردنی لەگەڵ هەرزەكاردا كۆمەڵێك ئەرك داوا دەكات، لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر سەرپەرشتیارانی ئەم دەزگایانە، گرنگترین سیفەت و تایبەتمەندییەكانی هەرزەكاریی بزانن.

### یەكەم: هەرزەكار و خێزان:

دیارە خێزان یەكەم دەزگای پەروەردەییە، كە هەرزەكار مامەڵەی لەگەڵدا دەكات، زۆر جاریش هەرزەكار لەگەڵ خێزانەكەی تێك دەگیرێ و بەدەست دەسەڵاتی دایك و باوكی و هەوڵدانیان بۆ زاڵ بون بەسەر هەڵس و كەوت و ڕەفتاری دەناڵێنێ، ڕەنگە لەناو خێزانەكەیدا خۆی بەنامۆ بزانێ. بەكورتیش گرنگترین گرفتەكانی هەرزەكار لەگەڵ خێزانەكەی باس دەكەین كە بریتین لە:

**١-نەبونی شوێنێكی تایبەت بە هەرزەكار لەماڵ دا[1]:**

هەرزەكار حەز دەكات هەردەم كەسایەتی خۆی بەدەربخات و خۆی بسەلمێنێ و خۆی لە خێزانەكەی بەسەربەخۆ بزانێ، یەكێ لەو دیاردەی ئەم سەربەخۆبونە ئەوەیە، كە هەرزەكار حەز دەكات شوێنێكی تایبەتی لەماڵ بۆ تەرخان بكرێت، گەر خانوەكە گەورە بو هەوڵ دەدات قەناعەت بەخێزانەكەی بێنێ ژورێكی بۆ تەرخان بكەن، با لەسەر بانیش بێت، ئینجا سوردەبێ بۆ ڕێك وپێك كردنی و

[1] سیكولوجیة الطفولة و المراهقة ص٢٤٦، لەم باسەدا سودم لە سەردێری بەندەكان وەرگرتوە، بەڵام شەرح و فراوانكردنی باسەكە، ئەوەیان لە ئەزمونی خۆمە.

دەرکردنی کەل و پەلی کەسانی تر، کاتێکیش کە لە ماڵ نابێ دایدەخات، ئەگەر بەهۆی تەسکی شوێنەکەوە نەکرا ژورێکی بۆ تەرخان بکرێت، هەوڵ دەدات ئەگەر دۆلابێکی بچوك، یان چەکمەجەیەك بێت یان شتێکی تر بۆخۆی تەرخان بکات.

ئەمەش لەلای هەرزەکار بەگرفت دادەنرێت. کەواتە پێویستە دایك و باوك گەر بکرێ هەوڵ بدەن ئەم حەزەی هەرزەکاران جێبەجێ بکەن، ئەگەر چی بەکەمترین پلەش بێت هەروا ڕیزی ئەم تایبەتمەندیەی بگرن.

**٢-هەبونی بەربەست لەنێوان هەرزەکار و دایك وباوکی:**

زۆرینەی هەرزەکاران سکاڵای هەبونی بەربەست دەکەن لەنێوان خۆیان و دایك و باوکیان، کەوا پەیوەندیەکی ڕاست و ئاشکرا و ڕاشکاوانە نیە لەنێوانیاندا، ئەمەش دەبێتە هۆی دورکەوتنەوە لەنێوان دایك و باوك و منداڵەکان، ڕەنگە ببێتە مایەی ڕودانی ڕوبەڕوبونەوە و لێك دابڕان.

لەڕاستیدا زۆربەی باوکان و دایکان بەربەست دادەنێن لەنێوان خۆیان و منداڵەکانیان، وا دەزانن ئەم بەربەستە هەیبەت و ڕیزیان بۆ دروست دەکات، ئەمەش زیان بەزۆرینەی پەیوەندی منداڵان لەگەڵ باوکانیان دەگەیەنێ و ئاکامی پەروەردەیی هەڵەی لێ دەکەوێتەوە، لەبەر ئەوە پێویستە دایك و باوك دەروازەی گفتوگۆ لەنێوان خۆیان و منداڵەکانیان بکەنەوە و بەشداریان بکەن لە موناقەشەکانیان و یاریەکانیان، بۆ ئەوەی خۆشەویستی و متمانەیان بەدەست بێنن.

**٣-شەڕکردن لەگەڵ خوشك و براکانی:**

شەڕ و ناکۆکی نێوان خوشك و برا هەرزەکارەکان، یان لەنێوان هەرزەکار و برا و خوشکە گچکەکانی یان لەگەڵ گەوران، دیاردەیەکە لەبنەڕەتەوە بۆ دو هۆی گرنگ دەگەڕێتەوە:

-هەرزەکار بەهەمو شێواز و ڕێگەیەك دەیەوێ خۆی بەدیاربخات، لەو شێوازانەش شەڕکردنە.

-زۆر هەستیاری هەرزەکار لەهەر ڕەفتارێك، یان لە وشەیەك کە لە دەمی یەکێ لە خوشك و براکانی دەردەچێ، ئەوا بەدەست درێژی کردنە سەر ئازادی و کەسایەتی خۆی دەزانێ.

لە بەرامبەر ئەم ڕەفتارەدا، پێویستە دایك و باوك تێکەڵ بە شەڕ و ناکۆکی منداڵانەوە نەبن، مەگەر کاتێ کە دەگاتە قۆناغی مەترسیدار، هەروا منداڵان فێر بکرێن کە ریزی گەوران بگرن و گەورانیش سۆز و بەزەیی‌یان هەبێ بۆ منداڵان، هەروا لە بەرامبەر ڕەفتارێکی ناشیرین و خراپ دا لێبوردە بن.

## ٤-بونی جیاوازی کردن لە خێزاندا:

لەو گرفتانەی کە لە هەندێ خێزاندا هەیە، جیاوازی کردنی دایك یان باوکە بۆ یەکێك لە منداڵەکان، ئەمەش دەبێتە هۆی زۆر گرفتی خێزان.

هەندێ جار دایك و باوك هیچ جیاوازیەك لەنێوان منداڵەکاندا ناکەن، بەلام هەستیاریی هەرزەکار وا بەخەیاڵی‌دا دێنێ، کە لە خێزانەکەیدا جیاوازی کردن هەیە و ئەو لەناو خێزانەکەیدا خۆشەویست نیە و ناویستریێ.

لەبەر ئەوە پێویستە دایك و باوك هەڵس و کەوتیان بەرامبەر هەرزەکار چڕ بکەن و کەمێك گرنگی پێ بدەن، بەڵام بێ ئەوەی خوشك و براکانی پێی بزانن، تاوەکو هەستیان نەجوڵێ و نەوروژێ.

## ٥-دەست هاویشتنە ناوەوەی هەمو کاروبارەکانی هەرزەکار:

هەرزەکاران بەگشتی سکالای زۆر دەست هاویشتنە ناوەوەی دایك و باوك دەکەن لە کاروباریاندا، هۆیەکەشی ئەوەیە کە هەرزەکار خۆی وا دەبینێ، قۆناغی منداڵی کۆتایی هاتوە و بۆتە پیاو و کەس بۆی نیە دەست بهاوێتە کاروباریەوە، کەچی دایك و باوك بەتەواوی پێچەوانەی ئەو دەڕواننە هەرزەکار،

ئەوان هەر بەچاوی منداڵیەوە دەڕواننە ئەو و پێویستە دەست بهاوێنە هەمو کارێکی گچکە و گەورەی، دیارە ئەمەش زۆر زیان بە هەرزەکار دەگەیەنێ.

لەسەر دایك و باوکانە زۆر بەکەمی دەست بهاونە کاری هەرزەکار، هەروا ڕێنمایی ناڕاستەوخۆی بکەن، چونکە هەرزەکار زۆر بەپرسیاری دایك و باوکی هەراسان دەبێ وەك:

-بۆچی درەنگ هاتیەوە؟

-لەکوێ بوی؟

-لەگەڵ کێ بوی؟

-بۆچی بەتەلەفۆن هەواڵت پێ نەداین؟

-بۆچی بەتەنهایی دادەنیشی؟

-بۆچی ئەم پانتۆڵە لەبەر دەکەی؟

-باشتر وایە ئەم بۆنە لە خۆت نەدەی.

-بۆ ماڵی خزمان بۆچی لەگەڵ ئێمە نایەیت؟

نمونەی ئەم جۆرە پرسیار و خۆهەڵقورتاندنە زۆرن، لەبەر ئەوە پێویستە دایك و باوك بزانن، کە هەرزەکار بەم جۆرە خۆ هەڵقورتاندنانەی خێزان هەراسان دەبێ، چونکە ئەم هەرزەکارە منداڵەکەی جاران نیە بە ئارەزو و هەڵبژاردنی ئەوان بە جل و بەرگەکەی ڕازی بێ و بەو شوێنە ڕازی بێت، کە ئەوان دیاری دەکەن و ئەو هاوڕێیانەی کە دەکرێ هاوڕێیاتیان بکات.

هەرزەکار وا هەست ناکات خێزان ئەم هەمو مافانەی بەسەرەوە هەیە، خێزانیش مافی ڕەخنەگرتنی ڕەها، یان قەدەغەکردنی بێ پاساوی بۆ نیە، یان مافی تانە و تەشەرگرتن لە کەسایەتی هەرزەکار نیە، یان بەبەردەوامی هەڕەشەی لێ بکات.

هەرزەکار هەستێکی ڕاستگۆیانەی هەیە، کەوا هەست دەکات پێویستی بە جۆرێك لە سەربەخۆیی هەیە، بەتایبەتیش ئەو شتانەی کە تایبەتن پێی وەك:

جل و بەرگی و قژی و هاورێکانی و خوێندنەوەی پەرتوك یان گۆڤار، یان گفتوگۆیەکی تەلەفۆنی و هاو وێنەی ئەو شتانە[1].

بەکورتی بۆ سوك کردنی مل ملانێ و کێشەی نێوان دایك و باوك و منداڵە هەرزەکارەکانیان، پێویستە لەسەریان هەوڵ بدەن لەڕوانگەی هەرزەکارانەوە بڕواننە کێشە و گرفتەکانیان، نەك لەڕوانگەی گەورە و پێگەیشتوان، ئەمەش یاریدەیان دەدات، کە لەزۆر گرفت دوربکەوێتەوە.

هەروەها پێویستە دایك و باوك لەگەڵ هەرزەکاران زۆر توند و تیژ نەبن و خەفەیان نەکەن، بەڵکە دەبێ چاوپۆشی لە هەندێ شت بکرێ، کە لەوانەوە دەردەچێت، با هەرزەکار لەناو خێزانەکەیدا هەست بە نرخ و بایەخی خۆی بکات[2].

پێویستە دایك وباوك بزانن، هەرزەکار زۆر کاری لە خێزان دەوێت، هەروەها خێزانیش چەند کارێکی لە هەرزەکار دەوێت، گرنگترین ئەو شتانەی هەرزەکار لە خێزانەکەی دەویت بریتین لە[3]:

١-دەبێ دایك و باوك جێ متمانە و ڕێزی هەرزەکار بن.

٢-دەبێ دایك و باوك ڕێز و متمانەی خۆیان بۆ هەرزەکار دەرببڕن.

٣-دەبێ دایك و باوك بەلایەنی کەمەوە مافی هەرزەکار بدەن، تا لە سنوری کارە تایبەتیەکانی هەڵس و کەوت بکات.

٤-بەهیچ جۆرێك دەست نەهاونە کارە بچوکەکانی.

٥-هەڵس و کەوت و قسەی دایك و باوك وەك یەك بن و دژ یەك نەبن، بۆ ئەوەی بتوانن پاساوی هەڵوێستەکانی خۆیان بیننەوە.

٦-ڕێگە بەهەرزەکاران بدەن لەچوار چێوەی خێزانەکەیدا، بەشێوەیەکی کاتی

---

[1] تربية الاولاد و الاباء في الاسلام ص٢٠٣.

[2] سيكولوجية الطفولة و المراهقة ص٢٢٢.

[3] سيكولوجية الطفولة و المراهقة ص٣٣٨.

گۆشەگیر بێت.

## دوەم: هەرزەکار و قوتابخانە:

لەڕاستیدا شۆڕش و یاخیبون و بێزاری هەرزەکار، تەنها ئاڕاستەی خێزانەکەی نیە، بەلکو لەهەمان کاتدا قوتابخانەش دەگرێتەوە، چونکە لەروانگەی هەرزەکارەوە درێژە پێدەری دەسەلاتی دایك و باوکە و هێمای سنوردانانی ئازادیەکەیەتی، جا کارنامە و مامۆستایان و سیستمی قوتابخانە و شتی تر، هەمویان چەند شتێکین، کە کۆت بەندی هەرزەکار دەکات و دەبێتە پاڵنەری ناڕەزایی و بێزاری دەربرین و یاخی بون.

لەبەر ئەوە دەبینین هەرزەکار هەل دەقۆزێتەوە بۆ دەربڕینی بێزاری خۆی و عەیب و خەوشی قوتابخانە بە گچکە و گەورەیەوە باسی دەکات، ڕەنگە ئەو عەیبانە کەمتریش بێ لەو عەیبانەی لەماڵەوە ڕو دەدەن، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێتە مایەی هەڵچونی.

بۆ ئاشنابون بەو شتانەی هەرزەکار لە قوتابخانە حەزی پێ ناکات چەند ڕاپرسییەك ئەنجام درا، هەندێ ئاکامی ئەو ڕاپرسیانەش باس دەکەین:

١-مامۆستا بیروڕای هەڵە بەرامبەر بە قوتابی دروست دەکات، جا لەسەر بنەڕەتی ئەم بیروبۆچونە هەڵەیەش هەڵس و کەوتی لەگەڵدا دەکات.

٢-زۆری ئەرکەکانی قوتابخانە و هەست کردنی قوتابی بە قورسی بەرنامە و پرۆگرامەکان بەچەندی و چۆنیەتیەوە.

٣-سزادانی بەکۆمەڵ، یان سزادان لەبەر شتێك کە قوتابییەکە نەیکردوە.

٤-بەڕێوەبەر و مامۆستایان، کاروباری قوتابخانە دەدەنە دەست دەستەیەکی کەمی قوتابیان.

٥-لێپرسینەوەی قوتابی لەکاتی تاقیکردنەوە لەسەر ئەوەی، کە پیت بە پیت نوسیویەتی و لەسەر تێگەیشتن و تێنەگەیشتنی نەینوسیوە.

ڕەنگە هۆی ڕاستەقینەی یاخی بونی قوتابی، بریتی بێ لەو لەخۆبایی بونەی، کە هەرزەکار دەیکاتە هۆیەك بۆ پشتگیری کردنی خۆی، هەروەها ڕەنگە هۆیەکەی بریتی بێ لە هەست کردن بەدژایەتێکی شاراوەی نێوان خۆی و مامۆستاکەی، کە گوایە ئەو دەسەڵاتێکە و هەڕەشە لە خودی ئەو دەکات و دەیەوێ بەسەریدا زاڵ بێت[1].

لە بەرامبەر ئەوەشدا، هەندێ هەرزەکار لە قوتابخانەدا زۆر شتیان بۆ بەجێ دەهێنرێ.

هەرزەکاران لە قوتابخانەدا چەندەها هاوڕێ بۆ خۆیان دەگرن، کە بەشداریان دەکەن لە خەون و بیروراکانیان، هەروەها زۆرینەی هەرزەکاران سەرسامن بەهەندێ مامۆستاکانیان و دەیانکەنە پێشەنگی خۆیان لە ڕەفتار و هەڵس و کەوتیاندا.

ئەم دیاردەیەش لەلای کچە هەرزەکارەکان ڕونتر بەدی دەکرێ، هەر بۆیەش زۆر حەز دەکەن، زۆربەی کاتەکانیان لە قوتابخانە بەسەر ببەن.

## سێیەم: کۆمەڵگە و هەرزەکار:

هەڵس و کەوتی ڕاست و دروستی کۆمەڵگە لەگەڵ هەرزەکار، شوێنەوارێکی گەورەی دەبێت لە سوك کردنی قەیران و زو پێگەیشتن و تێگەیشتنی هەرزەکار.

توێژینەوەکانی ئێستا بەدەریان خستوە، کە ئەو کۆمەڵگانەی هێمن و هاوسەنگن، هەرزەکاری هێمن و هاوسەنگ وەبەردێنێ، هەروەها گرفتی هەرزەکاری زۆر کەمترە لەو کۆمەڵگانەی، کە دڵە ڕاوکێ و موناقەسە و خێرایی تێدا هەیە[2].

هەرزەکاریش لەگەڵ گرفتەکانی کۆمەڵگەدا زۆر کارلێك دەکات، جا هەر

---

[1] ماذا تعرف عن المراهقة ص٩٤-٩٥ بەدەستکاریەوە.

[2] ماذا تعرف عن المراهقة ص١٨.

چەند لەکاروباری ژیاندا شارەزایی زیاتر بێت؛ هۆشیاری بۆ گرفتەکانی کۆمەڵگـە زیاد دەبێت، وەك خراپی دابەش کردنی سەروەت و سامان و هــەژاریی و گوشـار خستنە سەر هەژاران و بێ دەسەڵاتان.

ڕازی نەبونی هەرزەکار بەم واقیعە، دڵی ئازار دەخوات بە ئــازار و مەینــەتی خەڵك، هــەوڵیش دەدات یارمــەتیان بــدات. ئـەم جـۆرە هەسـت کردنـە هـانی هەرزەکاران دەدات، بەشــداری بکــەن لــەکردەوەی چـاك و دەزگـا کۆمەڵایەتیـە خێرخوازیەکان، یان تەنانەت بەشداری بکەن لەرێکخراوە فیداکاریەکاندا.

ئەوانەی بەچاودێری کردنی ئەم جۆرە کاروبارانــە هەڵدەسـتن پێویسـتە هــەوڵ بدەن ئەم گەرم و گوڕیەی هەرزەکاران بقۆزنەوە و ســودی لێ وەربگـرن و، بـەرەو کاری سودبەخش ئاڕاستەی بکەن.

زۆر چاك لەیادمە کاتێ تەمەنم شازدە ساڵان بو، چۆن لەگەڵ هاوڕێیانی هــاو تەمـەنم کاتم بەسەر دەبرد لەمانگی رەمەزان، هەر لە نوێژی عەسـرەوە تـا کـاتی نوێژی مەغریب بەماڵاندا دەگەڕاین بۆ کۆکردنەوەی خێر و صەدەقە بۆ یەکێك لە کۆمەڵە خێرخوازیەکان.

هەندێ جار هەرزەکار لە کۆمەڵگەکەی خۆیدا هەست بە دورە پەرێزی دەکات و هەست بەوە دەکات کە کۆمەڵگە ئەویان ناوێ.

لە ڕاستیدا ئەندازەی ڕازی بونی هەرزەکار بە کۆمەڵگە و ئاوێتە بونی تێیدا، دەگەڕێتەوە بۆ چەندیەتی بێزاریبونی کۆمەڵگــە بـە هــەرزەکار، دورە پـەرێزی و ڕەفتاری سلبی هەرزەکار لەبەر زۆر هۆ پەیدا دەبــن، کـەوا کۆمەڵگـە بـەخراپی لەگەڵ هەرزەکار هەڵس و کەوت دەکات وەك:

١-کۆمەڵگە گاڵتە و قەشمەری بەهەست و بـیروڕا و ڕەفتارەکـانی هـەرزەکار دەکات.

٢-فەرامۆشکردنی کۆمەڵگە بــۆ هــەرزەکار و بەسـوك سـەیرکردنی توانـا و

وزەكانی و دان پیانەنانی[1].

بەشێوەیەكی گشتی ئەركی هەمو ئەو كەسانەیە، كە مامەڵە لەگەڵ هەرزەكار دەكەن چ لە خێزان بێ، یان لە قوتابخانە بێ یان لە كۆمەڵگە؛ چاودێری و رەچاوی هەرزەكار بكەن و یارمەتی بدەن بۆ ئەوەی ئەم قۆناغە بەسەركەوتویی و سەلامەتی ببڕێ، چاودێریەكەش لەمیانەی ئەمانەی خوارەوە دێتەدی:

١-چاندنی متمانە بەخۆكردن لەلای هەرزەكاردا و هاندانی بۆ وەرگرتنی رەخنەی خەڵكانی تر و تاوتوێكردنی هەڵەكانی لەگەڵیاندا.

٢-هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی توانا و وزەكانی هەرزەكار و ئاراستە كردنی بەرەو باشتر.

٣-لە ئاراستەكردن و رێنمایی كردنی هەرزەكاردا پلەپلەیی و لەسەرخۆیی و ئارامی بەكاربهێنرێ.

٤-لەكات و شوێنی خۆی و لەكاتی پێویست دا، شێوازی توند و نەرم لە مامەڵە كردنی هەرزەكار بەكار بهێنرێ.

٥-هەوڵ بدرێ هەرزەكار لەسەر بنەمای راست و دروست بەكۆمەڵگەوە پەیوەست بكرێت.

٦-رێزگرتنی هەست كردنی هەرزەكار بەپیاوەتی خۆی و سەربەخۆیی خۆی، هەروا مامەڵە كردنی لەمیانەی ئەم روانگەوە.

٧-هەوڵ بدرێ كاتەكانی هەرزەكار بەشتی سود بەخش پڕ بكرێتەوە و تەنگی و بێزاری لەسەر لابردرێ، كە هەرزەكار توشی دەبێ، ئەمەش لەمیانەی زانینی بەهرە و ئارەزوەكانیەوە دێتە دی.

٨-هاندانی بۆ پەرستشە جیاجیاكان، وەك نوێژی بە كۆمەڵ و ئامادەبون لە كۆڕی زانستی و خوێندنی ویردەكان و رۆژو گرتن، چونكە ئەم پەرستشانە شوێنەواری گەورەی هەیە بۆ پاكخویی (تهذیب) خودی خۆی و چاندنی دڵنیایی

[1] سیكولوجیة الطفولة و المراهقة، ص٢٢٢.

و دڵنەوایی.

٩-شیمانەی ئەوە دەکرێ کردەوە و ڕەفتاری هەراسانکەر (مزعج)ی لێوە دەربچێ، ئەوەش بەمەبەستی ئاگالێ بون و سەرنج ڕاکێشانی خەڵکانی تره بۆ لای خۆی.

١٠-بەهەند هەڵنەگرتنی ئەو بیروڕایانەی هەرزەکار دەیخاتە ڕو، بەتایبەتی ئەو بیروڕایانەی دەربارەی ئایین و بەهاکانی ڕەوشت دەردەبڕێ، چونکە بیروڕاکانی تەنها گوزارش کردنە لەو بێ سەروبەری و شڵەژانە دەرونی و فیکریەی کە تێیدا دەژیێ، یان گوزارش لە هەوڵدان بۆ خۆ دەرخستن و دەمەقاڵێ و موناقەشەکردن دەکات.

لە کۆتایی دا دوبارە جەخت لەسەر ئەوە دەکەینەوە، کە هەرزەکاریی ماوەیەکی زەحمەت و مەترسیدارە لەژیانی منداڵاندا، تێگەیشتنی دایك و باوك و پەروەردیارانیش لە تایبەتمەندیەکانی ئەم قۆناغە و ئاشنایی‌یان بەچۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ هەرزەکار، شوێنەواری گەورەی هەیە لە سوك کردنی توندی و مەترسیی ئەم قۆناغە.

جا بۆ ئەوەی پەروەردەکە سەرکەوتو بێ پێویستە هاوکاری و هەماهەنگی[1] لەنێوان خێزان و قوتابخانە و مزگەوت و هەمو لایەنە پەیوەندارەکانی پرۆسەی پەروەردەیی هەبێت.

[1] هەماهەنگی: تنسيق.

# کۆتایی

ئێستاش لەم باسەدا گەیشتینە کۆتـایی، سوپاسـی خـوا دەکـەین، کـە کـار ئاسانی بۆ کردین تا ئەم کتێبە تەواو بکەین، لە خوای گـەورە داواخـوازم گـیرای بکات و تەنها لەبەر خاتری ئەو بێ، مسوڵمانانیش لیێ بەهرەمـەند بـن، هـەر لەو رۆژەی ئێستامان، تا ڕۆژی دوایی.

هیوادارام لە ڕونکردنەوەی گرنگترین بنەما و ئامانج و وەسیلە ئیسلامیەکان سەرکەوتو بوبم، کە خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ دایناوە بـۆ بنیاتنـانی مـرۆڤ و پێگەیشتنێکی ڕاست و دروستانە.

جا مادام مرۆڤ و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، دوربێ لـە بەرنامـە و مەنهـەجی خوا، هەر لە یاسادانان و فێرکردن و پەروەردەدا، ئەوا ئەم کۆمەڵگانـە بەدەسـت مەرگەسات و ناخۆشـی و گرفتـی زۆرەوە دەناڵێنێ، کـە هەڕەشـەی تیـاچون و فەوتانی لیێ دەکات، هیچ چارەسازیەکیشی بۆ نادۆزرێتەوە، دیارە ئەرکی ئێمـەی مسوڵمان زۆر گەورەیە و ئەو ئەمانەتـەی لەسـەر شـانمانە قورسـە، ئـەویش ڕون کردنەوەی حەقیقەتی ئەم ئایینەیە، ئەویش بە ناساندنی رێبیر (مبادیء)ەکانی و ئامانجەکانیـەتی بـەچاکترین شـێوە و باشـترین قەناعـەت پێکـردن، تـاوەکو مرۆڤایەتی لەو تاریکی و گومڕاییی‌یە ڕزگار بکەین، بەرەو ڕیێ ڕاست و ڕوناکی و ڕێگای سەرکەوتن و سەرفرازی.

ئـەم کـارەش بـە توێژینـەوە و تێگەیشـتن لـە ئیسـلام و کـارپیێکردنی و پەیڕەوکردنی دێتە دی، هەتا ببینە پێشەنگێکی چاك بۆ کەسانی تر بە گوتـار و کردار خەڵك فێر بکەین.

دوبارە دەیلێمەوە کە ڕۆڵی پەروەردە لە بنیاتنانی نەتەوە؛ ڕۆڵێکی زۆر مەترسیداری هەیە، پێویستیشە گرنگی ئەم ڕۆڵە بزانین، با بزانین پەروەردەی ڕۆڵەکانمان بدرێتە دەست دوژمنانمان، چەندە مەترسی دارە، چونکە ئەمە لەناوبردنی کەسایەتی و ناسنامەیە و دامالینە لە شارستانی خۆمان و ئاینەکەمان وە ناپاکیشە لەو سپاردە گەورەیەی، کە خوا خستویەتیە بەردەستمان.

سەرەتا دەبێ هەر یەکێك لە ئێمە چاودێری ڕەفتاری خۆیی و پەروەردەی ڕۆڵەکانی و ئەندامانی خێزانەکەی لەسەر ڕەوشت و بەهاکانی ئیسلام دەست پێ بکەین، چونکە خێزان ناوکی کۆمەڵگەیە، کۆمەڵگەش لە کۆمەڵە خێزانێك پێك دێتە، جا گەر خێزانمان چاك کرد ئەوا کۆمەڵگەمان چاك کردوە.

هەروەها پێویستە هاوکاری هەبێت لەنێوان خێزان و قوتابخانە و هۆیەکانی ڕاگەیاندن و دەزگا پەروەردەیی‌یەکانی تری کۆمەڵگە، بۆ دیاریکردنی ئامانج و پلان دانانی پەروەردەیی دیراسە کراو، کارکردن بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو ئەنجامانەی، کە لە هەر ماوەیەکدا بەدەستی دێنن، ئەوەش بەپشت بەستن بەنوێ ترین هۆ و ئەزمونەکان دێتە دی.

لەکۆتاییدا لە خوای گەورە داوامانە ئێمە و مسوڵمانان بۆ ئاینەکەی خۆی بگەڕێنێتەوە و کردەوەکانمان گیرا بکات و لە کەم و کورتیمان خۆش بێت، کۆتا پاڕانەوەشمان سوپاس و ستایشی خوای پەروەردگاری جیهانیانە.

دیمەشق-ركن الدين

٢٤ذو الحجة ١٤١٧ك- ١ ئایار ١٩٩٧ز

# ناوەرۆك

## وەرگێڕ لەچەند دێڕێکدا

- لەساڵی ١٩٦٥ لەدایك بوە.
- ئەندامی کۆمەڵەی خۆشنوسانی عێراق بەغدا- بوە.
- ئەندامی کۆمەڵەی خۆشنوسانی کوردستانە.
- لەساڵانی ١٩٨٠-١٩٨١-١٩٨٢-١٩٨٣-١٩٨٧-١٩٨٨-١٩٩١ لە چەندەها پیشانگای شێوەکاری بە چەند تابلۆیەکی خۆشنوسی بەشداری کردوە.
- لەساڵی ١٩٨٩ پیشانگایەکی تایبەتی هونەری خۆشنوسی کردۆتەوە.
- لەچەند رۆژنامەیەك چاوپێکەوتنی سەبارەت بە هونەری خۆشنوسی لەگەڵدا کراوە.
- بەشداری لە فیستڤاڵی دوەمی هەولێر بۆ خۆشنوسی و نەخشسازی کردوە کە لە ١/١٠/٢٠٠٠ سازدراو بڕوانامەی رێزلێنانی پێدراوە.
- بەشداری پێشبڕکێی دەولی پێنجەمی هونەری خۆشنوسی لە تورکیا کردوە کە لە شوباتی ٢٠٠١ سازدرا.
- لەساڵی ٢٠٠٢ بەشداری پێشبڕکێی خۆشنوساتی هەولێری کرد، پلەی یەکەمی لە خەتی (النسخ) بەدەست هێنا.
- لە پێشبڕکێی دەولی شەشەمی هونەری خۆشنوسی لە تورکیا بەشداری کرد، کە لە شوباتی ٢٠٠٤ سازدرا.

ئەم کتێب و نامیلکانەی لە زمانی عەرەبی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی:

١- ژن و مێردی ئیسلامی بەختەوەر (سێجار چاپ کراوەتەوە).
٢- سوپاکەی پێغەمبەرﷺ.
٣- چەند وانەیەك لە پێغەمبەری سەرکردە لە شاراوەی نهێنیدا.
٤- چۆن بونیەو بناغەی ئیسلامیمان لە ڕوخان دەپارێزین.
٥- ٣٠ نیشانەی مونافیقان (دو جار چاپ کراوەتەوە).
٦- مەرجەکانی حیجابی ئافرەتی مسوڵمان لە قورئان و سوننەتدا (دو جار چاپ کراوەتەوە).
٧- ئایا دەزانی جۆرەکانی شیرك چین؟
٨- ئایا دەزانی جۆرەکانی کوفر چین؟
٩- ئایا دەبێ ولاء و براءمان بۆ کێ بێ؟
١٠- منداڵی مسوڵمان چی دەڵێ؟

ئەو نامیلکانەی ئامادەی کردوە:

١- لە فیقه شارەزا بە بە پرسیار و وەڵام (دوجار چاپ کراوەتەوە).
٢- گوڵبژێرێك لە فەتوای هاوچەرخ سەبارەت بە ئافرەتان (دوجار چاپ کراوەتەوە).
٣- ١٠ ئادابی کۆمەڵایەتی لە قورئان و سوننەتدا.
٤- فرەژنی لە نێوان فیقهی ئیسلام و ویستی پیاودا.
٥- خێزانەکەت بە پارە مەزەندە ناکرێت.
٦- کێ لە نێوان واقیعی ئیسلام و داب و نەریتی جاهیلیدا.
٧- وێنەی سەر تابلۆو وێنەی فۆتۆغرافی لە ڕوانگەی ئیسلامدا.
٨- مافەکانی ژن و مێرد لە ئیسلامدا.

بنەمای هەر بەرنامە و پەیرەوێکی پەروەردەیی بریتییە لەو بیروباوەڕەی کە لە میانەیەوە دەست پێدەکات و دەردەچێت، ئامانجیشی پتەوکردن و تۆکمەبونی دەبێ، لەبەر ئەوە نەبونی پەروەردەی ئیسلامی لە بەرنامە و پرۆگرامی پەروەردە و ئاراستە و ڕێنمایی لە کۆمەڵگەدا؛ دەردێکی کوشندەیە و سەرەتای خێرا کۆتا هاتنی ئەم ئوممەتەیە.

لە ڕاستیدا نوسەر و توێژەر و پەروەردیارە ئیسلامیەکان لەم کارە وریابونەوە و لە ڕوانگەی جۆراوجۆر و جیاجیادا، کۆمەڵە توێژینەوە و جێباسی پەروەردەیی ئیسلامیان پێشکەش کرد، جا چ بە تەواومەندی بوبێت، یان بە هەندەکی، کە پەرتوکخانەی ئیسلامی و پەرتوکخانەی پەروەردەیی دەوڵەمەند کرد.

منیش حەزم کرد لەم بوارەدا ئەسپی خۆم تاودەم، لەخوای گەورەم داوایە یارمەتیم بدات و پاداشتم بداتەوە.

هەوڵیشم داوە سود لە نوسینەکانی بیریارە ناموسڵمانەکان وەربگرم، وێرای سود وەرگرتن لە سەرچاوە ئیسلامیەکان، بۆ بەدەرخستنی ئادگارەکانی پەروەردەیی ئیسلامی ڕەسەن بەچڕی، ئەم کتێبەش تەنها بەشداریەکی بچوکە لە بواری پەروەردە و پێگەیاندنی ئیسلامیدا.

محمد شریف الصواف

لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕوشنبیری و هونەر لە هەولێر
ژمارە ٣٦٢ ساڵی ٢٠٠٤ ی دراوەتی